**لەم ژمارەیەدا**

**بەشی کوردی**



**بەشی عەرەبی - القسم العربي**



**بەشی ئینگلیزی**

## ڕێنمایی بڵاوکردنەوە لە گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی

- گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی، گۆڤارێکی زانستی وەرزییە، باس و توێژینەوەی زانستی تایبەت بە مەسەلەکانی کورد و کوردستان بڵاو دەکاتەوە، بەمەرجێك لە هیچ شوێنێکی دیکە بڵاو نەکرابێتەوە یاخود بۆ بڵاوکردنەوە وەرنەگیرابێت.
- زمانی بڵاوکردنەوەی باس و توێژینەوەکان لە گۆڤارەکەدا کوردی و عەرەبییە، ئەو باس و بابەتانەش کەوا سەروکاریان لەگەڵ مەسەلەکانی کورد و کوردستان هەبێت، ئەگەر بە زمانی دیکەش بن، بڵاودەکرێنەوە.
- پێویستە توێژەر لە لاپەڕەی یەکەمی توێژینەوەکەیدا، ناونیشانی باسەکەی، ناو و ناسناوی زانستی، شوێنی کارەکەی، ئیمێڵ و ژمارەی تەلەفۆنی خۆی بنووسێت.
- لە هەڵبژاردنی ناونیشان و نووسینەوەی توێژینەوەکاندا، پێویستە ڕەچاوی بنەماکانی میتودی زانستی بکرێت. لەمەسەلەکانی پەیوەست بە ڕێکخستنی سەرچاوە و چۆنیەتی سوودوەرگرتن لێیان، وەکو چۆن پێویستە نووسینی باس و بابەتەکان بە زمانێکی زانستی شیاو بێت، بە پێچەوانەوە هەر توێژینەوەیەك پێڕەوی لەم بنەمایانە نەکات لە لایەن دەستەی نووسەرانەوە وەلادەندرێت.
- پێویستە توێژەر پوختەی توێژینەوەکەی بە دوو زمانی دیکە، جگە لە زمانی نووسینی دەقەکەی لە کۆتایی توێژینەوەکەیدا بنووسێت، بەمەرجێك لە یەك لاپەڕەی A4 زیاتر نەبێت و تیایدا گرینگی باسەکە و ئەنجامە سەرەکییەکانی توێژینەوەکەی بخاتە ڕوو.
- هەر باس و بابەتێك لەبارەی ساغکردنەوەی (پەیدۆزی، تحقیق) ی دەستنووسەکانەوە بێت. پێویستە پەیدۆزییەکە بە گوێرەی بنەما زانستییە کارپێکراوەکانی ئەو بوارە ئەنجام بدرێت. هەروەها چەند لاپەڕەیەکی کۆپیکراو و، زانیاری تەواو سەبارەت بە دەستنووسەکە و شوێنی هەڵگرتنی بخرێتە ڕوو.
- دەبێ باس و بابەتەکان بەجۆری فۆنتی یونیکورد بنووسرێن. لەمەسەلەی بەکارهێنان و ڕێکخستنی سەرچاوەکان پێڕەوی لە شێوازی هارفارد بکرێت. ناونیشانی باس و توێژینەوەکان بە فۆنتی قەبارە (١٥) بێت، ناوی توێژەر و توێژەران لەگەڵ ناونیشانە لاوەکییەکان بە فۆنتی (١٤) و دەقی باسەکەش بە فۆنتی (١٣) بێت.

- لەکاتی سوود وەرگرتن لەو باس و بابەتانەی کە لە گۆڤارەکاندا بلاّوکراونەتەوە، بەم شێوەیە ئاماژە بە سەرچاوەکەی دەکرێت: ناسناو و ناوی نووسەر، ڕێکەوتنی دەرچوون، ناونیشانی باسەکە، ناوی گۆڤارەکە (لەنێوان دوو کەوانەدا)، ژمارەکەی، شوێنی دەرچوون.
- هەموو باس و بابەتێك بە (٣) دانەی سەرکاغەز و دانەیەکی سەر (CD) پێشکەش دەکرێت، بەمەرجێك ژمارەی لاپەڕەکانی، بە هەموو وێنە و خشتە و سەرچاوەکانەوە لە (٢٥) لاپەڕە تێپەڕنەکات.
- دوا بەدوای پەسەندکردنی هەر توێژینەوەیەك لەلایەن هەڵسەنگێنەرانی پسپۆڕەوە، توێژەر دانەیەك لە نووسراوی پەسەندکردنی توێژینەوەکەی لە لایەن دەستەی نووسەرانەوە پێدەدرێت. لەدوای ئەوە توێژەر بۆی نییە باسەکەی پێشکەش بە هیچ لایەنێکی دیکە بکات، بە بێ نووسراوێکی ڕەزامەندی لە لایەن سەرنووسەری گۆڤارەکەوە.
- دەستەی نووسەران ئەو مافەی دەبێت کەوا هەندێك برگەو دەستەواژەی توێژینەوەیەك لابدات، یا بگۆڕێت و دووبارە دایبڕێژێتەوە تاوەکو لەگەڵ ڕێنماییەکانی بلاّوکردنەوە لە گۆڤارەکە دا بگونجێت.
- چۆنیەتی ڕیزکردنی باس و بابەتەکان پەیوەندی بە ڕێبازی بابەتبەندی گۆڤارەکەوە هەیە نەوەکو بابەت و بایەخی توێژینەوەکان، یاخود پلەو پایەی زانستی توێژەرەوە.
- گۆڤاری ئەکادیمیا ئەو باس و توێژینەوانەی کەوا لە نامەکانی ماستەر و دکتۆرا وەردەگیرێن، واتە (مستل) ن، بلاّوناکاتەوە.
- هەرباس و بابەتێك کە ڕەزامەندی لەسەر بلاّوکردنەوەی نادرێت، بۆ خاوەنەکەی ناگەڕێندرێتەوە.

# ڕاڤەکردنی پەیوەندیی خزمایەتی لە کۆمەڵی کوردیدا

## شیکاری واتایی پەندەکان بە نموونە


**پ. ی. د. بێستوون حەسەن ئەحمەد**
بەشی زمانی کوردی
کۆلێژی پەروەردەی بنەڕەت
زانکۆی سلێمانی

**د. توانا سەعدی حامد**
کۆلێژی زمان
بەشی زمانی ئینگلیزی
زانکۆی سلێمانی


### پێشەکی

**0/1) گرنگیی بابەتەکە:**

دەربڕینە چەسپاوەکان (پێکەوەهاتوو، میتافۆر، ئیدیەم، پەند) ەکان، بەشێوەیەکی گشتی سامانێکی نەتەوەیین و لە ڕێگەیانەوە بیرو بۆچوون و ئاوەزمەندی و تێڕوانینی کۆمەڵ بۆ دیاردە جیاوازەکان دەزانرێت. بەتایبەتیتر پەندەکان بەو پێیەی کۆنترن و بۆچوونی زۆرینەی کۆمەڵیان لەسەرە، روون و ئاشکراتر دیوە شاراوەکانمان بۆ دەخەنە ڕوو. تێگەیشتن لە پەیوەندیی کۆمەڵایەتی لە ناو تۆڕی خێزان و بنەماڵەدا و زانینی ئەو ریەڵەیە، لە ڕێگەی پەندەوە، کاری سەرەکی ئەم لێکۆڵینەوەیەیە.

**0/2) کەرەستە و سنووری لێکۆڵینەوەکە:**

نموونەی ئەو پەندانەی کە لە لێکۆڵینەوەکەدا بەکارهاتوون، یان لەو سەرچاوانەوە دەرهێنراون کە بۆ کۆکردنەوەی پەندەکان تەرخانکراون، یان لە زمانی قسەپێکەرانی زمانی کوردی کرمانجی ناوەڕاستەوە وەرگیراون. ئەوەی کە زۆر گرنگە هەموو نموونە بەکارهاتووەکان لە ئەمڕۆی زمانی کوردیدا بەکاردەهێنرێن و دەربڕاوی زیندوون. لە هەندێک باریشدا بۆ تێگەیشتنی زیاتر پەندی شێوەزاری هەورامی بە وەرگێڕانی کرمانجی ناوەڕاستەوە خراوەتە بەردەست.

**0/3) گرفت و سەرچاوەکانی لێکۆڵینەوەکە:**

سنووری لێکۆڵینەوەکە پەندەکانی زاری کرمانجی ناوەڕاستن، بە هەردوو شـــێوەزاری ســـلێمانی و ســـۆرانییەوە. هەرچـــی گرفتـــی لێکـۆڵینەوەکەش بـوو، لە کەمـی و وەکیەکـی ئەو سـەرچاوانەدا کە بـۆ کۆکردنەوەی پەندەکان تەرخانکراون خۆی دەبینییەوە.

**0/4) ڕێبازی لێکۆڵینەوەکە:**

لەم لێکـــۆڵینەوەیەدا ڕێبـــازی پەســـنکەرانەی شـــیکەرەوەیی بەکارهێنراوە.

**0/5) بەشەکانی لێکۆڵینەوەکە:**

لێکۆڵینەوەکە لە سێ بەش پێکهاتووە: بەشی یەکەم بۆ ئاستەکانی زمان و ئاست و پێکهاتەی سیمانتیک و نیشانە واتاییەکان و جۆرەکانی واتا و کێڵگەی واتایی وەک بەشێک لە زانستی سیمانتیک تەرخانکراوە، ئەم بەشـــە بەشـــێکی تیـــۆرییە و لە چێـــوەی زانســـتی زمانـــدا خـــۆی دەبینێتەوە. ئەو زانستە تیۆرییانەی لە بەشی سێیەمدا بۆ لێکۆڵینەوەکە پێویستن لەم بەشەدا باسکراون.

بەشی دووەمی لێکۆڵینەوەکە بۆ خێزان لە کۆمەڵی کوردیدا و ئەو پەیوەنـــدییانەی کە خێـــزان و بنەمـــاڵە وەک دوو یەکە بەیەکەوە دەبەســـتێتەوە، تەرخـــانکراوە. ئەم بەشـــە زۆرتـــر لە ســـنووری زانســـتی کۆمەڵایەتیدایە و لێکۆڵەر بەناچاری و پشتبەستن بەسەرچاوە و ڕاوێژ لەگەڵ کەســانی کۆمەڵنــاس، ئەم بەشــەی بــۆ خســتنە ڕووی ئەو تــۆڕە فراوانەی خێزان و بنەماڵە داناوە.

بەشـــی ســـێیەم بەتێگەیشـــتن لە پەنـــدەکان و شـــیکردنەوەیان، لە ڕێگەی نیشانە واتاییەکان و جۆرەکانی واتای ناو زانستی سیمانتیک جۆری پەیوەندییەکان نیشاندراون. پەیوەندییەکان هەیانە پڕ لە شانکێ و ئالەنگاری و کێشمەکێشــە، هەشــیانە پەیوەنــدییەکی نەرمــی هێمنــی بــێ گرێوگۆڵەیە.

لە کۆتایی لێکۆڵینەوەکەشدا ئەنجام و لیستی سەرچاوەکان و پوختەی لێکۆڵینەوەکە بە هەردوو زمانی عەرەبی و ئینگلیزی نیشاندراون.

**١/١) ئاستەکانی زمان:**

زانایان زانستەکانیان بەسەر سێ جۆردا دابەشکردووە، (زانستە پەتی و سروشتییەکان، زانستە کارەکییەکان، زانستە مرۆییەکان). بیرکاری و کیمیا نموونەی زانستی پەتی و سروشتین، زانستی پزیشکی و تەندروستی نموونەی زانستی کارەکین، زانستی دەروونناسی و کۆمەڵناسی و زمان نموونەی زانستی مرۆیین. زمان و زمانەوانی وەک دوو چەمکی زانستی مرۆیی، پێناسەکردن و ناساندنیان ئاسان نییە و بە یەک پێناسە بە تەواوی هەموو لایەن و ڕەهەندە جیاوازەکانی نا ناسێنرێن، بۆ ئەم مەبەستە چەندین پێناسە لەلایەن زمانەوانانەوە خراونەتە ڕوو، بڕوانە (محمد معروف فتاح، (٢٠١١: ٧ )). پۆلکردن یان بەش بەشکردن یان جیاکردنەوە یەکێکە لە مەرجەکانی زانستیبوونی بابەتەکان. زانستی زمانیش هەتا ئاستەکانی جیانەکرانەوە هەر ئاستەی تەرخان نەکرا بۆ لێکۆڵینەوەی یەکەی بنەڕەتی ئەو ئاستە و پرۆسە و گۆڕانەکانی ئاستی دیاریکراو، بە زانستی نەبوو. ئەمەش لە دوای نووسینی کتێبە بەناوبانگەکەی دیسۆسێرەوە بوو بە ناونیشانی (زانستی زمانی گشتیی) لە دەوروبەری ساڵانی ( ١٩١٥-١٩١٦). قۆناغی پێشتری پێش ئەم پۆلکردنە بە قۆناغی بە زانستیبوونی زمان دانانرێت، بە ڕێزمانی (دێرین/ سونەتی/ تەقلیدی...هتد) ناو دەبرێت.

زمانەوانی یان زانستی زمان"بەرانبەر بەو زانستە بەکارهاتووە کە لە هەموو ئاستەکانی زمان، دەنگسازی و وشەسازی و ڕستەسازی و واتاسازیی دەروونی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی و کارەکی دەکۆڵێتەوە" (یوسف  شەریف سەعید، (٢٠١١: ٦)).  زانستی زمان زۆرترین قسەی لەسەر

ئاستەکانی زمانە (فۆنۆلۆژی و مۆرفۆلۆژی و ....هتد)، جگە لەوەش دانەی هەریەکەیەکیش لەو ئاستانە دیاریدەکات، بۆ نموونە (فۆنێم) یەکەی ئاستی فۆنۆلۆژییە و بەو جۆرە (مۆرفێم) یش یەکەی ئاستی مۆرفۆلۆژی و سینتاکسە. ئاستەکانی زمانیش وەک بەرهەمی شیکردنەوەی زمان بۆچوونی جیاوازیان لە بارەوە دەربڕاوە، " هەموو زمانەوانەکان لەسەر ئاستەکانی زمان و ژمارەیان ڕێک ناکەون" (محمد معروف فتاح، (٢٠١١: ٥٥))، تەنانەت ڕای جیاواز دەربارەی سەرەکی و ناسەرەکی یان گرنگی ناگرنگی ئاستەکان هەیە. تەنانەت لە مێژووی زمانەوانیدا هەندێک جار (کێشەی فۆنەتیک و واتا بۆ زانستە نزیکەکان جێهێڵراوە) (محمد معروف فتاح، (٢٠١١: ٥٥)) بەکاری زانستی زمان نەزانراوە.

لەبەر خۆبەدەستەوە نەدان و سرکی واتا هەندێک لە قوتابخانە زمانەوانییەکان لێکۆڵینەوەی واتاییان بۆ زانستەکانی دیکەی وەکو زانستی کۆمەڵناسی و کۆمەڵایەتی و دەروونی بەجێهێشتووە، "بلۆمفیڵد تارادەیەکی زۆر لەگەڵ ئەوەدا نەبووە کە لێکۆڵینەوە لە واتا لە چوارچێوەی زمانناسیدا بکرێت" (دارا حمید محمد (٢٠١٣: ٧٦)). دوای قوتابخانەی زمانەوانی بونیادگەری ئەمریکی لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەدا، چۆمسکی وەک قوتابخانەی زمانەوانی بەرهەمهێنان و گواستنەوە، بە ناچاری و لە قۆناغێکی دواتری لێکۆڵینەوەکانیدا بەهۆی ئاستی قووڵەوە (ڕۆنانی ژێرەوە)و هەستکردن بەپێویستی واتا، واتای هێنایەوە ناو لێکۆڵینەوە زمانەوانییەکان.

ئەم لێکۆڵینەوەیە بەدوای ڕایەڵە و پەیوەندیی خزمایەتی لە بنەماڵە و هۆزو تیرە و عەشیرەتی کوردا دەگەڕێت. دەیەوێت لەڕێگەی واتای پەندەکانەوە، لە پەیوەندیی خزمایەتی و خوێنی و دۆستایەتی ئەو گرێدراوە کۆمەڵایەتییانە تێبگات. بۆیە پێویستە زۆرترین شیکاری بۆ پەند وەک دەربڕاوێکی چەسپاو  ئاستی واتاسازی (سیمانتیک) وەک یەکێک لە ئاستەکانی زمان بکات.

### ١/١/١) پێکهاتەی سیمانتیک و پراگماتیک:

سیمانتیک (Semantics) سیمانتیک: وەک پێکهاتەیەکی زانستی زمان، زانستێکە لە واتا دەکۆڵێتەوە (احمد مختار عمر ، ١٩٨٢: ١١)، لە واتای وشە و فرێزو هەموو دروستەکانی دیکەی زمان، واتە "لە دروستبووە واتایەکانی زمان (دەق/ پەخشان) دەکۆڵێتەوە"( محەمەدی مەحویی، (٢٠٠٩- ب- : ٩٥)). " یان " سیمانتیک ئەو بەشەی زانستی زمانە ، کە پەیوەندی بە لێکۆڵینەوە واتاییەکانەوە هەیە". ( Crystal. D, 2003:48 عەبدوالواحید موشیر دزەیی (٢٠١٠: ١٧)).)

ئەوەی بۆ ئەم لێکۆڵینەوەیە گرنگ بێت، کێڵگەی واتایی، نیشانە واتاییەکان، جۆرەکانی واتایە ، ئەم لێکۆڵینەوەیە بە پێویستی دەزانێت، هەریەک لە: واتای فەرهەنگی، واتای ڕێزمانی/ گراماتیکی، واتای میتافۆری، واتای ئیدیەمی و واتا و مەبەستی پراگماتیکی ڕوونبکاتەوە و جۆری هەریەک لەو واتایانە و سنووری کارکردنیان دیاریبکات.

نیشانە واتاییەکانیش وەک پێوەرێک بۆ نزیکی و دووری واتای وشە لە ناو دەربڕاوەکاندا جێگەی بایەخ و گرنگییە. ڕۆڵی نیشانە واتاییەکان لە دەستنیشانکردنی واتای فەرهەنگی و میتافۆری وشەکاندا، یان هەندێک جار گۆڕینی ئەم واتایە بە هۆی گۆڕینی نیشانەکانەوە ڕوودەدات.

#### ١/١/١/١) کێڵگەی واتایی semantic field :

دێرینەکان (ئەوانەی بەر لە بە زانستیبوونی زمان لە زمانیان دەکۆڵییەوە)، لە هەوڵی لێکدانەوەی پەیوەندیی نێوان فۆرم و واتادا بوون، سۆسێر پەیوەندیی نێوان فۆرم و واتا بە هێما دادەنێت. "زمان بریتییە لە کۆمەڵێک هێما کە بەپێی سیستەم ڕێکخراون" (محمد حسن، ١٩٨٣:٣٠٣). زمان پێرەوێکی چڕو ئاڵۆزە، کە لە پێڕەوی دەنگەکان و پێڕەوی هێماکان ...هتد پێکهاتووە. ئەمانەش ئاوێتە و تێکەڵی یەکدی بوون. بۆ ئاشنابوون بە هەریەکەیان دەبێت هەوڵی شیکردنەوە و لێتێگەیشتنیان بدرێت.

قوتابخانەی زمانەوانی بونیادگەری و بەتایبەتی سۆسێر پێیوایە "بەهای وشەیەک لە ڕێگەی پەیوەندیی وشەکە بە کۆمەڵە وشەیەکی تری زمانەوە دەردەکەوێت" (کورش سەفەوی، و. دلێر سادق کانەبی، ٢٠٠٦: ١٠). ئەو کۆمەڵە وشەیەشی بە (کێڵگەی واتایی) ناودەبات. بە واتایەکی دی وشەکانی زمان هەڕەمەکی و پەرت و بڵاونین، بەڵکو بەشێوەی جیاجیا پەیوەندییان بەیەکەوە هەیە، لە ژێر چەند چەترێکدا کۆدەبنەوە، بەها و واتای هەر وشەیەک ، لەناو ئەو کۆمەڵە وشەیە و پەیوەست بە وشەکانی ناو کۆمەڵەکەوە دیاریدەکرێت. ئەم وشانە زۆرجار لەژێر ناونیشانی جیاوازدا کە وەک چەترێک هەموویان دەگرێتەخۆ ریز دەکرێن وەک (وەرزەکان، ڕەنگەکان، خواردنەکان...هتد).

چەند جۆرێک ریزکردنی کەرەستەکان لە ناو کێڵگەی واتاییدا بەدی دەکرێن لەوانە:

١- ریزکردن بەشێوەی زنجیرەیی وەکو کێڵگەی واتایی  نەوە و باوان  (کور، باوک، باپیر، باپیرەگەورە...هتد) کە پانتایی ئەم لێکۆڵینەوەیەیە.

٢- لە بەرزەوە بۆ نزم یان بەپێچەوانەوە وەکو کێڵگەی واتایی نازناوی زانستی لە زانکۆ و پەیمانگاکاندا (مامۆستای یاریدەدەر، مامۆستا، پرۆفیسۆری یاریدەدەر، پرۆفیسۆر).

٣- بازنەیی، وەکو کێڵگەی واتایی  وەرزەکان (بەهار، هاوین، پایز، زستان).

٤- هەڕەمەکی ، وەکو کێڵگەی واتایی  پێویستییەکانی قوتابخانە (قەڵەم، قەڵەمدان، لاستیک (خەتکوژێنەوە)، ڕاستە...هتد).

ئەوەی تێبینی دەکرێت پێویستە لە (١،٢) دا، پێڕەوەکە بپارێزرێت، لە (٣) هیچ لە وەرزەکان یەکەم نییە و هیچیان کۆتا وەرز نین، لە (٤) دا، ریزکردنەکە بەپێی پێویستییە (بۆ زانیاری زیاتر لە سەر کێڵگەی واتایی، بڕوانە: (هۆگر مەحموود فەرەج، ١٩٩٢)، (کورش سەفەوی، و. دلێر سادق کانەبی،( ٢٠٠٦: ١٠- ١٢))، (دارا حەمید محەمەد، (٢٠١٠: ١٥٥-١٥٧)) ، (فەرهاد تۆفیق حەسەن (٢٠١٠: ٢٧).

**٢/١/١/١) نیشانە واتاییەکان و کێڵگەی واتایی خزم و کەسوکار:**

سـیمانتیک خـۆی بە پێکهـاتە – نـاوەرۆکەوە خەریـک دەکـات، پەیوەندییە زمانییەکانی ناو دەربڕینەکان شیدەکاتەوە، بەڵام مۆرفۆلۆژی بە پـێچەوانەوە بە فـۆرمەوە خـۆی خەریـک دەکـات، بـریتییە لە ڕۆنـانی نـاوەوەی وشـە، جـگە لەوە" مۆرفۆلـۆژی ، کە بنجـین و کەرت نـاکرێن شتێکی بۆ وتن نییە"(katamba (2006:96  لە ئاست ئەو وشانەدا

بەڵام واتاسازی وشە بنجییەکانیش بە هۆی نیشانە واتاییەکانەوە شیدەکاتەوە، نیشانە واتاییەکان یەکەمین جار لە چێوەی قوتابخانەی زمانەوانی بونیادگەریدا و بەتایبەتیتر لەلای قوتابخانەی پراگ باسی لێوەکراوە. بەڵام ئەم ڕۆڵ و مانایەی ئێستەی نەگەیاندووە، لە سەرەتادا بۆ شیکردنەوەی هەندێک وشە بە مەبەستی گەیشتن بە واتای بنەڕەتی بەکارهاتووە (بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە (کورش سەفەوی، و. دلێر سادق کانەبی، ( ٢٠٠٦:٢٦)).

لێکـۆڵینەوە زمانەوانییەکـان بەردەوامبـوون، بەتـایبەتی لە ئاسـتی فۆنۆلۆژیـدا فۆنیمەکـان نیشـانەکانیان دەستنیشـانکران (سـازگەی دروسـتبوون، گیـراو و تەقـاوە، دەنگدارو بێدەنگ) (بـۆ زانیـاری زیـاتر بڕوانە: Trubezkoy,N,S:1939)

لە ئاسـتی سینتاکسیشـدا کەتەگـۆرییە سینتاکسـییەکان یـان ئارگۆمێنـت داواکەرەکـان، ئەو ئارگۆمێنتانەیـان لەگەڵ دەنووسـرا کە داوایان دەکرد، لە بابەتەکانی (دروستەی ئارگۆمێنت و ڕۆڵی بابەتانەدا) ئەمە ڕوونکراوەتەوە، بڕوانە: (یوسف شریف سەعید، (١٩٩٠: ٩-٢١)؛ سەباح ڕەشید قادر، (٢٠٠٧: ٧٨- ٨٠).

دوای ئەم هەنگاوە ناوەکانی (Katz and Fodor)  وەک لێکۆڵەری نیشانە واتاییەکان باس دەکرێن.

"یەکەمـین جـار تیۆریەکەیـان لە شـێوەی وتارێکـدا بەناونیشـانی (تیۆری پێکهاتەی سیمانتیکی)  لە ساڵی (١٩٦٣) خستەڕوو" (احمد مختار

عمـر، ١٩٨٢: ١١٤). پـاش کۆمەڵێـک گۆڕانکـاری جۆراوجـۆری تیـۆری (دیاریکردنی نیشانە واتاییەکان) بەرهەم هات و کەوتە بەرچاو.

ئەم نیشانە واتاییانە یەکێکن لە توخمە (یەکە) پێکهێنەکانی وشـە، کە هەندێک جار ئەم یەکە پێکهێنانە بەپێی بەکارهێنانیان لە پێکهاتەی گەورەتر لە خۆیاندا دەگۆڕێن.

لە سەرەتادا نیشانەی واتایی ناوەکان دیاری دەکرا لەم ڕووانەوە:

١- توخم (نێر،مێ، بێلایەن).

٢- ژماردن (تاک، کۆ، دیارینەکراو).

٣- کەس (یەکەم، دووەم، سێیەم)...هتد

هەنگـاوی دواتـری زمانەوانەکـان خەریکـی کـارکردن بـوو لە کردارەکاندا. هەڵوەشاندنەوەی کردارەکان بۆ نیشانە واتاییەکانیان، بە هۆی جیاکردنەوەیان دەبێت بۆ پۆلی (گرووپی) سێمانتیکی جیاواز، (لیڤین (١٩٩٣)) ئەم ڕەگەز. واتاییانەی، بۆ جیاکردنەوەی کردارێک لە کردارێکی دی  بەکارهێناوە.

change (گۆڕان), motion (جووڵە), contact (بەرکەوتن), cause (هۆکار)

ئەم کردارانە بەپێی ئەم پێوەرانە شیدەکرێنەوە (بڕوانە (١)) .

(١)

(بڕین) cut (بۆ زانیاری زیاتربڕوانە (Finch,(2000:150 ))

(change , motion, contact, cause)

(کاتز و ڤۆدەر) ڕوونیانکردەوە، کە وشـەکان بچووکترین یەکەی واتایی نین و لەوان بچووکتر (نیشانە واتاییەکانن)، هەر لەم ڕێگەیەوە بانگەشەی ئەوەیانکرد، کە دەتوانن چەمکی وشە دیاری بکەن و وشە شیبکەنەوە بۆ یەکەی وردتری (ئەتۆم ئاسا).

ئەم تیۆرییە گەورەترین سوودی لێوەرگیرا بۆ دەستنیشـانکردنی پەیوەندییە واتاییەکان و کۆمەڵە وشە و پێکەوەهاتووەکان و ...هتد، کە ئەم لێکۆڵینەوەیە بە پێویستی نازانێت باسیان بکات.

(احمد مختار عمر، (١٩٨٢: ١٢٢)) پێیوایە، بۆ دەستنیشانکردنی واتای وشەکان بەهۆی تیۆری (دیاریکردنی نیشانە واتاییەکان)ەوە پێویستە ئەم هەنگاوانە بگیرێنەبەر:

١- پێویستە کێڵگەی واتایی وشەکە دەستنیشان بکرێت. بۆ نموونە (باوک) لە ناو کێڵگەی واتایی خزم و کەسوکاردایە (باوک، دایک، برا، خوشک، کوڕ، کچ...هتد).

٢- پێویستە ئەو لایەنانە بخرێنەڕوو، کە لێکۆڵەر دەیەوێت نیشانە واتاییەکانی دەستنیشان بکات، وەک (توخم، تەمەن، نەوە...هتد).

٣- دیاریکردنی نیشانەکانی واتە (+ ، -)ەکانی هەریەک لە وشەکان.

٤- باشترە لێکۆڵەر لە خشتەیەکدا وشەکان بە هاوواتا و دژواتا ...هتد بخاتە بەرچاو .

زمانەوانەکان پێیانوایە بۆ دەستنیشانکردنی واتای چەند وشەیەک، پێویستە لە سەر بنەمای وشەی یەکەم، وشەی دووەم و سێیەم دیاری بکەین. واتە کاتێک بۆ وشەی (پیاو) نیشانەی (+ نێر) دادەنرێت، ئەوا پێویستە بۆ وشەی (ژن) و (کچ) نیشانەی (- نێر) دابنرێت، نەک نیشانەی (+ مێ). واتە وشەی یەکەم پێوەرە بۆ وشەی دووەم و سێیەم.

لێکۆڵەر بڕوای وایە، دەبێت بەڵگە لە دەربڕینەکانی (دەربڕینە چەسپاوەکانی) ئەو زمانەوە بهێنرێنەوە، کە تێدا وشەی یەکەم بنەما و پێوەر بێت، نەک دووەم و سێیەم.

بڕوانە (٢) بەراوردکردنی وشەی (پیاو) و (ژن):

(٢)

پیاو : (پیاویان پیاو وتووەو ژنیان ژن وتووە)، (پیاوبە و پیاوەتیم لەگەڵدا بکە)، (پیاوی فەقیر یان کوڕی دەبێت یان کچ)، (هەموو کەس لە شەرواڵی خۆیدا پیاوە)، (پیاوانە هەڵکەوتووە)، (پیاو کە فەقیرکەوت،

قەرزی کۆن و خزمی دووری بەیاد دەکەوێت)...هتد.

ژن: (ژن و پیاو)، (ژن و مێرد)

ئەم دەربڕینانە دەری دەخەن کە وشەکانی (پیاو)، (ژن) دەبێت بەم شێوەیە وشەی (پیاو) پێوەر بێت (بڕوانە (٣)).

٣)

پیاو (+ مرۆڤ، + پێگەیشتوو (کامڵ)، + نێر)

ژن (+ مرۆڤ، + پێگەیشتوو (کامڵ)، – نێر)

پێویستە بۆ هەموو وشەکانی دیکە ئەم جۆرە میتۆدە پێڕەو بکرێت.

زۆرینەی تیۆرییەکان کەموکورتییان دەستنیشان کراوە، یان لە هەندێک لایەنەوە ڕەخنەیان لێگیراوە. تیۆری (دیاریکردنی نیشانە واتاییەکان)یش ڕووبەڕووی هەندێک ڕەخنە بووەتەوە:

زمانەوانەکان پێیان وایە لە هەندێک دەربڕاو و فرێزدا، سنووری ئەم نیشانە واتاییانە ناتوانرێت زۆر ڕوون دیاری بکرێت.

کاتێک لە شوێنێکی گشتی ئەم نووسراوانە دێنە پێش چاو و بەڵام چەمک و تێگەیشتنەکە سنووری نیشانە واتاییەکان دەبەزێنێت (بڕوانە (٤)).

٤)

ا- گەرماوی ژنان، بەرگدرووی ژنان، سەرئاوی ژنان...هتد

ب- جلوبەرگی پیاوان، پێڵاوی پیاوان، شوێنی دەستنوێژگرتنی (شتنی) پیاوان،...هتد

سەرنجی لێکۆڵەرەوان لەوەدایە نموونەکانی (٤- ا) کچانیش دەگرێتەوە، لە چێوەی نموونەکانی (٤-ب) کوڕانیش جێیان دەبێتەوە. لە زمانی کوردیدا وشەی (ژن) خاوەنی نیشانەی (+ شووکردنە)، کاتێک بەرانبەر وشەی (کچ) بەکاردەهێنرێت. بەڕای ئەم لێکۆڵەرانە بێت، دەبێت وشەکانی (ژن) و (کچ) و (پیاو) و (کوڕ) وردتر و بەئاگایانەتر

بەکــاربهێنرێن. لێکــۆڵەر پێیــوایە وشــەی (ژن) لە (٤- ا) شاوشــەیە و کچیش دەگرێتەوە. بۆ وشـەی (پیاویش) هەر ئەو لێکدانەوەیە دەخرێتە بەرچاو.

بــۆ زیــاتر ڕوونکــردنەوە پێویســتە پێناســەی شاوشــە/ هایپۆنیم/گرتنەوە/داپۆشین بخەینە بەردەست: بریتییە لەو پەیوەندییەی لە نێوان دوو وشەدا هەیە. بەشێوەیەک واتای یەکێکیان ئەوەندە فراوان دەبێت، کە بتوانێت واتای وشەی دووەمیش بگرێتەوە یان پەیوەندییەکی لە خـۆ گـرتنە، هەمـوو ئەو وشـانە دەگـرێتەوە کە تـایبەتترن لە وشــە گشـتییەکە. یـان لە خـۆ گرتنـی واتـای وشـەیەکە لە وشـەیەکی گشـتیدا (بڕوانە (٥)).

٥)

وشــەی گۆشــت وشــە گشــتییەکەیە، کە ئەم وشــانەی دیـکەش لە ناویانـدا جێگەیـان دەبێـتەوە (گۆشـتی مەڕ، گۆشـتی ماسـی، گۆشـتی مریشـک...هتد). (بـۆ زانیـاری زیـاتر لەسـەر شاوشـە بـڕوانە: (کـورش سەفەوی، و. دلێر سادق کانەبی،( ٢٠٠٦: ١٦-٢٦))، (دارا حەمید محەمەد، (٢٠١٠: ١٥١-١٥٤).

شاوشە لە هەندێک باردا هەلی زمان ڕێگە بە هاتنەکایەوەی نـادات (بڕوانە (٦)).

٦) سەرتاشخانەی پیاوان ، ساڵۆنی ژنان

لە (٦) وشەی (پیاوان) دەکرێت ببێتە شاوشـە بۆ وشـەی (کوڕان)، بەڵام نابێــت بە شاوشــە بــۆ وشــەی (ژنــان) بە هــۆی وشــەکەی تەنیشتییەوە. چونکە سەرتاشخانە تایبەتە بە (پیـاو) و سـاڵۆنیش تـایبەتە بە (ژنـان). بـۆ ڕوونکـردنەوەی زیـاتر پێویسـتە نمـوونەی (٦) بەراورد بکرێت بە (٤-ا).

ئەم شیکارییە بۆ ئەم وشانەش ڕاستە، کە لە ئەنجامی بەکارهێناندا دەبـنە شاوشــە و گـۆڕان لە نیشـانە واتاییەکانیانـدا ڕوودەدات (بـڕوانە (٧)).

(٧

ا- مریشک (+/- نێر)ە، لەم ڕستەیەدا: شلەوبرنج بە مریشکەوە خۆشە.

ب- ژن (+/- پێگەیشتوو)ە، واتە بە واتای (ئافرەت)= (ژن/کچ) بەکارهاتووە لەم ڕستەیەدا: ڕێکخراوەکانی ژنان کەمتەرخەمن.

ئەم لێکۆڵینەوەیە، بە پێویستی دەزانێت لێرە بە دواوە باس لە کێڵگەی واتایی (خزم و کەسوکار) بکات لە چێوەی تیۆری (دیاریکردنی نیشانە واتاییەکاندا)، کە لێکۆڵەر پێیوایە نیشانە واتاییەکانی (خزم و کەسوکار)  لەناو دەربڕاوەکاندا دەگۆڕێن یان کەم و زیاد دەکەن، یان ئەم لێکۆڵینەوەیە هەوڵی سەلماندنی ئەم بۆچوونە.

بۆ توخمی نێر لە پەیوەندیی خزمایەتیدا ئەم وشانە هەن (باپیر، باوک، کوڕ، مام، خاڵ، برا...هتد)

بۆ توخمی مێ لە پەیوەندیی خزمایەتیدا ئەم وشانە هەن (داپیر، دایک، کچ، پوور (خوشکی دایک، خوشکی باوک)، خاڵۆژن، براژن...هتد)

ئەو نیشانە واتاییانەی بۆ جیاکردنەوە بەکاردەهێنرێن (توخم، تەمەن، پلەی خزمایەتی). واتە لە وشەی دایکدا ئەم نیشانانە هەن (+مرۆڤ، +مێ، + تەمەن+ کەسی پلە یەک (پەیوەست بە منداڵەوە)) (بڕوانە (٨)).

(٨

ا- باوک (+ مرۆڤ، + نێر، + /- تەمەن، + کەسی پلە یەک (باوکیەتی)).

ب- دایک (+ مرۆڤ، - نێر ، + /- تەمەن،+ کەسی پلە یەک (دایکیەتی)).

پ- خاڵ (+ مرۆڤ، + نێر، +/- تەمەن،- کەسی پلە یەک ).

ت- خاڵۆژن (+ مرۆڤ، - نێر، +/- تەمەن، - کەسی پلە یەک).

**۳/۱/۱/۱) جۆرەکانی واتا لە زانستی سیمانتیکدا:**

یەکەم: واتای فەرهەنگی :

ئەم واتایە لەناو فەرهەنگدایە و لەناو کێڵگەی واتایی یان کێڵگەی وشەدایە (پەروین عوسمان عەللاف، (۲۰۰۹: ۹۷))، یان لەناو مێشکی قسەکەری زمانەکەدا جێگیرو چەسپاوە. "لە فەرهەنگدا هەم واتای فەرهەنگیی وشەیەک و هەم بەهای نیشانەکانی "–"، "+" دیارییکراون" محەمەدی مەحویی، (۲۰۰۹ – ا– : ۱٤۷) (بڕوانە (۹)).

(۹) هەریەک لە وشەی /پیاو/، /ژن/ لە فەرهەنگدا بەم شێوەیە تۆمارکراون

[پیاو ]+ مرۆڤ، + پێگەیشتوو، + ژنهێنان،+ نێر

[ژن ]+ مرۆڤ، + پێگەیشتوو، + شووکردن، – نێر

لە (۹)دا، هەریەک لەوشەی /پیاو/، /ژن/ سەر بە پۆلە ڕەگەزی ناون، لە ناو ناویشدا مرۆڤن، تاکە جیاوازی کە هەیانبێت بریتییە لە /پیاو/ [+ نێرە] ،/ژن/ – نێرە].

ئەم دوو وشە فەرهەنگییە دەتوانرێت لە چێوەی جۆری واتاکانی دیکەدا بەکاربهێنرێن (بڕوانە (۱۰))

۱۰) ئەحە لە ماڵەوە پیاوە<. /پیاو/ لێرەدا بەمانا خواستراوەکەی < بەکارهاتووە، واتە خاوەن هەژموون و دەسەڵاتە، ئەگینا کەس گومانی لە + نێریی /ئەحمەد/ نییە.

ئەم جۆرەی واتا "خاوەنی ڕۆنانێکی وا ڕێکە کە بەئاسانی بەراورد دەکرێت لەگەڵ ڕۆنانی ئاستەکانی تری زماندا، وەکو فۆنۆلۆژی و ڕستەسازی" (محمد معروف فتاح، (۲۰۱۱: ۱٦۱)).

لە کۆتایی ئەم جۆرە واتایەدا ، پێویستە بگوترێت ، لە زمانی کوردیدا ئەم جۆرە واتایە بە کرۆکە واتا و واتای هۆشەکی یان بنەڕەتیش باسکراوە. (محەمەدی مەحویی، (۲۰۰۹– ب– : ۷۲))، (محمد معروف فتاح، (۲۰۱۱: ۱٦۱)).

دووەم: واتای ڕێزمانی/ گراماتیکی Grammatical meaning :

وشـە ئەرکییەکـان بـۆ گەیانـدنی واتـا و مەبەسـتی دیکە، لە کـردە مۆرفۆلـۆژی و سینتاکسـییەکاندا بەکـاردەهێنرێن. یـان بەکارهێنـانی وشـەیەکی دیـاریکراو لەگەڵ لاگرەکـان/ گیرەکەکـان و لە فرێـزو ڕسـتە جۆربەجۆرەکاندا، واتای گراماتیکی لێدەکەوێتەوە.

ئەمەش لە دوو ئاستدا خۆی دەبینێتەوە:

ا- بەکارهێنـانی مۆرفۆلۆژییـانە: کاتێک وشـەیەکی فەرهەنگـی وەک /پیاو/، لە فۆرمی /پیاوەکە/ ، /پیاوێک/ ، /پیاوان/...هتد بەکاردەهێنرێت، ئەوا جگە لە واتـا فەرهەنگیـیەکەی واتـایەکی تـر بـارکراوەتە سـەر واتـا فەرهەنگیـیەکە، کە ئەم واتـایە لەو کـردە مۆرفۆلۆژییـانەوە دروسـتبووە، کە بەسەر وشەکەدا هـاتوون. بـۆ نمـوونە /پیاوێک/ جگە لە نەناسـراوی واتای تاکییەتی دەگەیەنێت.

ب- بەکارهێنـانی سینتاکسـی: ئەگەر وشـە فەرهەنگییەکـانی هەر زمانێـک (کە خـاوەنی ئەلفـوبێ بێـت) بە نمـوونە وەربگـرین، ئەوا بەپێـی پێڕەوێک ڕیزدەکرێن، کە تێیدا ڕەچاوی پەیوەنـدییەکانی نـاوەوەی زمـان (ئاسـتی ئاسـۆیی و سـتوونی) ( Sentagmatic – Paradigmatic) (زۆر بە چاکی دەکرێت. نابێت چاوەڕێی ئەوە بکەین هەموو جارێک واتـای وشـە لێکدراوەکان و فرێزو ڕستە و ...هتد. پەیکاڵی واتـا فەرهەنگییەکـان بێت، چـونکە وشـەکان لە پێکهـاتەی گەورەتـر لە خۆیانـدا واتـایەک دروسـت دەکەن، پێیدەگوترێت واتای ڕێزمانی/گراماتیکی (کلۆد جێرمان و ڕیمۆ لۆبلان، (٢٠٠٦: ١٦)) ، (محەمەدی مەحویی (٢٠٠٩- ب -:١١٤- ١١٥))، (بڕوانە (١١)).

(١١) >تەنها پیاوان کاری وەها دەکەن<.

لە (١١) دا وشــەی /پیـاوان/ پەیوەنـدییەکی بە واتـای فەرهەنگیـی پیاوەوە هەیە. لە واتادا جیـاوازنین بەڵام لە حاڵەتی ڕێزمانیدا جیـاوازن، وشـەی /پیـاو/ دەکرێت مەبەسـت یەک پیـاو بێت ، هەرچەنـد گشـتییەتی تێدایە، بەڵام پیاوان چەمکی کۆ دەگەیـەنێت، واتـای فەرهەنگی و واتـای گرامــاتیکی پەیوەنــدییەکی ڕاســتەوخۆیان بەیەکەوە هەیە . ناتوانرێـت

واتـای فەرهـەنگـی بزانرێـت تـاوەکو واتـای گرامـاتیکیی ڕسـتـەکان ڕوون نەبن . بەو واتایەی واتای وشە لە بەکارهێنانی لە ڕستەدا دەردەکەوێت. بە پێچەوانەشــەوە واتــای فەرهـەنگــی یارمەتیــدەرە بــۆ زانینــی واتــای گراماتیکی، بەو واتایەی هەموو واتاکانی تر (گراماتیکی و میتافۆری و ئیدیەمی و پراگماتیکی) باردەکرێنە سەر واتای فەرهەنگی.

سێیەم: واتای میتافۆری Metaphor:

"بۆ دروستبوونی واتـای مێتـافۆری پێویسـتە وشـەیەک لە کێڵگەی واتایی دیاریکراوی خۆیەوە بگوازرێتەوە ، بۆ کێڵگەیەکی واتـایی دیکە بڕوانە (١٢ (Finch, (2005: 161)

(١٢)>لەبەهاری ١٩٩١دا میللەت دڕی بەتاریکیدا< .

لە (١٢)دا ناوی واتایی /تاریکی/خـاوەنی کێڵگەی واتـایی خۆیەتی . نیشانەی واتایی دیاری هەیە ، بەڵام لەم نموونەیەدا   لە کێڵگەی واتـایی خۆیدا بەکارنەهێنراوە ، بۆیە واتـای مێتـافۆری دروستدەکات . ماناکانی داگیرکار و جەورو زۆرداری ...هتد دەگەیەنێت.

واتـــای مێتـــافۆری لە بەکارهێنانـــدا لە کـــردە مۆرفۆلـــۆژی و سینتاکسییەکاندا دروستدەبن (بڕوانە (١٣)).

(١٣

ا- /دەمپیس/، /زمانلووس/، /دەستبڕ/...هتد/ مۆرفۆلۆژی

ب- >ئـازاد پـارەکەی خـوارد<، > ئەو هەمیشـە ڕادەکـات، بەڵام پێناگات<>بەختی ڕەش<، >ڕووی سپی<،...هتد. / سینتاکسی

هەمــوو ئەو وشــە و فرێــزو ڕســتە و دەربــڕاوانەی، کە واتــای مێتافۆریــان هەیە، واتــای فەرهەنگیشــیان هەیە، بەڵام گـوێگر هەمیشــە بیری بۆ لای واتا میتافۆرییەکە دەچێت، نەک واتا فەرهەنگییەکە (بڕوانە (١٤).

(١٤

ا- >لە هەر وڵاتێکدا پیاوی بچووک سێبەری گەورەی هەبوو، ئەوا خۆر لەو وڵاتەدا لە ئاوابووندایە<.

ب- <بەڕاستی قازی پیاو بوو>.

لە (١٤ – ا)دا، ڕاستییەکی زانستی هەیە ، کە خۆر لە ئاوابووندا بێت ، سێبەری هەموو تەنێک زۆر زیاتر لە قەوارەی خۆی دەردەکەوێت، کە ئەمە واتا فەرهەنگی و حەرفییەکەیە. هەرکاتێک پیاوی بوودەڵە و بچووک لە دنیابینی و ئاوەزدا، بە گەورە و مەزن سەیرکرا بە پیرۆز زانرا ، ئەوا ئەو وڵاتە نەگبەتییەتی ، خۆر بە مانای ئازادی/ پێشکەوتن/ چالاکی ...هتد. لە نەمان و بزربووندایە . ئەمە واتا مێتافۆرییەکەیەتی.

لە (١٤-ب) دا، وشەی /پیاو/ڕاستە هەڵگری واتای فەرهەنگی (+مرۆڤ، +نێر، + پێگەیشتووە)، بەڵام ئەم وشەی /پیاو/ە لێرە بە واتا میتافۆرییەکەی بەکارهاتووە و هەڵگری نیشانە واتاییەکانی ( + مەردایەتی، + خۆنەویستی، + خۆبەختکردن...هتد).

پێویستە بگوترێت، واتای مێتافۆری لە بەکارهێناندا چالاکانە، واتە لە کردە مۆرفۆلۆژی و سینتاکسییەکاندا دروستدەبێت . چونکە ئەم واتایە لە دانە دانەی یەکە پێکهێنەرەکانی دروستەکەوە دەست ناکەوێت، وەک واتای فەرهەنگی/ حەرفی، نەک هەر واتای میتافۆری بگرە واتای گراماتیکیش، یان "دەربڕینە فرە- خراوە تەکییەکەکان، ژمارەیان گەلێک زۆرە و دەیشتوانن بێکۆتابن . ئەوانە دەتوانرێن هەمیشە و بەردەوام دروستبکرێن و بەرهەمبهێنرێن و لە ئاخاوتنی ڕۆژانەشدا بەردەوام بەرهەمدەهێنرێن. لەبەر ئەوە شاکاری وەک وشەنامەکان بۆ واتای ئەم یەکە ئاڵۆزانە بەرهەمێکی هێجگار گەورە و کۆتایی نەهاتوو دەبێت" (محەمەدی مەحویی (٢٠٠٩- ب -: ١١٦ ))، بەڵام واتای فەرهەنگی وشەکان لە فەرهەنگی زمانەکاندا تۆماردەکرێت. واتای یەکە واتاییەکانی وەک (ئیدیەمەکان، پەندی پێشینان، کۆمەڵە وشەکان...هتد) لە فەرهەنگی تایبەت بەخۆیاندا ڕووندەکرێنەوە.

له‌ کۆتـایی ئه‌م جـۆره‌ واتـایه‌دا ، پێویسـته‌ بگوترێـت له‌ زمـانی کوردیدا ئه‌م جۆره‌ واتایه‌ به‌ تویکڵه‌ واتا و واتای بارکراو باسکراوه‌ (محه‌مه‌دی مه‌حویی، (٢٠٠٩- ب- : ٧٢))، (محمد معروف فتاح، (٢٠١١: ١٦١- ١٦٢)).

چواره‌م: واتای ئیدیه‌می:

ئیدیه‌م کۆمه‌ڵه‌ وشه‌یه‌که‌ ، کاتێک پێکه‌وه‌ به‌کاردێن واتای جیاواز ده‌به‌خشن، له‌و واتایه‌ی که‌ وشه‌کان جیا به‌ جیا هه‌یانه‌ "
( 1996: iv) وه‌رگیراوه‌ له‌ (2007: 23). Twana Saadi Hamid, )).
Sinclair )

ئیدیه‌مه‌کان له‌ ڕووی سینتاکسییه‌وه‌ ئازاد نین و کۆت و مه‌رجیان هه‌یه‌، له‌ ڕووی سـێمانتیکییه‌وه‌ واتایـان لـێڵه‌، واتـایه‌ک ده‌به‌خشـن زۆر جیاوازه‌ له‌ واتای دانه‌ دانه‌ی یه‌که‌ پێکهێنه‌ره‌کانیان.

ئیدیه‌م یه‌که‌یه‌کی واتاییه‌ ، ده‌کرێت وشه‌ یان فرێز یان ڕسته‌ بێت، هه‌رچه‌نـده‌ ئیـدیه‌مه‌کان له‌ ڕووی چه‌قبه‌سـتوویی و لێڵـی و ته‌مـومژی واتـاییه‌وه‌ وه‌ک یه‌ک نـین، هه‌یـانه‌ تـا ڕاده‌یه‌ک نه‌رمه‌ و هه‌یـانه‌ به‌ لێکسیمبوو یان به‌ به‌ردبوو ده‌ژمێردرێن (بۆ زانیاری زیاتر بڕوانه‌ ( شیلان عومه‌ر حسه‌ین، (٢٠٠٩: ٩٠- ٩٤)).

جیاوازییه‌کی تاڕاده‌یه‌ک گونجاو له‌ نێوان واتای مێتافۆری و واتای ئیدیه‌مدا ئه‌وه‌یه‌، واتای مێتافۆری زۆر لێڵ و ته‌مومژاوی نییه‌، ده‌کرێت مـرۆڤ یه‌که‌م جـاری بێـت بیبیسـتێت و به‌ هـۆی چوارچێـوه‌ی بـاری وتنه‌کانه‌وه‌ واتاکه‌ بزانێت (بڕوانه‌ (١٥)).

>ئاگر له‌ ماڵیاندا ناکرێته‌وه‌<، >پێپرشت<، >ئاوی کرده‌ژێر<، >به‌ شوویدا<، /قوڕبه‌سه‌ر/، /جنێوفرۆش/...هتد.) ١٥

هه‌رچی واتـای ئیـدیه‌مییه‌ ته‌مـومژاوی و لـێڵه‌، لێکدانه‌وه‌ی ئاسـان نییه‌ و مرۆڤ یه‌که‌م جاری بێت بیبیستێت، به‌ هۆی چوارچێوه‌ی باری وتنه‌کـانه‌وه‌ هه‌رگیـز واتـاکه‌ نازانێـت، به‌ شـێوه‌ی په‌نـدی پێشـینان چیرۆکێکـی له‌ پشـته‌وه‌یه‌ و په‌یوه‌نـدییه‌کی زۆر به‌هێـزی به‌ مێـژوو و

کلتووری نەتەوەی خاوەن زمانەوە هەیە (بڕوانە (١٦)).

١٦) کەر لە ماڵیاندا بکەوێت دانی دەشکێت<،  >کڵاوکردنەسەر<، >دەزووی وشک دانییەتی<،>چنگ لەسەر شان<، /یەکشەوە/، /ژەقنەمووت/ ، /سەرشین/...هتد.

ئەگەر سەرنجی نموونەکانی (١٥، ١٦) بدەین، دەبینین دروستەی >ئاگر لە ماڵیاندا ناکرێتەوە<، لە ریزی واتای مێتافۆریدا دانراوە، ئەمەش لەبەر ئەوەیە تاڕادەیەک فۆرمی دروستەکە، پەیوەندی بە واتای دروستەکەوە هەیە. چونکە ئاگر یەکێکە لەو پێویستییانەی یان یەکێکە لەو کردانەی ، کە لە سازکردنی خواردندا پێویستە، بەڵام دروستەی >کەر لە ماڵیاندا بکەوێت دانی دەشکێت< لە ریزی واتا ئیدیەمییەکاندا دانراوە ، چونکە بە هیچ شێوەیەک فۆرمی دروستەکە واتای دروستەکە ڕوون ناکاتەوە. هەردوو دروستەکەش هاوواتان ، یان هیچ نەبێت واتایان لەیەکەوە نزیکە، کە /هەژاری/، /نەداری/و /نەبوونی/و /چرووکی/و /ڕەزیلی/ دەگرێتەوە.

پێنجەم: واتا و مەبەستی پراگماتیکی:

پراگماتیک لێکدانەوەی ئەو لایەنانەی واتایە، کە ناچنە ناو سیمانتیکییەوە ، واتە پراگماتیک لەو واتایانە دەکۆڵێتەوە ، کە فەرهەنگی نەبن ، هەرچی واتایەک نەچێتە ناو فەرهەنگەوە پراگماتیکە" (محمد معروف فتاح، (٢٠١١: ١٨٨- ١٩٠)) یان " پراگماتیک لێکۆڵینەوە نییە لە واتای فەرهەنگی، بەڵکو لێکۆڵینەوەیە لە واتای گەیەنراو (واتای قسەکەر) و توانای قسەکەر نیشاندەدات لە تێگەیاندنی گوێگر بەشێوازێک، کە لەگەڵ واتا فەرهەنگییەکەدا یەک نەگرێتەوە" (عەبدولواحید موشیر دزەیی، (٢٠١١: ١٥)). یان "مەبەست لە واتای پراگماتیکی ئەو واتایەیە کە لە ڕێگەی کەرەستەیەکی ئاساییەوە ناگات، بەڵکو هەڵهێنجانە لەوەوە کە لە پشت وتراوەکانەوەیە" هۆگر مەحموود فەرەج، (٢٠١٢: ١٩٢) لەپراگماتیکدا قسەکەر شتێک دەڵێت و مەبەستی شتێکی ترە ، گوێگریش شتێک دەبیستێت و شتێکی تر لێکدەداتەوە.

سێمانتیک لێکۆڵینەوەیە لە واتای فەرهەنگی، گراماتیکی، مێتافۆری، ئیدیەمی ئەگەر بە مەبەستی پراگماتیکی بەکارنەهێنرابن. واتە ئەوەی کە تا ئێرە باسکرا کارکردن بوو لە سێمانتیکدا. بەڵام لە هەندێک باردا"قسەکەر لە هەڵوێستە جۆراو جۆرەکانی ڕۆژانەی ژیاندا زمان بەکاردەهێنێت، لەوە زۆرتر مەبەستێتی (واتای زۆرتر دەردەبڕێت)، کە بە ڕاستیی و بەکردەوە دەیەوێت بیڵێت" محەمەدی مەحویی (٢٠٠٩- ب - ٢١٠).

"هەر کە قسە دەکەین، هەندێک مەبەست و قەسدمان هەیە. هەندێک جار مەبەست و قەسدەکە  بە شاراوەیی و بە خشکەییە . بە واتا، کە ڕاستەوخۆ لە ڕێی دەربڕاوە بەرهەمهێنراوەکەوە بە دەستەوە نادرێت و نادرێت بە کەسی بەرانبەر (بڕوانە(١٧)).

(١٧)  خوێندکارێک بەهاوڕێکەی:

+ >کاتژمێر چەندە<؟

- ->موحازەرەکە دوو کاتژمێرییە< (دەبڵە).

لە (١٧) دا و بەوەڵامی گوێگردا خوێندکارەکە تێدەگات ، کە: وانەکە زۆری ماوە.

واتە بەپێی دەوروبەری گفتوگۆکە ، یەکەم پرسیاری کاتی وانەکەی کردووە و گوێگریش وەڵامی داوەتەوە و تێیگەیاندووە کە زۆری ماوە ، بێ ئەوەی هیچ یەکێک لە کەسەکان ڕاستەوخۆ پرسیاری مەبەست ئاراستەی ئەوی تریان بکەن.

لەگەڵ ئەوەی پێناسەیەکی زۆر بۆ پراگماتیک خراونەتەڕوو، بڕوانە: (محمد معروف فتاح، (٢٠١١:١٨٨- ١٩٢))، بەڵام ئەم لێکۆڵینەوەیە قورسایی دەخاتە سەر ئەو پێناسانەی کە لە بەشی دووەمدا، بۆ ڕاڤەکردن و شیکردنەوەی پەندەکان کەڵکیان لێوەردەگیرێت.

**٢/٢)  خێزان لە کۆمەڵی کوردیدا:**

کلتووری کۆمەڵی کوردی بە هاوبەشی لەگەڵ کلتووری ئیسلامی، جۆرێک لە پێڕەو ڕێکخستنی لە ناو کۆمەڵی کوردیدا دروستکردووە. خێزان وەک بچووکترین یەکەی ئەو پێڕەو و ڕێکخستنە سەیردەکرێت، کە بەدوایدا یەکەی گەورەتری وەک بنەماڵە و هۆز و تیرە و عەشیرەت و ...هتد ریزدەبن.

بچووکترین خێزان لە پیاوێک و ژنێک پێکدێت، کە ڕێکەوتنێکی ئاینی و یاسایی و کۆمەڵایەتی بەیەکیانەوە دەبەستێتەوە. دەشێت و باو بووە خێزانە بچووکەکان لە ڕێگەی نەوە خستنەوە و فرەژنییەوە فراوان و گەورەبووبن، یان خێزان بریتییە "لە دوو گەورە تەمەن بەیەکەوە لەگەڵ منداڵەکانیان ئەو منداڵانەش کە هێناویانەتە ناو خێزانیانەوە دەژین" (ئەنتۆنی گیدز، و.حەسەن ئەحمەد، ٢٠٠٩: ٥٠٨)). لە کۆمەڵی کوردیدا فرەژنی دیاردەیەکی ئاسایی و باو بووە، چونکە "هەموو دینە باوەکانی ناو کۆمەڵگای کوردی ڕێگەی فرەژنییان بەپیاو داوە" (نەوشیروان مستەفا ئەمین (٢٠١٥: ٥٧)). پیاوێک توانیویەتی ژنی زۆر بهێنێت، کە خاوەن دەسەڵات و سەرمایە بووبێت. فرەژنی پێگەیەکی کۆمەڵایەتی بەرزی بۆ پەیداکردووە  (بڕوانە (١٨)).

١٨) کورد کە پارەی هەبوو یان ژن دەهێنێت یان پیاو دەکوژێت.

بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی فرەژنی بڕوانە: (ئەنتۆنی گیدز، و. حەسەن ئەحمەد، ٢٠٠٩: ٥٠٩

خێزان تا گەورەتربووبێت بۆ ئەندامانی خێزان باشتربووە، ئەمەش پەیوەستە بە هەیمەنە و دەسەڵات لە لایەکەوە، کارو مەینەتی ڕۆژانە لەلایەکی دیکەوە. خێزان گەورەی خاوەن کوڕ و هەرزەکار، دەسەڵاتی گەورەی هەبووە و چاکتر بە کارەکانی ڕۆژانە ڕاگەیشتووە، بەجێهێنانی ئەرکەکان ئاسانتر هاتوون بە دەستەوە.

لە خێزانی کوردیداو لە زۆرینەی باردا، باوک دەسەڵاتی تەواوی هەبووە، زۆرینەی کارەکان بەپرس و ڕاوێژی ئەو کراون. هەر ئەویش

بەرپرسی پەیداکردنی نان و بژێوی و پاراستنی خێزان بووە. دوای باوک کوڕی گەورە ڕۆڵی کاریگەری هەبووە و ئامادە و سازکراوە لە نەبوونی باوکدا جێگەی باوک بگرێتەوە. ژن کەمتر قسەی ڕۆشتووە، مەگەر ژنێک پێگەی کۆمەڵایەتی خۆی یانماڵە باوانی یان ویست و لێزانی خۆیی قورسایی و دەسەڵاتی بۆ دروستکردبێت، ئەگینا زیاتر وەک ئەرک بەجێهێنەرێک تەماشاکراوە (بڕوانە (١٩)).

١٩) ژن کارەکەری ماڵە.

پیاوی کورد کاتێک ویستبێتی جۆرێک لە نازناو و قورسایی و هەیمەنە بدات بە ژنەکەی، ئەوا لە بەراوردی ژنی خۆیی و ژنانی تردا بووە. یان لە دوای خۆیەوە بووە، ویستوویەتی پریشکی ڕێزی ئەم بەر ژنەکە بکەوێت، نەک بە پێچەوانەوە (بڕوانە (٢٠)).

٢٠) بە خۆم بڵێن ئاغا و بە ژنەکەشم بڵێن ئاغا ژن.

بۆ سەلماندنی ئەو ڕاستییەی کە ژن لە پلەدا دوای پیاوەکە هاتووە، ئەگەر پیاوەکەی نازناوێکی پیشەیی ، کۆمەڵایەتی ، ئاینی یان زانستی هەبووبێت، ئەوا ژنەکەش هەمان نازناوی هەڵگرتووە. بڕوانە وشەکانی (ئاغاژن و مەلاژن و مامۆستاژن و حاجی ژن ...هتد).

پیاوی کورد ئەگەر لە ژنێک زیاتری هەبووبێت ئەوا ژنەکان هەوێی یەکتری بوون. ئەگەر ژن لە مێردێکی تر یان پیاو لە ژنێکی تر منالی هەبووبێت، ئەوا پەیوەست بە ژن یان پیاوەکەوە /هەنەزا/بووە. پەیوەست بەمنداڵەکانیشەوە /زڕخوشک/ یان /زڕبرا بووە/. پیاو پەیوەست بە منالی ژنەوە /باوەپیارە/ بووە. ژنیش پەیوەست بە منداڵی پیاوە و /باوەژن/ بووە، کە لە کۆمەڵی کوردیدا هەردووکیان/باوەپیارە و باوەژن/ بەبێ ڕەحم و خوانەناس ناوبانگییان دەرکردووە (بڕوانە (٢١)).

٢١)

ا- باوەژن دین دوژمن (شێخ محەمەدی خاڵ، ( ٢٠٠٧: ٧١)).

ب- باوەژن خوا بناسە.

كوڕی گەورەی ماڵ، كە دوای باوك جێگەی باوكی گرتووەتەوە، ئەركی پەروەردە و بەخێوكردنی خوشك و براكانی گرتووەتە ئەستۆ، جگە لەمە بە تەواوی ماڵ لەژێر دەستیدابووە و قسەی ڕۆشتووە و هەرچی برای بچووك و خوشكی بچووك هەبوون، لە فەرمان و قسەی لایان نەداوە. هەربۆیە بەزاری برا بچووكەوە بە بێزارییەوە وتراوە (بڕوانە (٢٢)).

( ٢٢

أ- نە برا بچووك بیت، نە ماڵت لە پاینی ئاوایی بێت.

ب- (برای وردی هەرو گردی) برای بچووك كەری هەموویان.

لە كۆمەڵی كوردیدا خزمایەتی تۆڕێكی بەتینی پاراستنی پەیوەندی بووە. كە لە چەند بازنەیەك پێكهاتووە، لە بازنەی (پلەی)  یەكەمدا خێزان دێت، كە بریتیبوون لە باوك و دایك و خوشك و برا لە هەندێك بار و خێزاندا تەنانەت /بووك/ و /زاوا/ ، كە زاوا مێردی خوشكە و بووك ژنی برایە، نەیانتوانیوە سنووری ئەو بازنەیە ببڕن و ببنە بەشێك لە خێزانەكە و بە بێگانە سەیركراون. تەنانەت لە سەدەكانی پێشوودا بووك وەك خزمەتكار و ئامێری وەچە خستنەوە سەیركراوە. ئەگەر بەدایكی كوڕان بووبێت قەدرو ڕێزی زیاتر بووە و وەجاغی ڕۆشنكردووەتەوە.

زاوا كە لێكۆڵەران پێیان وایە لە بنەڕەتدا پارێزەری شەرەف و ناموسی ماڵە خەزوورانە. تا كۆتایی سەدەی بیستیش وەك ئەتككەر سەیركراوە و خۆشەویستی باوك و برای بووك نەبووە و بە چاوێكی سووكەوە سەیركراوە (بڕوانە (٢٣)).

٢٣) زاوا كەری خەزوورە.

لە خێزانی كوردیدا باوك و دایكی مێرد یان ژن بۆ هەریەكێكیان خەزوور و خەسوو بوون.  بووك و خەسوو پەیوەندییان باش نەبووە، بەڵام زاوا و خەسوو پەیوەندییان توندوتۆڵ بووە (بڕوانە (٢٤)).

٢٤) ئەگەر بووک و خەسوو ڕێککەوتن، ئەوا گوێرەکە بە پەیژەدا سەردەکەوێ.

وەجاخ لە کوڕەوە گوێزراوەتەوە، منالّی کوڕ هەلّگری ناوی باپیریان (باوکی کوڕ) بوون، نەک منداڵی کچ. زاوایەک لەمالّە خەزووردا بووبێت بە (زاوا ڕێوی) ناوبراوە. تانەیەکی گەورە بووە ئەگەر دایک و باوکیش لای زاوا بووبن و زاوا بەخێوی کردبن (بڕوانە (٢٥)).

٢٥) خودا بدا مەرگم زاوا نەکا بەرگم.

برای ژن دەبێتە خاڵی منداڵەکان و ژنبرای مێرد، ژنەکەشی دەبێتە خالّۆژنی منداڵەکان. برای مێرد پەیوەست بە ژنەوە بە /هێوەر/ یان /شووبرا/ ناوبراوە. ژنەکانیشیان بە هێوەرژن ناوبراون. پەیوەندیی هێوەرژن پەیوەندییەکی کێشمەکێشی پڕ لە ئالّۆزی شەڕ بووە (بڕوانە (٢٦)).

٢٦) هێوەرژن لەسەر سەنێرگەش گوویان شەڕدەکات.

هێوەر دەبێتە /مام/ بۆ منداڵ کە پشت و پەنایەکی گەورە بووە، /هێوەر ژنیش/ دەبێت بە /ئامۆژن/ (مامۆژن). خوشکانی مێرد بۆ ژن بوون بە /دش/و بۆ منداڵەکانیشی بوون بە /پوور/. پەیوەندیی نێوان ژن /بووک/ و دش پەیوەندییەکی خراپ بووە (بڕوانە (٢٧)).

٢٧) هەرکەس دشی لە دێدایە، درەوشێکی لە پێدایە.

خوشکی ژن بۆ مێرد بوون بە /ژنخوشک/ و بۆ منالّەکانیش بوون بە /پوور/. ئەمانە هەموویان پەیوەندیی خێزانی کۆی کردوونەتەوە و لە وانەیە لە یەک مالّدا ژیابن.

خێزان بە کۆمەڵێک کەسی تەرەوە بەستراوە، کە تۆڕێکی کۆمەڵایەتی فراوانتر بە هۆی ژن و ژنخوازییەوە دروستدەکەن. کە لێکۆڵەران پێیانوایە لە خێزان گەورەتر بنەماڵەیە. جگە لە بنەماڵە خزم و خوێش یان قەوم و کەسوکاریش ڕۆڵێکی گرنگیان لە پایەی کۆمەڵایەتی تاک و کۆمەڵدا هەیە. لە بنەماڵەدا تاکەکان لەکاتی تەنگانەدا بەهانای

یەکترییەوە دێن و پشتگیری لە یەکتری دەکەن. ئەم دیاردانە زیاتر لەلایەن گوندنشینەکان و کۆمەڵی جیهانی سێیەمەوە پێڕەو دەکرێن. (بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: مەجدەدین عومەر خەیری خەمەش، (۲۰۱۲: ۱۰۸)). تاکی خاوەن بنەماڵە و خزمی زۆر، کەس نەیوێراوە نزیکی کەوێت، (بڕوانە (۲۸)).

۲۸)

ا- خزم هەتا زۆربێت هێشتا هەر کەمە.

ب- دۆستت هەزاربێت کەمە، دوژمنت یەک بێت غەمە.

پ- خزم گۆشتیشت بخوا ئێسقانت ناشکێنێت.

بە هەمان شێوە خزمی خراپیش بووەتە مایەی نەنگی و سەرشۆڕی (بڕوانە (۲۹)).

۲۹) خزمی خراپ وەک گونی قۆڕ وایە، بیبڕی ئەتکوژێ، نەیبڕیت حەیات دەبا.

هەندێک جار /خاڵ/ و /مام/ چوونەتە ناو دامەزراوەی خێزانەوە. باوک خاوەنی دەسەڵات بووە و کۆمەڵی کوردیش کۆمەڵێکی (باوک سالاری) پیاو سالاری بووە. پیاو /باوک/ هەڵگری ناوی خێزانە و زاڵە. دەسەڵاتی ئابووری هەیە و بەرپرسە لە پەیداکردنی بژێویی خێزان. ئەگەر پیاوێک دەسەڵات و هەیمەنەی لێ سەندرایەوە، ئەوا بە کەم تەماشا دەکرێت و ئەم فریزانەی بەرانبەر بەکاردەهێنرێت (بڕوانە (۳۰)).

<۳۰) ئەحە ژنانی< ، >گوێ ڕەپ< ، >موونەرم< ...هتد

لە کۆمەڵی کوردیدا کۆمەڵێک یاسا و دابونەریت، ژیانی خێزانیان ڕێکخستووە. بۆ نموونە هاوسەرگیری و مارەبڕین و دەست ماچکردن، مەرجی پێشوەختی پێکهێنانی خێزانی کوردی بووە. لە کۆمەڵی کوردیدا بێسەروبەرەیی و فەوزای سێکسی ڕووی نەداوە (بڕوانە: توانا فریدون حسین، (۲۰۰۸: ۷۹)).

ئەم خێزانــانە گەورەبــوون نــاوی بــاپیرەگەورەی خێزانەکانیــان لێنراوە و بوون بە بنەماڵە، "بنەماڵە پێکهاتووە لە گرووپێک لە تاکەکان کە بە هۆی خوێن یان هاوسەرگیرییەوە پێوەندییان هەیە" (بروس کۆهێن، ٢٠١٤: ١٩٧)). ئیتر چەند بنەماڵەیەکیش، کە پەیوەندیی خوێن پێکەوەیان ببەستێت هـۆزو تیرەیـان دروسـتکردووە و ئەوانـیش عەشـیرەتیان پێکهێناوە (بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی بنەماڵە: (بڕوانە بروس کۆهێن، (٢٠١٤: ١٩٩)). لە کۆمەڵی خێڵەکیدا هۆز و تیرە و عەشرەت یان ڕەوەند یان نیشـــتەجێبوون. جۆرێـــک لە ڕێککەوتنـــی کـــۆمەڵایەتی و خـــاوەن بەرژەوەنـدی و هێـزی جەنگیـی  هـاوبەش بـوون. بەیەک شـێوەزار ئاخاوتوون و یەک ئاین و ئاینزایان هەبووە و پشتی یەکیان گرتووە و ژن و ژنخـوازی زۆر تونـد بە یەکیـیەوەی بەسـتوونەتەوە. خزمـایەتی تـۆڕێکی تـاڕادەیەک بەربڵاوتـرە لە بنەمـاڵە و هـۆز و تیـرە و ...هتـد، خزمەکان زیاتر لە بۆنە کۆمەڵایەتییەکانی وەکو جەژنەکان و پرسە و ژنهێناندا لە دەوری یەک کۆدەبنەوە.

لە کۆتـایی ئەم پـارەدا پێویسـتە ئەوە بخـرێتەڕوو، کە کـۆمەڵی کــوردی کۆمەڵێــک دیــاردە و ڕەفتــاری باشــی وەک: میوانــداری و دراوسێیەتی و نانبدەیی و ...هتد تێدابووە. هەروەها کۆمەڵێک دیاردە و کەلتووری ناشیرینی وەک: ژنبەژن و گەورە بەبچووک و ڕەدووکەوتن ...هتد ی، پێڕەوکردووە.

### ٣/٣) شـیکردنەوە واتاییەکـانی پەیوەنـدییە کۆمەڵایەتییەکـان لە ڕوانگەی پەندەوە:

لەم بەشـەدا پەیوەنـدیی نێـوان تاکەکـانی خێـزان، لە ڕوانـگەی ئەو پەنـدانەی کە هەن و لەبەر دەسـتدان دەخـرێنەڕوو. ئەم لێکـۆڵینەوەیە پێشبینی دەکات ئەگەر پەیوەندییەکە پەیوەندییەکی ئاسایی بێ کێبەرکێی بووبێت، ئەوا پەندی لەسەر نییە، یان کەمترین پەندی لەسەرە. وەک پەیوەندیی نێوان باپیرو کوڕەزا یان کچەزا، بەڵام ئەگەر پەیوەندییەکە

پڕ ململانێی توندی بەردەوام بووبێت، ئەوا زۆرترین پەندی بۆ وتراوە. وەک پەیوەندیی نێوان بووک و خەسوو.

ئەم لێکۆڵینەوەیە هەوڵدەدات لەڕێگەی دەربڕینە چەسپاوەکانەوە (پەندی پێشینان) ەوە، ئەو پەیوەندییانە نیشانبدات. خستنە ڕووی پەیوەندییەکان و واتاکانیان کاری زانستی سێمانتیکە، لەناو جۆری واتاکانی سێمانتیکیشدا (واتا فەرهەنگی) و (واتای گراماتیکی) بەرپرسن لە روونکردنەوەی واتای وشە و ڕستە و دەربڕاوە سینتاکسییەکان.

سیمانتیک: " سیمانتیک وەک لقێکی زانستی زمان خۆی بە ڕەهەندەکانی واتامەندیی پێڕەوبەندانەی دەربڕاوە زمانییەکانەوە خەریکدەکات، سێمانتیک زانست و تیۆریی ڕێکخستن و یاسابەندێتیی هەندێک لایەنی دیوی واتای هێما زمانییەکانە" (محەمەدی مەحویی، ٢٠٠٩: ٢١-٢٢)).

سیمانتیک بەرپرسە لە لێکدانەوەی واتای دەربڕاوەکان، بە هەموو دروستە جیاوازەکانیانەوە (وشە، فرێز، ڕستە، دەق...هتد)، لە سیمانتیکدا واتاکان ئاسانتر دەگەن و بیرکردنەوە و تێڕامانی قووڵی ناوێت.

گرنگترین دامەزراوەی کۆمەڵایەتی خێزانە، لە خێزانەوە کۆمەڵە و گرووپە جیاوازەکانی دیکە دروستدەبن، "هیچ کۆمەڵگایەکی مرۆیی بەبێ خێزان بوونی نییە، خێزان بە باوکی کۆمەڵگا دەژمێررێت" (تەلار ئەحمەد مستەفا، (٢٠٠٩: ٨٧)). خێزان یەکەمین دامەزراوەیە، کە تێدا کەلتووری کۆمەڵایەتی و ئاوەزمەندی و بیری تایبەتی نەتەوەی خاوەن زمان بۆ نەوەکان دەگوێزێتەوە.

هەوڵدەدرێت پەیوەندییەکان پێڕەو بەندانە و بە پاڵپشتی نموونەی پەند ڕێکبخرێن وەک ئەوەی کە هەیە. مرۆڤی کورد دواوە گوزارشتی لە ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی ...هتد خۆیی کردووە. گوزارشتەکانی پەیوەندییەکی تەواویان بە بیرەکانییەوە هەبووە ، بیرەکانیشی پەیوەندییەکی پتەویان بە جۆری ژیان و پەیوەندیی کۆمەڵایەتی و ڕێکخستنی خێزانەوە هەبووە.

لەم لێکۆڵینەوەیەدا هەوڵدەدرێت، لە ڕێگەی نیشانە واتاییەکانەوە لە سەرەتادا واتای فەرهەنگیی وشەکانی کێڵگەی خزم و کەسوکار بخرێنە بەرچاو. دواتر بەهۆی واتای گراماتیکییەوە واتای وشەکانی کێڵگەی خزم و کەسوکار لەناو پەندەکاندا نیشاندەدرێن، لەگەڵ ئەو گۆڕانکاری و نیشانە واتایانەی کە بۆ وشەکان زیاد یان کەم دەبن.

**یەکەم: پەیوەندیی نێوان براوبرا:**

برا لە کۆمەڵی کوردیدا وەک پشت و پەنا سەیر کراوە، لە کاتی تەنگانەدا برا فریایی برا کەوتووە. هەر کەسێک برای زۆری هەبووبێت تاڕادەیەک پارێزراو بووە (بڕوانە (٣١)).

٣١) برا لە پشت برا بێ، مەگەر قەزا لە لای خودا بێت.

لە فەرهەنگی کوردیدا یان واتای فەرهەنگی وشەی /برا/بریتییە لە:
[برا] (+ مرۆڤ ، + نێر ، +/- پێگەیشتوو، + کەسی پلە یەک)

بەڵام لە پەندی ژمارە (٣١) دا، لە واتای گراماتیکی پەندەکەوە، ئەم گۆڕانکارییانە ڕوودەدەن یان نیشانە واتاییەکانی وشەی (برا) بریتی دەبن لە: ( + مرۆڤ ، + نێر ، +/- پێگەیشتوو ،+ کەسی پلە یەک، + پشتیوانی)

ئەم پشت و پەنا و یەکگرتنەی برا، لەکاتی بوونی کێبەرکێ و گێچەڵی بێگانەدا بووە. بەڵام کاتێک قسە هاتووەتە سەر  ماڵ و موڵکی دنیا، ئەوا هەر برایە و دەستی بە بەرژەوەندیی خۆیەوە گرتووە (بڕوانە (٣٢)).

٣٢)

ا- برایمان برایی کیسەمان جیایی. (شێخ محەمەدی خاڵ، ( ٢٠٠٧: ٩٧))

ب- برا برایە بازاڕ جیایە. (شێخ محەمەدی خاڵ، ( ٢٠٠٧: ٩٦))

کاتێک دابەشکردنی میرات و بەرژەوەندی هاتووەتە پێش، برای گەورە بە هەلپەرست و بەرژەوەندیخواز باس دەکرێت. لە چیرۆکە فۆلکلۆرییەکاندا زۆر بەڕوونی ڕەنگیداوەتەوە. لە هەندێک باریشدا برا

گەورە زیاد لە سنووری دەسەڵاتی خۆیی بەکارهێناوە و بووەتە هۆی بێزاریی چواردەورەکەی بۆیە وتراوە:

(٣٣

برای گەورەبە و، گووی زیادە مەخۆ. (شێخ محەمەدی خاڵ، ( ٢٠٠٧: ٩٦)).

واتە لە کاتی هاتنە پێشەوەی بەرژەوەندی و بازرگانی و میرات دابەشکردندا، نیشانە واتاییەکانی برا گۆڕاون بۆ:

(+مرۆڤ ، + نێر ، +/- پێگەیشتوو ،+ کەسی پلە یەک، + گیرفان جیایی ، + دەستگرتن بە بەرژەوەندییەوە)

لە کۆمەڵی کوردیدا ئەگەرچی برا پشت بووە، بەڵام کێبەرکێی نێوان براکان ڕێگەی نەداوە برایەک حەز بکات براکەی لە خۆی پیاوتر بێت. بەو واتایەی برا ئەگەر پیاوێکی مەزن بووبێت پەنایەکی باش بووە بۆ براکانی، بەڵام کە کار گەیشتووەتە کێبەرکێی نێوان دوو برا، ئەوا هەر برایەک حەزیکردووە ئەو لە براکەی خاوەنی کوڕی زیاتر و دەوڵەمەند تر پیاوتر بێت. ژن لەم کێشمەکێشەدا ڕۆڵی گەورەی بینیوە (بڕوانە (٣٤)).

(٣٤

ا- برا حەز بەمەرگی برا ناکات، بەڵام حەز بە ڕووتوڕەجاڵی دەکات.

ب- بابمان برایە، بەڵام تۆزێک من لە تۆ ئەوجاغزادەترم. (حەمید گەردی، (٢٠٠٦: ٥٩)).

باوان لە باوکەوە گوێزراوەتەوە، واتە منداڵ هەڵگری ناوی باوک بووە نەک دایک. تەنها ئەو منداڵانە نەبێت کە باوکیان مردووە بەناوی دایکیانەوە بانگکراون. لەبەر گرنگیی باوک لە گواستنەوەی ڕەچەڵەکدا گرنگیی زیاتر بە برای دایک و باوکیی یان باوکیی زیاتر دراوە بە بەراورد بە برای دایکیی (بڕوانە (٣٥)).

(٣٥

برای دایک جیازە وەک ماری بێ ئیجازە. (شێخ محەمەدی خاڵ، ( ٢٠٠٧: ٩٦)).

واتە برای دایک وەک ماری بێ ئیجازە ئامانی نییە و پێتەوە دەدات. بەم پەندەدا دەردەکەوێت کە نیشانە واتاییەکانی برا دیسان بەپێی بارودۆخە کۆمەڵایەتییەکە گۆڕانیان بەسەردا هاتووە بەم شێوەیە:

(+مرۆڤ ، + نێر ، +/- پێگەیشتوو ، + کەسی پلە یەک ،+ بێ متمانەیی ، + فرسەت هێنەر ، + بەشخۆرو میراتبەرو داگیرکەر)

**دووەم: پەیوەندیی نێوان ئامۆزا و ئامۆزا:**

لە دوای برا ئامۆزا هەمان ڕۆڵی بینیوە، واتە  ئامۆزا بە پاڵپشتێکی گەورە دانراوە، لە هەندێک بارودۆخدا لە برا زیاتر بووە (بڕوانە (٣٦)).

(٣٦

باوک بێ برا ئامۆزا فرە. (شێخ محەمەدی خاڵ، ( ٢٠٠٧: ٧١))

نیشانە واتاییەکانی ئامۆزا بریتین لە (+ ، + کەسی پلە دوو).

مرۆڤ ، +/- نێر ، +/- پێگەیشتوو ، +کوڕ/کچی مام

بەڵام لە کۆمەڵی کوردیدا ئەم نیشانانەی زیادیان کردووە : (+ مرۆڤ ، +/- نێر ، +/- پێگەیشتوو ، +کوڕ/کچی مام، + کەسی پلە دوو + پشتیوانی)

لەزۆر باردا کچە مام بە ئامۆزا براوە و تا ئامۆزا ویستبێتی، کەس بۆی نەبووە خوازبێنی بکات. ئەم دیاردەیە لە ئەدەبی فۆلکلوردا ڕەنگیداوەتەوە (بڕوانە (٣٧)).

(٣٧

ئامۆزا تۆ باڵا بەرزی   ئامۆزا هەر بۆ خۆم فەرزی.

لە کۆمەڵی کوردیدا ئەگەرچی ئامۆزا پشت بووە، لە دوای برا ئامۆزا بە پشت و پەنا دانراوە، بەڵام لەو خێزان و بنەماڵانەدا کە خاوەن

دەسـەڵات بـوون، دەسـەڵاتەکەش لە بـاوانەوە بەجێمـاوە ئـامۆزا جـێگەی نیگەرانی و ترس بووە  بۆ ئامۆزای خاوەن دەسەڵات (بڕوانە (٣٨)).

٣٨)

دوژمنت هەیە، نەخێر ئامۆزام هەیە.

**سێیەم: پەیوەندیی نێوان باوک و کوڕ:**

بـاوک لە کـۆمەڵی کوردیـدا زۆر دڵـی بەکـوڕ خـۆش بـووە. ئەمەش پەیوەنـــدیی تەواوی بەگواســـتنەوە و نەســـڕینەوەی نـــاوی خێـــزان و بنەماڵەوە هەبـووە. واتە کـوڕ هەڵگـری نـاوی بـاوان بـووە نەک کـچ. هەر لەبەر ئەم هۆیانە زۆرجار ئەگەر پیاو کوڕی نەبووبێت، بە ئەوجاغکوێر ناوبراوە. لە کاتێکدا و لە بنەڕەتدا ئەوجاغکوێری بۆ کەسێک بەکاردێت، کە هـیچ منـداڵێکی نەبێـت. لەبەرئەوە بـاوک حەزی کـردووە کـوڕەکەی پێبگـات و ببێت بە شـت و تەنـانەت لە خۆشـی پیـاوتر دەرچێت (بـڕوانە (٣٩)).

٣٩)

باوک حەزناکـات براکەی لە خـۆی پیـاوتر بێت، بەڵام حەز دەکـات کوڕەکەی لە خۆی پیاوتر بێت.

نیشـانە واتاییيەکـانی /بـاوک/ لە فەرهەنگدا و لە دەرەوە پەنـدەکان بـریتییە لە: (+ مـرۆڤ ، + نێـر ، + پێگەیشـتوو، + باوکـایەتی (کەسـی پلە یەک))، بەڵام ئەو واتایانە کە پەندەکان بە وشەی /باوک/ یان بەخشـیوە، نیشـانە واتاییيەکـانی بـریتیین لە: (+ مـرۆڤ ، + نێـر ، + پێگەیشـتوو ، + باوکایەتی (کەسی پلە یەک) +ڕەنجدەری ، + دڵسـۆزی ، + خەمخـۆری ، + ڕاستگۆیی ...هتد).

**چوارەم: پەیوەندیی نێوان دایک و کچ:**

بەشـێوەیەکی گشـتی دایـک میهرەبـان و بەسـۆز و دڵسـۆز بـۆ منـــداڵەکانی ناســـراوە. لە زۆریـــنەی حاڵەتەکانـــدا دایـــک پشـــتگیری

سەرســەختی منـداڵەکانییەتی و بەهـانە بـۆ سـەرجەم کـارە بەجـێ و نابەجێکانیان دەهێنێتەوە. منداڵیش بە ئەندازەیەک دایکی خۆشدەوێت و لەبەرچاوی ناکەوێت یان کەمتر لەبەرچاوی دەکەوێت (بڕوانە (٤٠)).

٤٠)

أ- بەسەر زاری منداڵەوە وتراوە: دایک ورچە بۆنی خۆشە.

ب- دایک لای ئەولاد قەت کۆن نابێت. (شێخ محەمەدی خاڵ، (٢٠٠٧:١٨٦).

بەرپرسیاریەتی فێرکردنی کاروباری ماڵ و ژیان و پەروەردەکرنی کـچ، لەم کـۆمەڵە ڕۆژهەڵاتیـانەدا تـاڕادەیەکی زۆر لە ئەسـتۆی دایکـدا بــووە. بــاوک خەریکــی کــارو پەیــداکردنی بژێــوی بــووە، کەمتــر کەوتــووەتەوە مــاڵ و ئاگــاداری بــارودۆخی نــاوخۆیی خێـزان بـووە. هەرلەبەر ئەم هۆیانە پەروەردەی کچ بە دایک سپێردراوە. پاراستنی کچ کارێکی قورس و بەرپرسیاریەتییەکی گەورە بووە، چونکە کچ هەڵگری پەردەی شەرەف بووە، کە بە پەردەی کچێنی ناوبراوە. ئەم پاراستن و بەرپرسیاریەتییەش بە دایک سپێردراوە. تەنانەت لەبەر گرنگیی پێگە و ڕۆڵـی دایـک، بـڕوا بەوە هەبووە کە منداڵ بە دایک مـردن و بـێ دایکی هەتیو دەکەوێت، نەک بە باوک مردن(بڕوانە (٤١)).

٤١)

منداڵ بە دایک مردن زیاتر هەتیو دەکەوێت وەک لە باوک مردن.

مــادام دایـک پەروەردەکـاری کـچ بـووە، ئەگەر دایـکەکە جۆرێـک نەنگــی و ڕەوشــتی خراپــی (بەد ڕەوشــتی، نەزانگــۆیی، دەســتوپێ ســپی...هتد) هەبوووبێــت، ئەوا کــچ بــاجەکەی داوە و بە پێچەوانەشــەوە (بڕوانە (٤٢)).

٤٢)

أ- دایە ببینە، دویتە بخوازە. (شێخ محەمەدی خاڵ، ( ٢٠٠٧: ١٨٥)).

ب- دایک مەدحی کچ بکات، مەگەر خاڵوان بیخوازێ. (شێخ محەمەدی خاڵ، ( ٢٠٠٧: ١٨٦)).

لە (٤٢-ا) ئەوە دەردەکەوێت کە دایکی باش و ڕەوشت بەرز، کچی وەک خۆیی پەروەردە دەکات. لە (٤٢-ب) ئەوە نیشاندراوە کە دایک چونکە بەرپرسە لە پەروەردەی کچەکەی و ئاوێنەی خۆیەتی قەت بە خراپ و نەشیاو باسی ناکات. کە کەوتە باسیشی ئەوەندە زیادە ڕۆیی دەکات مەگەر خاڵوانی بیخوازن.

نیشانە واتاییەکانی وشەی /دایک/ لە فەرهەنگدا و لە دەرەوە پەندەکان بریتییە لە: (+ مرۆڤ ، - نێر ، + پێگەیشتوو،+ کەسی پلە یەک)، بەڵام ئەو واتایانەی کە پەندەکانان بە وشەی /دایک/ یان بەخشیوە ، نیشانە واتاییەکانی بریتیین لە: (+ مرۆڤ ، - نێر ، + پێگەیشتوو،+ کەسی پلە یەک ، + بەخێوکەر ، + پەروەردەکار ، + دڵسۆزی ، + مەدحکەر، + خەمخۆری ، ڕاستگۆیی ...هتد).

**پێنجەم: پەیوەندیی نێوان زاوا و خەسوو و بووک و خەسوو:**

خەسوو، بووکی بە داگیرکەری کوڕەکەی زانیوە، بەڵام زاوای بە دەستکەوتی خۆی سەیرکردووە. کوڕ پێش هاوسەرگیری لە خێزاندا نازهەڵگیراو و خۆشەویست بووە. کچیش کارکەرو کەمتر نازی هەبووە. بەڵام دوای هاوسەرگیری خەسوو کچ و زاوای لەلا خۆشەویست بووە و پشتی لە کوڕ و بووک کردووە. ئەمەش لەو هەستەوە هاتووە کە ژن بە نیاز بووە، کوڕ دوای هاوسەرگیریش هەر بۆ دایک بژی و گرنگیی زیاتر بەو بدات، بە بەراورد لەگەڵ هاوسەرەکەیدا. لە نموونەی ژمارە (٢٣) دا تێڕوانینی کۆمەڵی کوردی بۆ زاوا خراوەتەڕوو، کە نیشانە واتاییەکانی بریتیین لە: (+ مرۆڤ ، + نێر، + پێگەیشتوو ، + مێردی کچ ، + ، + ئەتککەرو تەعداکەر ، + بێگانە ، - کەسی پلە یەک ، - خەمخۆری ، - ڕاستگۆیی ، ...هتد) ، بەڵام ئەم تێڕوانینە لەلای خەسوو پێچەوانە بووەتەوە و نیشانە واتاییەکانی /زاوا/ پەیوەست بە /خەسوو/ەوە بریتیین لە: (+ مرۆڤ ، + نێر ، +

پێگەیشـتوو ، + مێـردی کـچ ، کەسـی پـلە یەک، + خۆشەویسـتی، + دڵسـۆزی ، + خەمخـۆری ، + ڕاسـتگۆیی ، ...هتـد) . بە پـێچەوانەوە /خەسـوو/ لەگەڵ بووکـدا نەسـازو دژ بـووە. بـۆ ڕوونکـردنەوەی پەیوەندیی نێوان /خەسوو/ و /بووک/ (بڕوانە (٤٣)).

٤٣)

أ- بەزاری خەسـووەوە وتـراوە: بـووک نییەتـی شـیوی شـەوێ، ئەموستیلەی دەستی دەوێت. (شێخ محەمەدی خاڵ، (٢٠٠٧: ١٠٥)).

ب- بووکی پوور جێگای لەسەر تەنوور. (شێخ محەمەدی خاڵ، ( ٢٠٠٧: ١٠٦))

پ- بووکی نزیک باوان بە کەلکی چی دێت. (شێخ محەمەدی خاڵ، ( ٢٠٠٧: ١٠٦))

ت- کچم لەگەڵ تۆمە بووکێ گوێت لێبێت. (حەمید گەردی، (٢٠٠٦: ٣١١))

ج- خەسوو ئیمانی نییە ، بووکێ زمانی نییە. (حەمید گەردی، (٢٠٠٦: ١٥٩)

چ- کوڕمان گەورە کرد بە دزی و فزی، عالەم لۆ خۆی برد بە زەبری .... (حەمید گەردی، (٢٠٠٦: ١٥٩)

ح- خەسوو لە دوای بووکان جاسووسە. (حەمید گەردی، (٢٠٠٦: ١٥٩)

نموونەکانی (٤٣) ئاماژەن بۆ پەیوەندیی دژوارو پڕ کێشمەکێشی نێوان ماڵە کوڕ بە تایبەتی خەسوو لەگەڵ بووکدا دەکەن.  (٤٣- پ) بۆ بووکێک هێنراوەتەوە کە خەسووەکەی پووری بێت، دیارە کە جێگەی سەر تەنوورە، لەبری ئەوەی جێگەی ناو دڵ و سەر چاوان بێت. (٤٣- ت) بە بووکێ وتراوە کە زوو زوو بچێتەوە ماڵە باوانی، لە ئاوەزمەندی پەندەکەدا ئەوە دەردەکەوێت، کە ئەم جۆرە بووکە پەسەند نەبووە، چونکە خەسوو و خێزانی کوڕ وەک موڵکداریەتی و خاوەنداریەتی سەیری بووکیان کردووە. ئەو تێگەیشتنەی لە پەندەکانەوە بەدەست دەخرێت، یان تێڕوانین و ئاوەزمەندی مرۆڤی کورد پەیوەست بە بووک و خەسوو بەم شێوەیەیە:

١- ماڵی باوانی بووک و خودی بووک چارەی خەسوویان لە زۆربەی بارودۆخ و حاڵەتەکاندا نەویستووە.

٢- خەسوو و دش، بووکیان بە بێگانە سەیرکردووە. زۆرکات سەنگەری کێشمەکێش لە یەکەم ڕۆژی بووکێنییەوە دەستی پێکردووە.

٣- پەیوەندیی خەزوور لەگەڵ بووکدا باش یان خراپ نەبووە، چونکە کەمتر خەزوور چووەتە ئەو ململانێیەوە. ئەگەر ڕۆشتبێتیش بە فیتی خەسوو و دش بووە.

نیشانە واتاییەکانی /بووک/ لە فەرهەنگدا و لە دەرەوە پەندەکان بریتیین لە: (+ مرۆڤ ، - نێر ، + پێگەیشتوو، - کەسی پلە یەک، + ژنی کوڕ ) ، بەڵام ئەو واتایەی کە پەندەکە بە وشەی /بووکی/ بەخشیوە زۆر جیاوازن، دنیایەک لە دوژمنکاری و وێرانکاری تیدا دەخوێنرێتەوە بەرانبەر بە خەسوو، نیشانە واتاییەکانی بریتیین لە: (+ مرۆڤ ، - نێر ، + پێگەیشتوو ، + داگیرکەری کوڕ ،- کەسی پلە یەک، + ماڵوێرانکەر ، - دڵسۆزی ، - خەمخۆری ، - ڕاستگۆیی ، ...هتد) . پەیوەست بە /خەزوور/ ەوە، ئەم نیشانانە دەگۆڕێن، چونکە پەیوەندیی نێوان /خەزوور/ و /بووک/ پەیوەندییەکی دۆستانە و باش بووە. بۆیە لە بەرانبەر /خەزوور/دا نیشانە واتاییەکانی /بووک/ بریتیین لە: (+ مرۆڤ، - نێر ، + پێگەیشتوو ، + ژنی کوڕ،- کەسی پلە یەک ، + ماڵداریکەر، + دڵسۆزی ، ...هتد). بە نیشانە واتاییەکاندا دەردەکەوێت کە بووک چەند دڵسۆز بووبێت، نەبووەتە کەسی پلە یەکی خێزان. نەک هەر ئەوە بگرە بەلای مرۆڤی کوردەوە، ئەوەندەی (دایک و خوشک) شەرەف بوون، ئەوەندە (ژن) شەرەف نەبووە. گوتوویانە پەیوەندیی نێوان (ژن و پیاو) سێ وشە.

نیشانە واتاییەکانی /خەسوو/ لە فەرهەنگدا و لە دەرەوە پەندەکان بریتییە لە: (+ مرۆڤ ، - نێر ، + پێگەیشتوو ،- کەسی پلە یەک + دایکی کوڕ)، بەڵام ئەو واتایەی کە پەندەکە بە وشەی /خەسووی/ بەخشیوە، زۆر جیاوازن دنیایەک لە دوژمنکاری و وێرانکاری تێدا دەخوێنرێتەوە بەرانبەر بە بووک، نیشانە واتاییەکانی بریتیین لە: (+ مرۆڤ ، - نێر ، + پێگەیشتوو ،- کەسی پلە یەک، + دایکی کوڕ ، + بێ ئیمان، + قسە سوێر، - دڵسۆزی ، - خەمخۆری ، - ڕاستگۆیی ، ...هتد).

**شەشەم: پەیوەندیی نێوان خاڵ و خوشکەزا و مام و برازا:**

پەیوەندیی نێوان خاڵ و خوشکەزا پەیوەندییەکی تاڕادەیەک باش و بێ کێشە بووە. خاڵ خوشکەزای خۆشویستوە و هەمان کاردانەوەش لەلایەن خوشکەزاوە هەبووە. لە بنەڕەتدا پەیوەندیی نێوان خاڵ و خوشکەزا پەیوەندییەکی ئاسایی بێ گرفت بووە. ئەگەر خوشکەزایەک گێچەڵی بە خاڵی کردبێت بە حیز زانراوە، بۆیە کورد وتوویەتی: (بڕوانە (٤٢ – ب ، ٤٤))

٤٤)

حیز بە خاڵوی خۆی فێرە. (شێخ محەمەدی خاڵ، ( ٢٠٠٧: ١٦٢)).

مەبەست لەوەیە بەکەس ناوێرێت بە خاڵی خۆی نەبێت. لە کاتێکدا لە کۆمەڵی کوردیدا و لە ئاوەزمەندیی مرۆڤی کوردا، کەسێک چەند بەهێز بێت و بەرانبەرەکەشی چەند مافی خواردبێت، نەنگییە یان نامەردییە دەست ببرێت بۆ خاڵ و مام و باوک و دایک و پوور و...هتد.

نیشانە واتاییەکانی /خاڵ/ لە فەرهەنگدا و لە دەرەوە پەندەکان بریتییە لە: (+ مرۆڤ ، + نێر ، + پێگەیشتوو،– کەسی پلە یەک)، بەڵام ئەو واتایەی کە پەندەکان بە وشەی /خاڵ/ داوە، نیشانە واتاییەکانی بریتیین لە: (+ مرۆڤ ، + نێر ، + پێگەیشتوو ،– کەسی پلە یەک، + دڵسۆزی خوشکەزا).

پەیوەندیی نێوان مام و برازا پەیوەندییەکی ئاسایی و بێ گرفت بووە، ئەم لێکۆڵینەوەیە پەندێکی وای دەست نەکەوت بۆ ئەم جۆرە پەیوەندییە. لەبەر ئەوەی لێکۆڵەر بە ڕەگەز کوردە و لە کۆمەڵی کوردیشدا ژیاوە، هەر بەسەلیقە دەتوانێت ئەو پەیوەندییە لێکبداتەوە.

نیشانە واتاییەکانی /مام/ لە فەرهەنگدا و لە دەرەوە پەندەکان بریتییە لە: (+ مرۆڤ ، + نێر ، +/– پێگەیشتوو،+/– کەسی پلە یەک)، بەڵام ئەو واتایەی کە پەندەکان بە وشەی / مامیان/ بەخشیوە، نیشانە واتاییەکانی بریتیین لە: (+ مرۆڤ ، + نێر ، +/– پێگەیشتوو ، +/– کەسی پلە یەک ،+ پشت و پەنا ، + دڵسۆزی برازا).

پەیوەندیی پلەیەکی (مام) زۆرجار بەپەیوەندیی نێوان دووبرا یان براو براژنەوە (دایکی کوڕ/کچ) بەستراوە.

**حەوتەم : پەیوەندیی نێوان هێوەرژن:**

پەیوەندییەکی پڕ کێبەرکێ و کێشمەکێش بووە، هەمیشە چاودێری یەکیان کردووە. بە دەگمەن هێوەر ژنێک خۆشبەختی بۆ هێوەرژنەکەی خواستووە، تەنانەت ئەگەر کچی هێوەرژنەکەی بووبێت بە بووکی حەزی لە چارەی نەبووە. ژن لەم کۆمەڵی کوردەوارییەدا زیاتر حەزی لەوە بووە برازای خۆی یان خوشکەزای خۆی ببێتە بووکی، بەڵام بە هەڵهێنجانی بیرکردنەوە و ئاوەزمەندیی کورد، ئەوە دەردەکەوێت کە کچە مام بۆ کوڕ بژاردەی یەکەم بووە و بۆ کچیش هەر بەهەمان جۆر (بڕوانە (٣٧)).

زۆرجار پەیوەندیی دژوارو ناهەمواری نێوان هێوەرژنەکان، کەلێن و بۆشایی و تەنانەت نیگەرانیشی لە نێوان براکاندا دروستکردووە. واتە ئەم پەیوەندییە خراپە لەلای براکانیش ڕەنگیداوەتەوە. بۆ پەیوەندیی خراپی نێوان هێوەرژن (بڕوانە (٢٦)).

نیشانە واتاییەکانی وشەی /هێوەرژن / لە فەرهەنگدا و لە دەرەوە پەندەکان بریتییە لە: (+ مرۆڤ ، – نێر ، + پێگەیشتوو)، بەڵام ئەو واتایەی کە پەندەکان بە وشەی /هێوەر ژنی/ دەبەخشن، نیشانە واتاییەکانی بریتیین لە: (+ مرۆڤ ، – نێر ، + پێگەیشتوو ، + پیلان داڕێژەر (بەرانبەر بە هێوەرژنەکەی)، – دڵسۆزی ، – خەمخۆری... هتد).

**هەشتەم: پەیوەندیی نێوان بووک و دش:**

وەک لە سەرەتای لێکۆڵینەوەکەدا باس کرا، پەندەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن، کە پەیوەندیی نێوان بووک و دشیش هیچی کەمتر نەبووە، لە پەیوەندیی نێوان دوو هێوەرژن. دش بەوێنەی خەسوو، بووکی بەداگیرکەری براکەی زانیوە. پێیوابووە برا هەر پشکی ئەوانە و کەمتر مافی بووکی پێوەیە. بووکیش خۆی بە تاکە خاوەنی مێرد زانیوە. لێرەوە کێشەکان ئاڵوزبوون و پچڕاندنی پشک و بەش و دەستکەوتی

نابەرجەستەیی وەک (خۆشەویستی، رق، ئیرەیی، ...هتد) بە پەیوەندییەکانەوە بینراوە. بۆ پەیوەندیی خراپی نێوان بووک و دش (بڕوانە (٢٧،٤٥)).

٤٥)

دشی دشێ، بە چی ئەچێ. (شێخ محەمەدی خاڵ، ( ٢٠٠٧: ٢٠٤))

ئاوەزمەندی پەندی ژمارە (٤٥) ئەوە دەردەخات، کە دش خۆی هیچ سوود و قازانجێکی نییە. ئینجا وەرە دشیی دش بێت، ئەبێت خزمایەتی و دڵسۆزی و خۆشەویستییەکەی لە کوێدا بێت؟ مەبەستی لەوەیە خزمێکی دوورە هەر بەخزم ئەژمار ناکرێت.

نیشانە واتاییەکانی وشەی /دش / لە فەرهەنگدا و لە دەرەوە پەندەکان بریتییە لە: (+ مرۆڤ ، – نێر ، +/–پێگەیشتوو، – کەسی پلە یەک)، بەڵام ئەو واتایەی کە پەندەکان بە وشەی /دشی/ دەبەخشن، نیشانە واتاییەکانی بریتیین لە: (+ مرۆڤ ، – نێر ، +/– پێگەیشتوو ،– کەسی پلە یەک، + پیلان داڕێژەر (بەرانبەر بە بووک)، – دڵسۆزی ، – خەمخۆری... هتد).

**ئەنجام**

١- لە پەندەکانەوە دەردەکەوێت، کۆمەڵی کوردی، کۆمەڵێکی کارکەری کشتوکاڵی بێ فەوزای سێکسی بووە.

٢- دەربڕینی پەندەکان و دووبارەکردنەوە و پتەوییان، ئاماژەی باوەڕبوونە پێیان. گوزارشتێکی ڕوون و ئاشکرای پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵی کوردییە.

٣- کۆمەڵی کوردی بە تۆڕێکی توندی پەیوەندیی کۆمەڵایەتی بەستراون بەیەکەوە. ئاریشە و گرفت لەم پەیوەندییانەدا لە نێوان بوون و نەبووندایە. واتە لە هەندێک پەیوەندیدا هەیە و لە هەندێکی دیکەدا بوونی نییە. پەیوەندییەکان لە پەیوەندیی ئاساییەوە وەک پەیوەندیی نێوان (باپیرو کوڕەزا یان کچەزا) بوونیان هەیە، تا دەگاتە پەیوەندیی پڕ کێشمەکێشی نێوان (بووک و خەسوو) یان (بووک و دش).

٤- وشەکان لە فەرهەنگ و مێشکی قسەکەردا واتایەکیان هەیە. یان خاوەنی کۆمەڵێک نیشانەی واتایین. واتای وشەکان لەناو پەندەکاندا گۆڕانیان بەسەردا دێت یان بە واتایەکی دی نیشانە واتاییانە یان زیاد و کەم دەکەن.

## سەرچاوەکان:

**یەکەم / سەرچاوەکان بەزمانی کوردی:**

**ا/ کتێب:**

١- ئەنتۆنی گیدنز، و. حەسەن ئەحمەد مستەفا، کۆمەڵناسی ، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٩.

٢- برۆس کۆهێن، و. چەکۆ ئەحمەدی، بنەماکانی کۆمەڵناسی ، چاپخانەی ڕۆژهەلات، هەولێر، ٢٠١٤.

٣- حەمید گەردی، پەندی کوردی لە باخچەی گەردی – پەندی پێشینان، چاپی یەکەم، بەڕێوەبەرایەتی چاپخانەی ڕۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠٦.

٤- دارا حەمید محەمەد، واتاسازی هەندێ لایەن لە سیمانتیک و پراگماتیکی کوردی، چاپەمەنی ژیر، ٢٠١٠.

٥- شـاخەوان جەلال فەرەج، تـابۆ وەک نمـوونەیەکی پەیوەنـدیی نێـوان زمـان و کلتوور، چاپخانەی بینایی، سلێمانی ، ٢٠١٣.
٦- شـیلان عـومەر حسـەین، ئیـدیۆم چەشـن و پێکهـاتنی لە زمـانی کوردیـدا، چـاپی یەکەم، چاپخانەی ڕەنج، سلێمانی، ٢٠٠٩.
٧- شێخ محەمەدی خاڵ، پەندی پێشینان، چاپخانەی شڤان ، ٢٠٠٧.
٨- عبدالواحیـد مشـیر دزەیـی، واتاسـازی چەنـد لێکـۆڵینەوەیەکی سـیمانتیکی و پراگماتیکییە، چاپخانەی خانی، هەولێر، ٢٠٠٩.
٩-............، واتاسازی وشە و ڕستە، چاپخانەی ڕۆژهەلات، هەولێر، ٢٠١٠.
١٠- کلـۆد جێرمـان و ڕیمـۆ لـۆبلان، واتاسـازی، چـاپی یەکەم، وەرگێڕانـی لە عەرەبییەوە: یوسف شـەریف سـەعید، چاپخـانەی وەزارەتـی پەروەردە، هەولێر، (٢٠٠٦(ساڵی وەرگێڕان))..
١١- د. مەجـدەدین عـومەر خەیـری خەمـش، و. د. عبـدالله خورشـید و چەنـد وەرگێڕێکی تر، کۆمەڵناسی ، چاپخانەی ڕۆژهەلات، هەولێر، ٢٠١٢.
١٢- محەمەدی مەحویی، زانستی هێما هێما، واتا و واتا لێکدانەوە، بەرگی یەکەم –ا– و دووهەم –ب – ، چاپخانەی پەیوەند، زانکۆی سلێمانی، سلێمانی، ٢٠٠٩.
١٣- محمد معروف فتاح، زمانەوانی، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١١.
١٤- نەوشیروان مستەفا ئەمین، بەدەم ڕێگاوە گوڵچنین چەند بـابەتێکی کۆمەڵناسـی، کتێبی یەکەم، بەرگی دووەم، الدار العربیة – ناشرون، ٢٠١٥.
١٥- یوسف شەریف سەعید، زمانەوانی ، چاپخانەی ڕۆژهەلات، هەولێر، ٢٠١١.
١٦-کورش سەفەوی، و. دلێر سـادق کـانەبی، چەنـد لایەنێکـی واتاسـازی، چاپخـانەی وەزارەتی پەروەردە، چاپی یەکەم، هەولێر،٢٠٠٦.

**ب/ نامەی بڵاونەکراوە:**

١- توانـا فریـدون حسـین، هاوبەنـدی کـۆمەڵایەتی لە خێزانـی کوردیـدا، زانکـۆی سلێمانی، کۆلێژی زانستی مرۆڤایەتی، نامەی ماستەر، ٢٠٠٨.
٢- تەلار ئەحمەد مستەفا، دەسەڵاتی بڕیاردان لە خێزانی کوردیدا، زانکۆی سـلێمانی، کۆلێژی زانستی مرۆڤایەتی، نامەی ماستەر، ٢٠٠٩.
٣- فەرهاد تۆفیق حەسەن، پەیوەندییە سیمانتیکییەکان و هەنـدێک ، دیاردەی واتـایی لە زمانی کوردیدا، زانکۆی سلێمانی، کۆلێژی زمان، نامەی ماستەر، ٢٠١٠.
لە زمانی کوردیدا، نامەی دکتۆرا، زانکۆی سلێمانی(GB) ٤- سەباح ڕەشـید قـادر، هەندێ لایەنی ڕێزمانی دەسەلات و بەستنەوە کۆلێژی زمان، ٢٠٠٧

٤- هۆگر مەحموود فەرەج، بوارە واتاییەکان لێکۆڵینەوەیەکی واتاسازی بەراوردە، نامەی ماستەر، زانکۆی سەلاحەدین، کۆلێژی ئاداب، ١٩٩٣.

٥- یوسف شەریف سەعید، دۆخەکانی ژێرەوە لای فیلمۆر و هەندێ لایەنی ڕستەسازی کوردی، نامەی ماستەر، زانکۆی سەلاحەدین، کۆلێژی ئاداب، ١٩٩٠.

**دووەم: سەرچاوەکان بە زمانی عەرەبی:**

١- احمد مختار عمر، علم الدلالة ، مكتبة دار الغربة للنشر والتوزيع، ١٩٨٢.

٢- محمد حسن عبدالعزيز، مدخل الى علم اللغة، دار النمر للطباعة والنشر، القاهرة، ١٩٨٣.

٣- مجيد الماشطة ـ من علم المعاني الى علم الدلالة ، مركز الانماء الحضاري ، دمشق ، ٢٠٠٩.

**سێیەم: سەرچاوەکان بە زمانی ئینگلیزی:**

1- Crystal D. (2003), The Cambridge Encyclopedia of the English Language, Second edition. Cambridge University press.

2-katamba,F,& stonham,J.morphology.plagrave macmillan.2006.

3.Finch G. (2005), KEY Concepts IN Language and Linguistics, PAL Grave MACMILAN Press, Second edition.

4. Finch G. (2005), KEY Concepts IN Language and Linguistics, PAL Grave MACMILAN Press, Second edition.

5. John Lyons . 2002 , Language and Linguistics, Cambridge University press .

6. Hamid, Twana Saadi. (2007), INVESTIGATING KURD EFL LEARNERS ABILITY TO RECOGNIZE AND PRODUCE ENGLISH COLLOCATION, Basic Education College Universty Of Sulamani.

**سەرچاوەکان بە زمانی ئەڵمانی:**

1. Trubezkoy,N,S:Grundzuge der phonologie,cercle linguistique de prague, 1939.

## ملخص البحث

**ا.م.د. بيستون حسن احمد**
قسم اللغة الكردية–كلية التربية الاساس
جامعة السليمانية

**د. توانا سعدي حامد**
قسم اللغة الانكليزية – كلية اللغات
جامعة السليمانية

تقوم الدراسة المعنونة " دراسة في أواصر القرابة في المجتمع الكوردي: تحليل الفاظ الامثال انموذجاً" باستخدام المنهج الوصفي التحليلي في التعامل مع البيانات التي جُمعت من مصادر مكتوبة أو شفاهةً من محادثات يومية.

تتألف الدراسة من مباحث ثلاث، يتناول الاول منها مستويات اللغة ومن ضمنها علم الدلالة. يأتي هذا الجزء النظري في إطار علم اللغة. وقد تم التطرق الى الضروري من هذا الجزء في هذا المبحث بشكل اكثر تفصيلاً في المبحث الثالث.

أما المبحث الثاني فيدرس مفهوم "العائلة" في المجتمع الكوردي، بالاضافة الى الروابط الاسرية والقرابة. ونظراً للطبيعة الاجتماعية البحتة للموضوع لم يجد الباحث مناصاً من استشارة بعض المتخصصين في علم الاجتماع للحصول على اجابات اكثر رصانة بخصوص بعض المسائل المتعلقة.

وأمّا المبحث الثالث والاخير، فقد قام الباحث فيه بتصنيف طبيعة العلاقات المشار اليها وذلك بعد استيعاب الامثال المتضمنة للالفاظ ذات العلاقة من خلال تحليل خصائصها الدلالية وانواعها. وقد وجد بأن بعض العلاقات تمثّل المنافسة والتحدي، بينما يعبر بعضها الآخر عن اللّيونة والرّقة.

## Abstact

This study, entitled “Investigating Kinship in Kurdish Society: Proverbs Lexical Analysis as an Example”, utilizes analytical description approach to deal with the data collected from written references or simply from daily spoken communications.

The present research is composed of three sections. Section one is of two subsections. The first deals with the linguistic levels including semantics. This theoretical part is located within the scope of linguistics. The necessary related theories are touched upon here and are covered in detail in Section Three.

Section Two deals with the concept of family in the Kurdish society. It also investigates family relationships and kinship. Owing to the sociological nature of this section, it has been necessary to consult some sociologists for better scientific information.

Section Three, having understood the proverbs and analyzed them via their semantic features and the types of their meanings, the nature of their relationships are categorized. Some of the relationships represent competition and challenge whereas some others express softness and gentleness.

# پەیمانپەرستی و پەیمانشکێنی لە دو چیرۆکی بەیەک ناونیشان، (پاشازادە و بۆق)، لای بەرتەنگ و کورد

## (لە تەرازوی بەراوردکاریدا)

پ. د. فاروق عومەر سدیق
ئەندامی کارای ئەکادیمیای کوردی - هەولێر

**پێشوتە:**

ئەو چیرۆکە بێ خاوەنانەی کە لە دێرزەمانەوە لە هۆش و بیری ئەندامانی کۆمەڵدا، پارێزراون و لە باوک و باپیرانەوە بە یادگاری پێمان گەیشتون، پێیان دەوترێت: چیرۆکی فۆلکلۆری.

ئەم چیرۆکانە، پێش پەیدابونی نوسین، لەبەرئەوەی لە سنگدا، هەڵگیرابون، تا سەردەمی نوسینەوەیان لە هەمو ڕویەکەوە گۆڕانیان بەسەردا، هاتوە. بۆ نمونە: زەمان و شوێنی ڕوداوەکان و ئەکتەرو پاڵەوانان و ئەبزارەکان[1] (وەسیلە)ی بەکارهێنراو بۆ گەیشتن بە ئەنجام، زیاتر گۆڕانیان بەسەردا، هاتوە، بەڵام بیری سەرەکی و ناواخن و ناوەڕۆکی چیرۆکەکان، کەمتر دەستکاری کراون.

مرۆڤ، هەمیشە تێکۆشاوە، سود لە تاقیکردنەوەکانی جارانی پێش خۆی کە بەسەر خەڵکیدا، هاتون لە نمونەی جۆر و چەشنی بیر و بیرکردنەوەیان لە دنیا و دەوروبەر و بەرگەگرتنی کارەسات و ڕوداوە سروشتییەکان و ناسروشتییەکان و چۆنێتیی خۆڕاگرتن و بەرەنگاربونەوە و خۆقوتارکردن لێیان و دۆزینەوە و درک کردن بە ئەبزار (وەسیلە)ی گونجاو و بەکارهێنانی بۆ گەیشتن بەو ئامانجەی کە مەبەستی بوبێت، ببینێت.

لایەنە پەسەند و سودبەخش و چاکەکانی ئەو ئەزمون و تاقیکردنەوانەی بۆ خزمەتی خێزان و خزم و خوێش و قەوم و قیلەی خۆی قۆستونەتەوە و هەوڵیشی داوە پەند و عیبرەتیش لە لایەنە خراپەکانیشی وەربگرێت. جا بۆ پاراستن و چەسپاندنی بیروبۆچونەکانی لای نەوەی سەردەمی خۆی و دواتریش، خستونیەتە قالبی چیرۆکەوە. لەڕاستیدا، حیکمەت لە خستنە قالبی ڕوداو و کارەسات بۆ چوارچێوەی چیرۆک لەوەدا بوە کە مرۆڤ هان بدرێت ڕوبکاتە چاکە و پشت بکاتە خراپە و شوێن خێر بکەوێت و دور بکەوێتەوە لە شەڕ.

ئادەمیزاد، هەر لە کۆنەوە هەستی بە بونی ئەو چەمکانە لە مێشکیدا، کردوە و بە جۆرەها وشە و ئیدیۆم و پەندی لەم بابەتانە، دەربڕیوە:

نمونە بۆ چەمکی: (چاکە)، یا (خێر): ئاشتی، ڕاستی، سەر ڕاستی، ڕاستگۆیی، خۆشەویستی، جوامێری، مەردایەتی، وەفا، ئازایەتی، دەسپاکی، دۆستایەتی، بەزەیی، بەخشندەیی، ئاوەدانکردنەوە، ژنهێنان، چاوتێری، دڵپاکی، گورج و گۆڵی، پەیمانپارێزی، سەبر و تەحەمول، خۆڕاگری، دڵسۆزی، تەبیعەت ئازایی، بنیاتنان، چاکە بکە و بیدە بەدەم ئاوا، نازانێت درۆ چیە، سەری پێ بسپێرە، ساحێبی قسەی خۆیەتی، قسەی خۆی نادۆڕێنێت، قسەی نەخشی بەردە، قسەی ڕاست بەردە، ڕاستگۆ بە، درۆ بەردە و ...... هی تریش.

**نمونە بۆ چەمکی (خراپە)، یا (شەڕ):**

شەڕو شۆڕ، جەنگ، ئاژاوە، ئاژاوەنانەوە، درۆ، درۆزنی، ناپیاوی، دزی، فێڵ و فێڵبازی، خیانەت، سپڵەیی، دوژمنایەتی، بێڕەحمی، ڕق و کینە، ڕقەبەرایەتی، ترسنۆکی، ڕیوەڵەیی، تەمەڵوتەوەزەلی، پیسکەیی، تەرازوبازی، چاوچنۆکی، دڵپیسی، تەڵاقدان، ورەبەردان، حەسودی، خۆدزینەوە، پەیمانشکێنی، ڕاست لە مەزەبیدا نیە، درۆزن دوژمنی

خوایە، درۆ ئیشێتی، هەر دەمە قسەیەک دەکات، پشتی پێ نابەسترێت، کل لە چاو ئەفڕێنێت، دنیا بە درۆ و قیامەت بە ڕاست ......... هی تریش.

لە زەمانی کۆنەوە بۆ بەرەنگاربونەوەی کارەساتی وێرانکەر و خۆگونجاندنی لەگەڵ سروشتدا، ڕێگای کۆچ و کۆچەراتی، جا بە خواست بوبێت، یا بەناچاری و زۆرەملێی بوبێت، گرتویەتەبەر.

مرۆڤ لە هەر شوێنێکدا، ژیابێت و چوبێتە هەر جێیەکی تریش لەگەڵ خۆیدا ئەو داب و نەریت و کلتورەی پێشتر پێی گۆشکرابو گواستوەتەوە بۆ ئەو جێ نوێیەی کە تێی کەوتبو. لە ئەنجامدا، هەردو کلتورەکە لە یەکیانداوە و گیرۆدەی هەردوکیان بوە و نەیتوانیوە دەستبەرداری کلتوری شوێنە کۆنەکەی بوبێت، واتە بوە بە خاوەنی کلتورێکی لەیەکدراوی نوێ کە جێگای کۆن و تازەی تیادا، بوبوەوە.

لێرەوە، دەگەینە ئەو ڕاستییەی کە ئادەمیزاد، بە چ، کلتورێک گۆشکرابێت لەگەڵ خۆیدا دەیگوێزێتەوە بۆ ژینگە نوێکەی تا لە ئەنجامدا بوە بە خاوەنی کلتورێکی تێکەڵاو و ئاوێتە.

گرنگیی ئەم باس و لێکۆڵینەوەیە، لەم خاڵانەدایە:

١- بونی چیرۆکی فۆلکلۆریی: (شازادە و بۆق) بە دو تێکستی جیاواز لای کورد و بەرتەنگ[٢] کە سەدەها کیلۆمەتر، ئێستا دور لەیەکتری، دەژین، نابێت حیسابی ڕێکەوتی بۆ بکرێت.

٢- نوسینەوەی تێکستە کوردییەکە و ڕزگارکردنێتی لە فەوتان[٣].

٣- گەشەپێکردن و دەوڵەمەندکردنی ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی بە لێکۆڵینەوەی بەراوردی لەم دو چیرۆکە کە لە چاو ئەدەبی نوسراودا، کەمتر لای لێکراوەتەوە.

٤- ئاشناکردنی کورد بە میللەتی (بەرتەنگ) و زمانەکەی کە زمانێکی ئێرانیی نوێیە و هاوگروپی کوردییە.

٥- سەرنج ڕاکێشانی کورد بۆ هەندێ بیروباوەڕ و بیر و بۆچون کە لە جاراندا، بزوێنەری هەڵسوکەوت و هەوێنی پەیوەندییە

کۆمەڵایەتییەکانی باووباپیرانی بون و ئێستاش، بەرەگ داکوتاوی لە عەقڵ و هۆش و بیری ئەم نەوانەشدا، سور دەخۆن.

ئەم باسە، جگە لە پێشوتە کە هەردو تێکستە فۆلکلۆرییەکەشی تیادا، ناواخن، کراوە لە (٢) بەش و ئەنجام، پێکهاتوە.

**یەکەم بەش:** بۆ ئەو سەرنجگە[٤] هەستیارو گرنگانە، تەرخانکراوە کە پێویستە لەسەریان بوەستین.

**دوەم بەش:** بۆ دیاریکردن و دەستنیشانکردنی سروشت و جەوهەری لایەنە نزیک و دورەکانی نێوان هەردو چیرۆکەکە و بەراوردکردنیان لە تای تەرازودا، دانراوە.

**چیرۆکی (پاشازادە و بۆق)**
**لە ئەدەبی فۆلکلۆری بەرتەنگیدا**[٥]

هەبو نەبو، پاشایەک بو، ئەم پاشایە سێ کوڕی هەبو. ڕۆژێکیان، کوڕەکانی لە نێوان خۆیاندا، ڕێککەوتن کە ژن بێنن. بۆ ئەم مەبەستە، هەستان، چونە لای پاشای باوکیان و پێیان وت:

- بابە..... وەک دەزانیت ئێمە ئێستا گەورەبوین و وەختی ژنمانە.

پاشایش، بێڕاوەستان، یەکسەر، دەڵێت :

- زۆرچاکە، منیش، ژنتان بۆ دێنم، هەستن، هەموتان تیروکەوان لەگەڵ خۆتاندا، بەرن و بچنە سەربان، لەوێوە یەکی تیرێک، بهاوێژن، تیری هەریەکێکتان، بکەوێتە چ ماڵێکەوە، کچی ئەو ماڵەی بۆ دەخوازم .

کوڕانی پاشا بە قسەی باوکیان کرد و دەستیان، دایە تیروکەوانی خۆیان و چونە سەربان.

یەکەم جار کوڕی گەورە تیری خۆی هاویشت، تیرەکەی ڕۆیی کەوتە پەنجەرەی ماڵە وەزیرەوە.

دوای ئەوە کوڕە ناوەنجی تیری خۆی هاویشت، تیرەکەی ئەم ڕۆیی و کەوتە پەنجەرەی تیجارباشیی شارەوە.

ئەنجا سەرەی کوڕی بچوکی پاشا دێت. ئەمیش، وەک براکانی تری تیری خۆی دەهاوێژێت. تیرەکەی ئەم دەڕوات دەڕوات دەکەوێتە زەلکاوێکەوە. کوڕە بچوک، بەمە زۆر سەرسام دەبێت، تیرێکی تر، دەهاوێژێت. ئەم جارەش، هەر دەکەوێتە زەلکاوەکە. کوڕە بچوک بۆئەوەی بەتەواوی دڵنیابێت کە ئەمە ڕاستە، درۆیە، هەستا بۆ سێیەم جار، تیرێکی تری دەهاوێژێت. ئەم جارەش، تیر دەڕوات، دەڕوات و هەمدیسان کەوتەوە زەلکاوەکە.

کوڕانی پاشا، لەسەربان دێنە خوارەوە.

کوڕە گەورە بە باوکی وت :

- بابە..... تیرەکەی من کەوتۆتە پەنجەرەی ماڵی وەزیرەوە.

باوکی دەڵێت:

- زۆر چاکە، کەواتە من کچە گەورەی وەزیرت بۆ دەهێنم .

پاشا بەشوێن وەزیردا دەنێرێت و داوای کچەکەی بۆ کوڕە گەورەکەی لێ دەکات. وەزیریش ڕازی دەبێت و بەم شێوەیە شاییەکی گەورەیان گێڕا و ژنیان بۆ کوڕە گەورەی پاشا هێنا.

کوڕە گەورە ژنەکەی خۆی زۆر خۆش دەویست، ژیانێکی بەختیارو کامەرانیان پێکەوە بەسەردەبرد.

دوای چەند ڕۆژێک کوڕە ناونجێکەش، هاتە لای باوکی و پێی وت :

- بابە..... تیرەکەی من کەوتۆتە ماڵی تیجارباشیی شارەوە. چوم سەیری کچەکانیم کردوە، کچە ناوەنجێکەیانم، زۆر بەدڵدا چوە .

پاشا دەنێرێت بەشوێن تیجارباشیدا و کچە ناونجێکەی بۆ کوڕە ناوەنجێکەی خۆی لێ داوادەکات. تیجارباشی بەپاشا دەڵێت :

- کچەکەی من، ئەگەر بەدڵی کوڕە ناوەنجێکەی ئێوەیە، ئەوا هەر لە ئێستاوە پیرۆزی بێت .

بەم چەشنە، شاییان بۆ کوڕە ناوەنجێکەش گێڕا. ئەمیش، هەر وەک کوڕە گەورە لەگەڵ خێزانەکەیدا، زۆر بەختەوەربون .

کوڕی بچوکی پاشا دەچێتە قەراخ زەلکاوەکە و دەست دەکات بەگریان.

لەناکاو سەیردەکات، بۆقێک لە زەلکاوەکە سەر دەردەهێنێت و بەرەوڕوی ئەم دێت. کە ئەمە دەبینێت زۆری بەلاوە سەیر دەبێت و لەدڵی خۆیدا، دەڵێت: ئەرێ ئەم بۆقە، بۆچی وا یەکسەر، بەرەو لای من دێت؟ نەیدەزانی کە ئەمە بۆق نییە، بەڵکو پەرییە و چوەتە پێستی بۆقەوە!

کوڕە بچوک لەو جێیە هەڵدەستێت و دەڕوات، تەماشا دەکات، بەرەو هەر لایەک، بڕۆیشتایە، بۆقەکە بەدوایەوە بو. هەر نەدەچوە عەقڵێوە کە ئەمە بۆق نییە. لەو کاتەدا، بۆقەکە دێتە زمان و پێی دەڵێت :

- ئەی پاشازادە..... لەگەڵ خۆتدا، بمبە بۆماڵەوە..... وا تێنەگەیت کە من بۆقم..... تۆ جارێ لەگەڵ خۆتدا بمبەرەوە بۆ ماڵێ، ئەوسا بۆت دەردەکەوێت، کە من کێم؟!

کوڕە بچوکی پاشا بەقسەی بۆقەکەی کرد و بردییەوە بۆ ماڵی خۆیان.

شەو، کوڕە خەوی لێ دەکەوێت. دوای ئەوەی کە کوڕە بچوک چاوی چوە خەو... بۆقەکە خۆی کوتایە باخەڵییەوە. کوڕەکە کە چاوی هەڵهێنا، سەیری کرد پەرییەک لە باوەشیدایە، ئەنجا پاشازادە بۆی مەعلوم بو کە ئەمە بۆق نەبو، بەڵکو پەرییە. وەختێک ئەمە دەبینێت، یەگجار شادمان دەبێت، قەت خۆشیی وای بەخۆیەوە نەبینیبو.

کە ڕۆژ بوەوە، کوڕە بچوک، چوە لای باوکی و پێی وت:

- من، ئێستا دەزگیرانی خۆمم هەڵبژاردوە، دەمەوێت کە زەماوەندم بۆ سازبکەن .

باوکی لێی پرسی :

- دەزگیرانەکەت لە کوێیە؟

کوڕە بچوک وتی :

- لە ماڵەوە لای خۆمە .

شا پرسی :

- ئەوە چۆن کچێکە؟! چۆن بێ‌ئەوەی خوازبێنی بکرێت و شایی بۆ سازبکرێت، بەپێی خۆی هاتوە بۆلای تۆ؟! ئەگەر دەکرێت، با بێت بۆلام...... حەزدەکەم بیبینم .

کوڕە بچوک، هەستا چو بۆ ماڵەوە و پەرێکەی لەگەڵ خۆیدا هێنا بۆ لای باوکی. وەختێ پەرییەکە دەچێتە بەردەم پاشا، دەبێتەوە بە بۆق. پاشا دەپرسێت :

- ئەی کوا دەزگیرانەکەت؟ بۆچی نەهات؟

پاشازادەش بە باوکی دەڵێت :

- دەزگیرانەکەم، ئەم بۆقەیە .

پاشا کە یەکەم جار، ئەمە دەبیستێت، زۆر پەست دەبێت، بەڵام دوای ئەوەی کە کوڕەکەی زۆر لێی دەپاڕێتەوە، ڕازی دەبێت کە بۆی بێنێت، بەڵام شاییان بۆ نەگێڕا.

چەند ڕۆژێک تێپەڕی. براکانی کوڕە بچوکی پاشا، زانییان کە ژنی برا بچوکەکەیان لە جنسی پەرییە. شەوێ لە شەوان، سەیریان کرد، ژنی برا بچوکەکەیان، جوانێکە، تاکو ئێستا وێنەی نەبوە، لەلایەکەوە دەموچاوی لە مانگ دەچێت و لەلایەکی ترەوە، دەڵێی ڕۆژە. کە ئەمەیان بینی هەردوکیان دڵیان بەژنی برابچوکەکەیاندا، چو .

کوڕە گەورەی پاشا بیری کردەوەو ویستی برا بچوکەکەی بکوژێت، ئەنجا خۆی بچێت ژنەکەی ئەو بێنێت. بۆئەوەی ئەم کارە جێبەجێ بکات و بۆ گەیشتن بەو ئاواتە، هەستا چو بۆ لای باوکی و دەستی کرد بەقسە تێچاندن بۆ برا بچوکەکەی و پێی وت :

- بابە...... تۆ پاشایەکی گەورە و ناوداریت، وەک دەزانیت، برا بچوکەکەم لەباتی ژن بۆقێکی هێناوە، ئەگەربێت و پاشایانی تر، ئەمە ببیستن حەیا و ناموسمان دەچێت. دەڵێی چی، ئەگەر ئێمە، شاربەدەری کەین؟

پاشا، قسەی کوڕە گەورەکەی بەدڵ دەبێت و لێی دەپرسێت :

- باشە، ئێمە چۆن بتوانین لە شار دەریکەین؟

کوڕە گەورە دەڵێت :

- تۆ کوڕە بچوک، بانگ بکەرە لای خۆت و پەڵپی ئەوەی لێ بگرە کە هێلکەی سیمرغت بۆ پەیدابکات. وەختێک تۆ ئەمەت لێ داواکرد، هەڵدەستێت بەدوای هێلکەی سیمرغدا، دەگەڕێت، بەڵام بۆی پەیدا ناکرێت، ئەوسا لەشەرم و تەریقیدا، سەری خۆی هەڵدەگرێت و جارێکی تر ناگەڕێتەوە بۆ ئەم ناوە و ڕزگارمان دەبێت لەدەستی.

پاشا، ناردی بەدوای کوڕە بچوکدا و پێی وت :

- ئەگەر تۆ خۆت بە کوڕی من دەزانیت، دەچیت لە (چیای قۆف) (هێلکەی سیمرغ)م بۆ دەهێنیت.

کوڕە بچوک، کاتێ ئەم داواکارییەی لە باوکی بیست بەجارێ غەم و پەژارە دایدەگرێت و زۆر خەفەت دەخوات، دێتەوە بۆ لای پەرییەکەی ژنی، ژنەکەی لێی دەپرسێت :

- خەفەت بە چی دەخۆیت؟

کوڕە بچوکیش، دەڵێت :

- چۆن خەفەت ناخۆم، باوکم داوای لێ کردوم بچم بۆ چیای قۆف و لەوێ هێلکەی سیمرغی بۆ پەیدابکەم و بیهێنمەوە بۆی. منیش، پەستی دایگرتوم و تیادا ماوم و نازانم قوڕی کوێ بەسەر خۆمدا بکەم، چی بکەم؟

ژنە پەرییەکەی پێی دەڵێت :

- هیچ خەمت نەبێت، تۆ دەتوانیت هێلکەی سیمرغی بۆ پەیدا بکەیت .

کوڕە بچوک دەڵێت :

- چۆن؟

ژنەکەی دەڵێت:

- لێرەوە، بیست ڕۆژ بکەوەڕێ، سەری بیستەم ڕۆژ، توشی چیایەک دەبیت، کاتێک کە گەیشتیتە بەرچیاکە، گایەک بکوژە و بچۆرە

پێستەکەیەوە. لە چێشتەنگاودا، سیمرغێک لەسەر چیای قۆفەوە بۆ ئاو خواردنەوە دەفڕێت بۆ خوارەوە، ئەوسا گاکە لەگەڵ خۆیدا، هەڵت دەگرێت و دەفڕێتەوە بۆ سەر چیاکە، دوای ئەوەی کە گاکە دادەنێت، هەمدیسان دەڕواتەوە بۆ خوار چیاکە. کاتێک کە ئەو فڕی، تۆش لە پێستی گاکە وەرە دەرەوە و لە پەنایەکدا، خۆت مەڵاس دە. ئەو سیمرغە توشی بەڵایەکی پیس بوە، ئەگەر تۆ توانیت لەو میحنەتە ڕزگاری بکەیت، هێلکەیەکت دەداتێ، تۆش ئەو هێلکەیە هەڵگرە و بیهێنەرەوە بۆ ماڵەوە .

کوڕە بچوک بە قسەی ژنەکەی دەکات. توێشەبەرە و شتومەک و پێویستی ڕێگای هەڵگرت و بەرەو چیای قۆف کەوتەڕێ.

دوای بیست ڕۆژ کە گەیشتە بەرچیاکە ژنەکەی چی پێوتبو، وای کرد، هەستا ڕۆیی گایەکی کوشت و چوە پێستەکەیەوە.

سیمرغێک بۆ ئاوخواردنەوە دەنیشتەوە، کە گاکە دەبینێت، یەکسەر لەگەڵ خۆیدا، هەڵی دەگرێت و هەڵدەفڕێتەوە بۆ سەر چیاکە. گاکە دادەنێت و دەفڕێتەوە بۆ خوارێ.

کاتێک، سیمرغەکە دەڕوات، کوڕە بچوک لە پێستی گاکە، دێتە دەرەوە و لە جێیەکدا، خۆی مات دەدات. لەناکاو سەیردەکات، ئەوا باڵندەیەک نیشتۆتەوە و خەریکە هێلکەکانی سیمرغەکە دەخوات. دەستبەجێ کوڕە بچوک لە شوێنی خۆی دەردەپەڕێت و خێرا ئەو باڵندەیە، دەکوژێت کە بۆ خواردنی هێلکەی سیمرغەکە هاتبو.

لای ئێوارە، کە سیمرغەکە دەگەڕێتەوە، تەماشا دەکات ئەمڕۆ هێلکەکانی هەمویان بەساغی ماونەتەوە و کەس دەستی بۆ نەبردون، بەمە شاگەشکە دەبێت. دەچێت، ئەو ناوە هەموی دەپشکنێت، کوڕە بچوکی پاشا، دەدۆزێتەوە، لێی دەپرسێت :

- تۆ چۆن گەیشتویتە ئێرە؟

کوڕەش، حاڵو مەسەلە بۆ سیمرغەکە دەگێڕێتەوە. تومەس، هەمو ڕۆژێک، ئەو باڵندە دڕندەیە بەهێلکەی سیمرغەکە فێرببو،

هەرچییەکی بکردایە، دەهات دەیخواردن. بە کوشتنی ئەو باڵندەیە، کوڕە بچوکی پاشا، سیمرغەکەی لەو بەڵایە ڕزگارکرد، لەبەرئەوە، سیمرغەکە بە پاشازادە دەڵێت :

- داوای چیم لێ بکەیت بۆت جێبەجێ دەکەم .

کوڕەش پێی دەڵێت :

- ئەگەر دەکرێت، هێلکەیەکم لەو هێلکانەی خۆت بدەرێ .

سیمرغیش بێ سێودو، دەستبەجێ هێلکەیەکی دەداتێ. کوڕە هێلکەکە لەگەڵ خۆی هەڵدەگرێت و بەسەر پشتی سیمرغەکە دێتەوە بۆ خوار چیاکە. ئەنجا دەگەڕێتەوە بۆماڵەوە و هێلکەی سیمرغەکە بۆ باوکی دەبات. بەم چەشنە، پیلان و فیتی براگەورەکەی سەرناگرێت. پاشا لێی دەپرسێت :

- ئێستا، کاتی ئەوە هاتوە کە شاییەکەتان بۆ سازبکەین؟

کوڕە بچوکیش، وەڵامی باوکی دەداتەوە و دەڵێت :

- بابە..... ئایا تۆ تا ئێستا، نەتزانیوە کە ژنەکەی من، پەرییە؟

باوکیشی دەڵێت :

- نەخێر نەمزانیوە، بەڵام مادام وای لێهات، شاییتان بۆ دەگێڕین.

هەر بەو شێوەیە چۆن شایی بۆ ژنی کوڕەکانی پاشا کرابو، شایی و زەماوەند بۆ کوڕە بچوکی پاشایش، سازکرا. دوای ئەوە، براکانی بەهیچ جۆرێک، نەیاندەوێرا، قسە لەگەڵ برا بچوکەکەیاندا، بکەن.

**چیرۆکی (پاشازایە و بۆق)**

**لە ئەدەبی فۆلکلۆری کوردیدا**

هەبو نەبو، پاشایەک بو، ئەم پاشایە سێ کوڕی بو. ڕۆژێکیان پاشا بڕیاڕی دا، ژن بۆ کوڕەکانی بێنێت. بۆ ئەم کارە، ناردی بە شوێن کوڕەکانیدا و پێی وتن :

- کوڕەکانم، من دەمەوێت ژنتان بۆ بێنم، بەڵام ژنهێنانەکەتان، دەخەمە بەختەوە. هەرسێکتان، یەکی تیروکەوانێک لەگەڵ خۆتاندا، بەرن

و بچنە سەربان. کە چونە ئەوێ، یەکی تیرێک بهاوێژن. تیرەکانتان کەوتە چ ماڵێکەوە، کچی ئەو ماڵانەتان بۆ دێنم .

کورەکانی پاشا، چونە سەربان، دەستیان کرد بە تیرهاویشتن. تیری کورە گەورە دەکەوێتە ماڵی وەزیری دەستە ڕاستەوە. تیری کورە ناوەنجی دەکەوێتە ماڵی وەزیری دەستە چەپەوە. ئەنجا سەرەی کورە بچوک دێت. ئەمیش، دەست دەبات، تیرێک دەهاوێژێت. تیرەکەی ئەم دەڕوا، دەڕوا، دەکەوێتە زەلکاوێکەوە. کورە بچوک، جارێکی تر تیرێکی تر دەهاوێژێت، ئەمجارەش، دەکەوێتەوە زەلکاوەکە. بۆ سێیەم جار، تیرێکی تر دەهاوێژێت. هەمدیسان، دەکەوێتە زەلکاوەکەوە.

کورە بچوک کە ئەمە دەبینێت، خەفەتێکی یەگجار زۆر دەخوات و بەجارێک پەستیی دایدەگرێت. هەڵدەستێت لەگەڵ ئەو خەڵکەی کە هاتبون بۆ سەیری تیر هاویشتنەکە، دەڕوات بۆ قەراخ زەلکاوەکە.

پاش ئەوەی کە خەڵکەکە ئەو ناوە چۆڵ دەکەن، کورە بچوک، بە تەنیا دەمێنێتەوە و لە قەراخ زەلکاوەکە دادەنیشێت .

لەناکاو لە زەلکاوەکەوە، بۆقێک سەر دەردەهێنێت و دێتە زمان و بە کورە بچوکی پاشا دەڵێت :

- هیچ خەفەت مەخۆ، بەختی تۆ لە بەختی هەموان باڵاترە، چونکە من پەریم .

بۆقەکە ئەمە دەڵێت و یەکسەر پێستەکەی لەبەرخۆی دادەماڵێت. کورە بچوک، سەیر دەکات، ڕاستە ئەمە بۆق نییە، پەرییە. کورە بچوک دەستبەجێ عاشقی ئەو پەرییە دەبێت، بەڵام پەرییەکە، جارێکی تر، دەبێتەوە بە بۆق و خۆی دەکاتەوە بەناو زەلکاوەکەدا.

دوای ئەمە، کورە بچوک دەگەڕێتەوە بۆ ماڵێ، بەڵام لەبەرئەوەی عاشقی ئەو پەرییە بو بو، خۆی پێڕاناگیرێت، هەمو ڕۆژێک، بۆئەوەی چاوی بە پەرییەکە بکەوێتەوە، دەچێتە قەراخ زەلکاوەکە و، ئەم شیعرە دەڵێت :

بۆق، بۆقیلەی ناو ئاوان

سەر بێنەرە، تەنکاوان
ببینم، ناوی چاوان
ئەم شیعرە بەم شێوەیەش، وتراوە:
بۆق، بۆقیلەی ناو ئاوان
بەناز، هەڵبێنە چاوان
سەربێنە، تەنکاوان
ببینم، ناوی چاوان

ئەنجا، با بێینەوە لای کوڕە گەورە و کوڕە ناوەنجی پاشا. کوڕە گەورە کە تیرەکەی دەکەوێتە ماڵی وەزیری دەستە ڕاستەوە، دەچێت بۆ لای باوکی و پێی دەڵێت کە تیرەکەی کەوتۆتە ئەوێ. باوکیشی زۆر پێی خۆش دەبێت، دەستبەجێ دەنێرێت، بەشوێن وەزیری دەستە ڕاستدا و کچەکەی بۆ کوڕەکەی لێ داوا دەکات، وەزیریش، ڕازی دەبێت و زەماوەند بۆ کوڕە گەورە سازدەکەن.

دوای ئەوە کوڕە ناوەنجیش، دێتە لای باوکی و پێی دەڵێت کە تیرەکەی کەوتۆتە ماڵی وەزیری دەستە چەپەوە. پاشاش، دەنێرێت بەشوێن وەزیری دەستە چەپدا و داوای کچەکەی بۆ کوڕەکەی لێ دەکات. وەزیری دەستە چەپ، پێخۆشحاڵ دەبێت و، شایی بۆ ئەمیش، سازدەکرێت.

ماوەیەکی بەسەردا دەچێت، کوڕە بچوک ڕاسپێری لە باوکی دەکات کە کچە هەژارێکی بێکەسی دۆزیوەتەوە و دەیەوێت بیخوازێت. پاشا گفتی دەداتێ کە بۆی بێنێت. ئەنجا کوڕە بچوک دێتەوە لای پەرییەکە و لەگەڵیدا، ڕێک دەکەوێت کە بیکاتە هاوسەری خۆی، بەڵام پەرییەکە پێش ئەوەی کە ڕازی بێت، بە کوڕە بچوکی پاشا دەڵێت:

- من دڵنیام لەوەی کە تۆ منت خۆش دەوێت، ئومێدم وایە کە هەر لەسەر خۆشەویستیی خۆت بمێنیتەوە. ئەوەش بزانە، خۆشەویستی

دڵسۆزیو قوربانیدانە، من ئامادەم کە ببم بە هاوسەرت، بەڵام شتێکی زۆر ئاسانت لێ داوا دەکەم. ئەویش، ئەوەیە، ئەو پێستەی کە تێیدا بوم، هەڵی گری و زۆر ئاگات لێبێ کە نەفەوتێت، چونکە ئەوە بزانە، هەر وەختێک، ئەو پێستە لەناوبەریت، نۆرەیەکی تر، بەحەیاتت، چاوت بەمن ناکەوێتەوە .

کورە بچوک، پەیمانی دەداتێ کە پارێزگاری ئەو پێستە بکات و نەیەڵێت بفەوتێت. بەم چەشنە دەبن بەهاوسەری یەکترو ماوەیەکی باش، ژیان بەخۆشی بەسەر دەبەن.

رۆژێکیان، ژنە نانپێوەرێک لەسەر تەنور خەریکی نانکردن دەبێت، بۆ گەشکردنەوەی ئاگری تەنورەکە لەگەڵ تەلاش و مەلاشدا، پێستی بۆقەکەش، کە لە تاقێکی سەر تەنورەکەدا، فڕێ درابو، ڕادەماڵێ بۆ ناو تەنورەکە و دەسوتێ .

ئێوارە کە کورە بچوک، دێتەوە، تەماشا دەکات، ژنەکەی نەماوە. ئەنجا لە ئەنجام دەگات و دەزانێت، چ کەتنێکی داوە، تازە پەشیمانی لەپای چی؟

**یەکەم بەش**

**سەرنجگە هەستیار و گرنگەکان**

بۆ گەیشتن بە جەوهەر و ڕاستیی ئەو پایە و بنەما هۆشیی و مەترياليیانەی کە هەردو چیرۆکەکەیان لەسەر بنیاتنراوە بە پەسەندمان زانی لەڕێگای دەسنیشانکردنی ئەو سەرنجگە هەستیار و کاریگەرانەوە بۆیان بچین کە لە سەرتاپای چیرۆکەکاندا، دەچەقنە چاو و شوێنی وەستان و تێرامانن.

بۆ هێنانەدیی ئەو مەبەستە لە پێشەوە، پایە و ڕوکنە ئەساسییەکانی هەردو تێکستەکە لە شێوەی ئەم دایەگرامەدا، دەخەینە بەرچاو، دواتر لە سەرنجگەکان دەدوێین.




**یەکەم پار**

**سەرنجگەکانی تێکستی چیرۆکی (شازادە و بۆق) لای بەرتەنگ**

- **زەمان:** سەردەمی کۆن، بەڕۆژو بەشەو.
- **شوێن:** مالّی پاشا، پەنجەرەی مالّی وەزیری دەستە ڕاست، پەنجەرەی مالّی تیجارباشی، زەلکاو، کێوی قۆف.
- **بیری سەرەکی:** پەیمانپەرستی و وەفاداری.

**ئەبزار:** بەخت، ئەفسانە، دلّداری، پاڕانەوە، پیلانگێڕی، پێستی گا، سیمرغ و هێلکەی سیمرغ[٦]، جانەوەری هێلکە خۆر.

**ئەکتەر:** پاشا، کوڕە گەورەی پاشا، کوڕە ناوەنجی، کوڕە بچوک، وەزیری دەستەڕاست، تیجارباشی، (بۆق)[٧]، پەری.

**شەنوکەوکردنی جەوهەری سەرنجگە بنیاتنەرەکانی تێکستی چیرۆکە بەرتەنگییەکە**

ئەم چیرۆکە لە زەمانی کۆندا، ڕوی داوە و حوکم حوکمی پاشایەتی، بوە. دیارە، دەستەلّات لەدەست، پیاودا بوە. بە هیچ شێوەیەک، ڕەنگ و بۆی ژن بەم چەشنە بەڕێوەبردنەوە، بەدی ناکرێت.

جێگاکـــانی بەســـەرهاتەکان، جـــگە لە مـــاڵی پاشـــا و وەزیـــر و تیجارباشی ئەو شوێنەی کە لە هەمویان، زیاتر چاوی تێ براوە، زەلکاو و (کێوی قوف)ە. [٨]

مەبەست لە بنیاتنانی ئەم چیرۆکە گەیاندنی ئەنجامی وەفاداری و قوربانیـــدان و لە هەموشـــیان، گرنگتـــر، چەســـپاندنی کـــاریگەریی پەیمانپارێزی و بردنە سەریەتی.

پەیمان و پەیماندان، جۆر و بواری زۆرە، یەکێ لە چەشنە هەرە هەستیار و دیار و گشتگیرەکانی، ئەوەیە کە دڵ و دڵخواز بەیەکتری، دەدەن، واتە پەیمـانی (دڵـداری)یە. ئەم جۆرەیـان، نـرخ و بەهـایەکی یەگجـار مەزنـی هەیە، چـونکە کۆتـاییەکەی ئەگەر لێـی لانەدرێـت، بە پێکهێنـانی خێـزان و کەوتـنەوەی منـاڵ کە گەورەتـرین سـەرمایەی مرۆڤایەتییە، کۆتایی دێت.

هەر لەبەر ئەم سـەنگەی کە دڵـداری لە مێشـک و بیـرو هۆشـی خەڵکیـدا، هەیەتـی لەم چیرۆکەشـدا، پەیـامی پەیمانپـارێزی لەودا، نیشاندراوە و دڵداری، کراوە بە ئەبزاری گەیاندنی ئەو پەیامە.

لە ڕەوینەوەی گـرێ کوێرەکـانی بەسـەرهاتەکانی ئەم چیـرۆکەدا، بەپێـی لۆجیـک، ئاسـان نەبـون بچـنە ئەقڵـی مەردومەوە، بـۆیە پەنـابراوەتەبەر بیروبـاوەڕی بـاوی ئەو سـەردەمە و زۆرجـار ئەفسانەشیان تێکەڵ کردون، وەک: خۆدانەدەست (بەخت) لە حەلکردنی گیروگـرفتە ئـاڵۆزو چارەنوسسـازەکاندا، واتە لە چارەسـەرنەکردنی لۆجیکی ڕوداوە سەختەکاندا و بۆ باوەڕهێنانی خەڵکی بەو ڕوداوانە و قەناعەت پێکردنیان، پشتیان بەهێزو توانای (بەخت)، بەستوە.

لەم چیـرۆکە دڵدارییەدا، جـگە لە بەخـت و ئەفسـانە کە کـراون بە ئەبزار، پاڕانەوەی کوڕە بچوک لە پاشای باوکی و پیلانگێڕیی براگەورە و نـاوەنجیش، دژی بـرا بچوکیـان، ئەمـانەش، دیسـانەوە بە ئەبـزار، دادەنرێن، بەڵام ئەو ئەبزارەی کە لەم چیرۆکەدا سەرتاپا ئەفسانەی لێ دەتکێت، بەکارهێنانی پێستی گا و لەبەرکردنی و هەڵفڕینی کوڕە بچوک

بـوە بـۆ ســەر کێـوی ئەفســاناوی (قـۆف، یـا قـاف) و کوشــتنی ئەو جانەوەرەی کە بە خواردنی هێلکەکانی سیمرغەکە فێربوبو.

لێـرەدا، لەســەر خاڵێـک یـا لەســەر ســەرنجگەیەکی گرنـگ لەم چیـرۆکەدا پێویسـت بە وەسـتانە، ئەویـش، ئەوەیە کە لە ئەنجـامی ئەو ئـازایەتییەی کـوڕە بچـوک لە کوشـتنی جـانەوەرە زاڵـمەکەدا، نوانـدبوی، وای لە سیمرغەکە کرد کە هێلکەیەک لە هێلکەکانی کە پارچەیەک بوە لە جەرگی بە کوڕە بچوک، بدات.

یەکێـــک لە ئامۆژگارییەکـــانی ئەم چیـــرۆکە، قوربانیـــدان و خـۆبەختکردنی کـوڕە بچـوکە لە پێنـاوی ڕازیکردنـی دڵـی بـاوکی، و گەیشــتن بە دولــبەرەکەی کە پەریــیەکە بــوە، ئەم قوربانیــدانە و ئەو پاداشــتە بەنــرخەی ســیمرغەکە بەخشـــی بە نمــونەی هەرە بەرزی پەیمانپەرستی، دادەنرێن.

لەم چیـرۆکەدا، ئەکـتەری لـۆجیکی، وەک: (پاشــا و کوڕەکـانی و وەزیـری دەستەڕاسـت و ، تجارباشــی) و نـالۆجیکی، وەک: جـانەوەری هێلکە خۆر و، سیمرغ)ی تیادایە.

**دوەم پار**

**سەرنجگەکانی تێکستی چیرۆکی (شازادە و بۆق) لای کورد**

- **زەمان:** سەردەمی کۆنی پێش مێژو، کات: ڕۆژ
- **شوێن:** مـاڵی پاشـا، مـاڵی وەزیری دەستەڕاسـت، مـاڵی وەزیری دەستە چەپ، وشکانی، زەلکاو، سەرتەنور.
- **بیری سەرەکی:** پەیمانشکێنی و بێ وەفایی.
- **ئەبزار:** بەخت، ئەفسانە، دلداری، شیعر، سێ تیر، کەوڵ.
- **ئەکـتەر:** پاشــا، کـوڕە گەورە، کـوڕە نـاوەنجی، کـوڕە بچـوک، وەزیــری دەستەڕاســت، وەزیــری دەســتە چەپ، خەڵــک، بــۆق، پەری، نانپێوەر.

**ئەنجام:** خەفەتباری و تراژیدیا.

**شـەنو کەوکردنـی جەوهەری سـەرنجگە بنیاتنەرەکـانی تێکسـتی چیرۆکە کوردییەکە**

بەسـەرهاتەکان لە زەمـانی کۆنـدا و لە ڕۆژدا، ڕویـان داوە. لەو وڵاتەدا، پاشـا لەسـەر تەخـت بـوە. لە سسـتێمی پاشـایەتیدا، دەسـەڵات بەشـێوەیەکی هەرەمیـی لە پاشـاوە بـۆ کـوڕ و کەسـە نزیکەکـانی دێنە خوارەوە. پاشا (٢) دو وەزیری بۆ بەڕێوەبردنی ئیش و کارەکانی بوە. یەکێکیـان، کە دەسـەڵاتی زۆر و گرنگـی لەچنگـدابوە، وەزیـری دەسـتە ڕاسـت بـوە و لای دەسـتی ڕاسـتی پاشـاوە دانیشـتوە، ئەوی‌تریـان، وەزیری دەستە چەپ بوە، ئەمەیان دەسـەڵاتی کەمتر بوە و لای چەپی پاشاوە، دانیشتوە.

لە سستێمی پاشایەتیدا، بەگشتی، پیاو خاوەن دەسەڵاتە، ئەم جۆرە حوکمڕانییە لە مێژودا لەو قۆناغەوە دەست پێدەکات کە پیاو دەسـەڵات لە مێینە زەوت دەکات کە لە قۆنـاغە سـەرەتاییەکانی مێژودا، لەدەسـت (ژن)دا، بوە.

لەم چیرۆکەشـدا، هـیچ جـۆرە ئەمـر و فەرمـان و ڕۆڵ بە (ژن) نەسپێراوە و پرس و ڕاشیان پێ نەکراوە، واتە ئەم چیرۆکە، نیشاندەری باڵادەستیی پیاوە.

شـوێنی بڕیـاردان، مـاڵی پاشـایە، مـاڵی وەزیـری دەسـتە ڕاسـت و دەسـتە چەپـیش، تەنیـا تیرەکانیـان، تـێ کەوتـوە، ئەمـانە، هەمویـان، وشـکانین، بەڵام هەڵبژاردنـی (زەلکاو)یش بـۆ ئەوەیە کە جێی پەرییەکە کە لە پێستی بۆقدا بوە، نیشان بدرێن، کاتێکیش کە لە بۆقەوە بۆتەوە بە (پەری) بە وشکانیدا، ڕۆیشتوە بـۆ مـاڵی کـوڕە بچـوکەکە. ئەو شـوێنەش کە جاران تەنوری تیادا گەرم دەکرا، پێیان دەوت (سەرتەنور).

ئەم چیرۆکە، پەیامێکە بۆ خەڵکی کە ڕێز لە گفت و قسـە و بەڵێنـی خۆیـان بگـرن و پەیماندۆسـت و پەیمانپـارێزبن و بـێ وەفـایی و پەیمانشـکێنی نەکەن، ئەگەر نەتـانکرد، ئەوا ئامۆژگـاری و عیبـرەت لە

ئەنجامە خراپەکانیان، وەرگرن، هەر بۆ گەیاندنی ئەو پەیامەش، ئەم چیرۆکە بنیات، نراوە.

بە مەبەستی سوک و ڕەوانی و وریاکردنەوەی خەڵکی لە ئەنجامە تفت و تاڵەکانی (پەیمانشکێنی) لە دڵ و دەرونیاندا، پەنابراوەتە بەر، چەندین ئەبزاری هەمەڕەنگ لەوانە، پشتبەستنە بە حوکم و حەکەمیی بەختە لە دیاریکردنی چارەنوسدا کە دیارە ئەو سەردەمە و تا ئێستاش، (بەخت) جێگە و ڕێگەیەکی تایبەتی لە مێشکی خەڵکیدا، گرتوە و یەکێک بوە لە جۆری (بیروباوەڕ) کە لە سەردەمی هۆنینەوەی ئەو چیرۆکەدا بە ئاسانی پەنای براوەتەبەر.

سێ (٣) جێ بەر ئەو بەختە دەکەوتن، هەر بۆیە بە پێی ژمارەی کوڕەکان، سێ (٣)، تیریش، ئەبزاری گەیشتنی ئەو بەختە بوە بۆ ئەو شوێنانەی کە بۆیان، دیاریکرابو.

دانانی (بەخت) بە حەکەم و تێهەڵکێشکردنی (ئەفسانە) ش، بۆ ئەوە بوە کە ئیتر، هیچ بوارێک بۆ خەڵکی نەهێڵێنەوە، دو دڵ بێت لە بەسەرهاتەکان و بە ئاسانی باوەڕیان، پێ بکات. (دڵداری)یش کە نمونەی بەنرخترین و بەرزترین و پتەوترین، جۆرو چەشنی عەهد و پەیمانە، کراوە بە ئەبزار بۆ نیشاندانی ئەو پەیوەندییە پیرۆزە، کراوە بە ئەبزار.

پەنابردنە بەر شیعر کە پڕییەتی لە سۆز و بە وەزن و ئاواز و مۆسیقا ئاوێتە کراوە و کردنی بە پرد و ئەبزاری پەڕاندنەوەی هەست و شعوری خۆشەویستی کوڕە بچوک بۆ پەرییەکە ئەساسێکی عەقڵی و مەنتیقی هەبوە. ئەوسا و ئێستاش، ئەگەر مرۆڤ مەبەستی بوبێت ئەو پەیامەی کە دەینێرێت، خێراتر جێی خۆی بگرێت و نەفەوتێت و درەنگ لە بیربچێتەوە، یا هەر بمێنێت، دەیخاتە چوارچێوەی شیعرەوە.

لە سەرتەنوردا، جگە لە تەنور و ساج و پنە و تیرۆک و مایە و کۆڵەوژ، جاران (کەوڵ)یشیان بۆ ئارد و بڵاوکردنەوە و ڕیز کردنی گونک لەسەری، بەکارهێناوە. (کەوڵ) پێستی مەڕو بزن و حەیوانی

تریشـــە. لەدوای نـــانکردنەکە دەپێچـــرێتەوە و لە شـــوێنێکدا بـــۆ ئەوەی دواتـر، سـودی لـێ ببینرێت، هەڵدەگیرێت کە کۆنیش بـو فـڕێ دەدرێت، بەڵام لەم چیرۆکەدا، نـانپێوەرەکە کە سـوتاندویەتی. کە سـوتاش، دیـارە ئیتر جارێکی تر نایەتەوە.

هەڵبژاردنی کاراکتەرێکی وەک (بۆق) لەم چیرۆکەدا لەبەر چەنـدین هۆ، بوە لەوانە:

١- لە تەڕایی و وشکانیشدا، دەژی.

٢- پێســـتەکەی تەنـــک و جـــوان و بەڵەک بەڵەکە کە بە ئاســـانی لەبەریدا، دادەکەنرێت.

٣- بە جـۆش و خرۆشـێکی شـاز و بێوێنەوە و بەدەنگـی بەرز کە خۆشەویستی لێ دەبارێت، هەست و نەستی دولـبەرەکەی دەجولێنێت و لەگەڵیدا، دەکەوێتە دڵ و دڵخوازییەوە.

ئەم جـــۆرە تایبەتییـــانەی کە لە (بـــۆق)دا، هەن، بە دەگـــمەن لە گیاندارێکی تردا، کۆدەبنەوە.

بەڵێنـدان بە پارێزگـاریکردن لەبـردنە سـەری (عەهـد و پەیمـان) و لانەدان لێی، پەیام و دروشـمی دینـی بوە و لە چوارچێوە و قـاڵبی ئەو ئەرک و واجیبانەدا، بوە کە پێویست بوە، ئیمانداران، پێوەی پابەنـدبن و ڕێزی لێ بگرن.

لە دینـی (میترایـی) دا کە لەڕوی زمـانەوە، ئەم وشـەیە لە میـت، یـا متـرا، واتە (میهـر) سـازبوە[٩] و ئەمە واتاکـانی بـوە: عەهـد، پەیمـان و دۆسـتایەتی، ڕۆژ، حەوتەم مـانگی سـاڵ، (١٦) شـازدەیەم ڕۆژی هەمـو مانگێکی شەمسی.

وەک دەبینین، (عەهد و پەیمان) یەکێکە لەو ڕوکنانەی کە (میترایی) لەسەر وەستاوە.

لە دینـی ئیسـلامی پیرۆزیشـدا، خـوای گەورە لە سـورەتی (ئیسـرا، ئایەتی٣٤)دا، فەرمویەتی:

**(وَأوفَوا بالعَهدِ إنَّ الَعَهْدَ كانَّ مَسْؤُلا)**

لێرەش، مسـولّمانان، هانـدراون کە بەرامـبەر بە (عەهـد و پەیمـان) خۆڕاگر و بەوەفا بن و بیانبەنە سەر، چونکە لێپرسینەوەی لەدوایە.

لای کـوردیش، گومـانی تیـادا نیـیە کە خۆبەسـتنەوە بەو عەهـد و پەیمانەی کە داویانە بە یەکتری بە وەفا بون بۆ گەیاندن بە جێی خۆی، ئەگەر بە پێچەوانەشــەوە کاریــان کردبێــت، ئەوا شــاعیرێکی مەزنــی کوردی، وەک: (هێمن)ی بەم جۆرە جولاّندوە کە بڵێت:

قەرار بوو بێی لەگەڵ خۆت شادی بێنی
نەهاتی، گەرچی پێت دابووم بەڵێنی
لەناو کوردا نەبوو پەیمان شکاندن
لە کوێ فێربووی گوڵم پەیمانشکێنی (دیوانی هێمن٢٠٠٢: ١٤١)

پەیــام و بیــری ســەرەکی ئەم چیــرۆکە فۆلکلــۆرییە کــوردییە، نیشاندانی ئەنجامی پەیمان و پەیمانشکێنی بوە. کوڕە بچوکی پاشـا، ئەو بەڵێـنەی نەبـردە سـەر کە پارێزگـاریکردن بـو لە کەوڵـی پەریـیەکە تـا گەیشتبوە ئەوەی فڕێ بدرێتە سـەر تەنور و لەوێشـەوە بۆ نـاو تەنور. لەم چیرۆکەدا داوا لە خەڵکی کراوە عیبرەت لە پەیمانشکێنی وەرگرن و ئامۆژگارییە بۆیان کە هەمو بێوەفاییەک کۆتـایی بەم ئەنجامە دێت کە ئەم چیرۆکە پێی تەواو بوە، ئەویش خەفەت و غەمباری و تراژیدا، بوە. هەوێنـی مەیینـی پەیـامی پەیمانپەرسـتی و وەفـاداریی نـاو ئەم چیـرۆکە، عەشقی پڕ سۆزی کوڕە بچوک و پەرییەکە بو.

**دوەم بەش**

**دیاریکردنی ئێلێمێنتی لەیەکچو و دور لە هەردو تێکستەکەدا**

**یەکەم پار**

**ئێلێمێنتی لەیەکچو**

لە نـاواخنی هەردو چیـرۆکەکەدا، چەنـدین ئێلێمنـت (عونسـور)ی هاوبەش، دەبریسکێنەوە. بە باشمان زانی بەم خاڵانە، بخرێنە بەرچاو:

١- یەک ناونیشانیان هەیە، ئەویش (شازادە و بۆق)ە.

٢- پەیمانشکاندن و ئامۆژگاریکردنن.

٣- هاندانن بۆ خێزان پێکەوەنان.

٤- ئەم هانـدانە، دڵـداریی نێـوان مـرۆڤ (کـوڕە بچـوکی پاشـا)، پەرییەکی لێ کەوتۆتەوە.

٥- کـاراکتەر و پـاڵەوانی سـەرەکی (کـوڕە بچـوک)و پەریـیەکە لە هەردوکیاندا، لە پێستی بۆقدایە.

٦- دەستەڵات، دەستەڵاتی پیاوسالارییە.

٧- دەستەڵات بەدەستی یەکەم، پاشایە.

٨- یاریدەدەری پاشا، وەزیری دەستەڕاستە.

٩- شوێنی بڕیاردان، ماڵی پاشایە.

١٠- پاشا (٣) سێ کوڕی هەیە.

١١- لە دەستنیشانکردنی چارەنوسدا، خۆدراوەتە بەر (بەخت).

١٢- بۆ ڕەوینەوەی گرێکوێرەکان، پەنا براوەتە بەر (ئەفسانە).

١٣- (٣) سێ تیر هاوێژراوە.

١٤- بەشێک لە شوێنی ڕوداوەکان (وشکانی و زەلکاو)ە.

**دوەم پار**

**ئێلێمێنتی دور**

بـۆ نیشـاندانی ئێلێمێنـتە دورەکـان کە دەرخەری جیاوازییەکـانی نێوان هەردو تێکستەکەن، بەم نەخشەیە، ئاماژەیان پێدەکەین:

| تێکستە بەرتەنگییەکە | تێکستە کوردییەکە |
| --- | --- |
| کێوی قوف، یا قاف | – |
| ماڵی تیجارباشی | ماڵی وەزیری دەستەچەپ |
| پێشنیازی ژنهێنان لەلایەن کوڕەکانی پاشاوە | لەلایەن پاشاوە |
| پێستی گا | کەوڵی پەری |
| جانەوەری هێلکە خۆر | – |
| باڵندەی ئەفسانەیی (سیمرغ) | – |
| هێلکەی سیمرغ | – |
| – | لاواندنەوە بەشیعر لەسەر کێشی (٧) حەوتی فۆلکلۆری |
| پاڕانەوەی کوڕە بچوک لە باوک | – |
| – | پەری مەرجی هەبو |
| قایل نەبونی پاشا بە (بۆق) | – |
| پیلانگێڕی و خیانەت | – |
| – | سەرتەنور |
| – | نانپێوەر |
| قوربانیدان و خۆبەختکردن لە پێناو دولبەردا | – |
| بەرهەمی پەیمانپەرستی خۆشی و شادی | بەرهەمی پەیمانشکێنی (مەرگ) |

کاتێک کە ژمارەی ئێلێمێنتە لەیەکچوەکان بەرامبەر بە جیاوازەکان، ڕادەگیرێن، بە ئاسانی هەست بە زۆری لەیەکچوەکان، دەکرێت. ئەم نزیکییە، نابێت بخرێتە قاڵبی (ڕێکەوت)ەوە، بەڵکو سەلمێنەری ئەوەن کە هەردو فۆڕمەکە زادەی کلتورێکی هاوبەشی نێوان کورد و بەرتەنگن.

لە مێژوی مرۆڤایەتیدا بە هۆی ڕوداو و کارەساتی سروشتی و ناسروشتییەوە، کۆچ و کۆچکردن بە خواست بوبێت، یا بە زۆر و ناعیلاجی، بوبێت ڕویان، داوە. بەڕای ئێمە، مانەوەی تێکستە بەرتەنگییەکە تا ئەمرۆ بەم شێوەی ئێستا کە لە هەمو ڕویەکەوە نوقسانی پێوە دیار، نییە، نیشانەی ئەوەن کە میللەتی بەرتەنگ لەبەر سەختیی شوێنی نیشتەجێبونیان و دورە دەستی لە خەڵکی تر و تێکەڵ نەبونیان لەگەڵ خێڵ و عەشیرەت و میللەتانی تری دەوروپشت و دور لێوەیان، بەر بەرداشی گۆڕانی کلتور نەکەوتون، بۆیە چیرۆکە فۆلکلۆرییەکانیان بە ساغ و سەلامەتی، ماونەتەوە.

بە پێچەوانەشەوە، کورتبونەوەی تێکستە کوردییەکە بەوە لێک دەدرێتەوە کە شوێنی ژیانی کورد بە بەراورد لەگەڵ بەرتەنگدا، هەر لە شاخ و کێو قەتیس، نەماوە، بەڵکو دیسانەوە لەبەر خۆپاراستن لە کارەساتی هەمەجۆرە، بەشێکیان، ڕویان لە ناوچە کراوە و دەشتاییەکان، کردوە. دیارە، هەمو شارێک لە مێژودا، دانیشتوانەکانی تێکەڵەیەک بون لە خەڵکی گۆشکراو بە کلتوری جیاواز. لە ئەنجامدا، ئەوانەی لەو جێگا تازانەدا، گیرساونەتەوە بەهۆی کارکردنی چەندین فاکتەری نازمانی و زمانی، کلتورە کۆنەکانیان لێ کاڵ بۆتەوە و بەرە بەرە، دەقیان بەو کلتورەوە گرتوە کە بەسەر عەقڵ و هۆشی خەڵکی شوێنە نوێیەکانیدا، زاڵ بوە.

گومانی تێدا، نییە کە کورد هەر لە کۆنەوە تا ئەمرۆ پەیمانپەرست و پەیمانپارێز بوە، بەڵام ئەو پەیمانشکێنییەی کە لە چیرۆکە کوردییەکەدا، ڕوی داوە، ئەمە بە حاڵەت لێکدەدرێتەوە و نەبوە بە دیاردە، هەر ئەمەشە کە شاعیرێکی مەزنی وەک (هێمن) سەری لە پەیمانشکێنی لای کورد، سوڕماوە و وەک زەنگێکی لەرزێنەر، دان بە پەیمانشکێنیدا دەنێت، بەڵام بە ڕەوشتێکی ناپەسەند و نا بەجێ و نا سروشتیی کوردی دادەنێت، جا کاتێک کە دەفەرموێت:

لەناو کوردا نەبوو پەیمان شکاندن
لە کوێ فێربووی گوڵم پەیمانشکێنی (دیوانی هێمن٢٠٠٢: ١٤١)

ئەمە هانی خەڵکییە کە لە کلتوری باوباپیری خۆتان لا مەدەن و دورمەکەونەوە لێی مەبەستیشی بەدیاریکراوی (پەیمانپەرستی)یە.

**ئەنجام**

١- تێکستی هەردو چیرۆکە بەرتەنگی و کوردییەکە زادەی بیروباوەڕ و کلتوری هاوبەشن.

٢- پەیامی سەرەکی لە هەردو تێکستەکەدا، پەیمانپەرستی و ئەنجامەکەیەتی.

٣- یەکێک لەو بیروباوەڕە کۆنانەی کە تا ئەمڕۆش، مرۆڤ لە دێر زەمانەوە بۆ حەلکردنی کێشە ئاڵۆزو گرانەکان کە لە توانای خۆیاندا، نەبوە، پەنایان بۆ (بەخت)، بردوە.

٤- پەیمان و پەیمانپەرستی لای کوردیش، نرخ و بەهای خۆی هەبوە و بە ئەرکی سەرشان دانراوە.

٥- کۆتایی هاتنی چیرۆکە کوردییەکە زەنگێکی داچڵەکێنەرە بۆ خەڵکی کە پارێزگاری کلتوری بەرزی خۆیان بکەن و پەیمانشکێنیی چیرۆکە کوردییەکە، حاڵەتە نەک دیاردە.

**پەراوێز:**

(١) لە ڕاستیدا، وشەی (هۆ) ئەمڕۆ لە کوردیدا بە دو واتا: (سەبەب) و (وەسیلە) بەکاردێت. بۆ ڕزگاربون لەو گرفتە و زیندوکردنەوەی وشەیەکی زمانەکەمان کە ڕەگ و ڕیشەیەکی ئێرانی کۆنی هەیە، ئەویش (ئەبزار)ە.
لە پەهلەویدا، (awbzār) ە و لە فارسی نوێشدا، (افراز و اوزار). بڕوانە: (محمد معین١٣٨١: ٤٦)
ئەگەر قولتریش، بۆ ئێتمۆلۆژی (ئەبزار) بڕۆین ئەوا، (ئەبزار) گۆڕاوی (چار čar) و (چار)یش، داکەوتەی ڕەگی ( $\sqrt{}$ کر — و $\sqrt{kar}$)ە.
وشەی (چار)، پێش ئەوەی (ئەبزار)ی لێ بکەوێتەوە و ئێستاش بە تەنیا واتای (عیلاج) کە ئەمیش، هەر (ئەبزار) دەگەیەنێت بەکاردێت. بۆ نمونە، کاتێک دەوترێت: ئەم نەخۆشییە چاری نییە. واتە بە هیچ ئەبزار و وەسیلەیەک، چاک نابێتەوە.
لە (چار)، (چارناچار) سازێنراوە، هەر لە (چار)، (چارە)ش، بەم شێوەیە دروست کراوە: [چار+(-ەک)>چارەک>دوای پەڕینی /ک/ > چارە]
لە (چارە)ش، چەندین وشەی وەک: چارەسەر، چارەنوس، چارەڕەش، چارەکردن، بێ چارو ....... هیتریش) سازبون.

(٢) میللەتی بەرتەنگ لە دۆڵی بەرتەنگ کە دەکەوێتە ناوچە بەرز و بڵند و کوێستانەکانی ڕۆژئاوای زنجیرە کێوی (پامیر)، دەژین.
زمانی بەرتەنگی یەکێکە لە زمانە ئێرانییە نوێیەکانی سەروی ڕۆژهەڵات و دەچێتە گروپی: (شوغانی- ڕوشانی)یەوە و دابەش دەبێت بەسەر: (شوغانی، ڕوشانی، بەرتەنگی، ئۆرۆشۆری، سەریکولی). بڕوانە: (ت. ن. پاخالینە١٩٦٩)، (ای. م. آرانسکی١٣٧٩)، (پرویز ناتل خانلری١٣٩٣)

(٣) لە (١٩٧٨) دا لە دەمی دایکمان (خانمی تۆفیقە سوری ئەمینە فەندی) کە (١٩٣٠) لە دایک بوبو، ئەم تێکستەمان، وەرگرتوە.

(٤) ئێمە لەم باسەدا لەباتی زاراوەی (وێستگە) کە تەرجومەی (محطە)ی عەرەبییە، (سەرنجگە)مان لە [سەرنج+ سوفیکسی داڕێژەری ناوی شوێن (-گە)] سازاندوە و بەلامانەوە لە (ویستگە) زانستیترو چاکترە و زوتر، مەبەست دەپێکێت.

(٥) تێکستی ئەم چیرۆکە فۆلکلۆرییەمان لە کتێبی: (ڤ. س. سەکەلۆڤا١٩٦٠: ٦٠) وەرگرتوە.

(٦) ناوی ئەو باڵندە ئەفساناوییە کە (سیمرغ)ە، بە (سیمرخ)یش، بەرگوێ دەکەوێت. لە فۆنەتیکی کوردیداو لە هەندێ حاڵەتدا، گۆڕینی /غ/⇔ /خ/، ئاساییە و دەبن بە فۆنێمی هاوواتای یەکتری. ئەمەش، چەند نمونەیەکی تری ئەو وشانەن کە بە هەردو فۆڕمەکە لە ئارادان:

باغ ~ باخ، غونچە ~ خونچە، غەم ~ خەم، بنباغەڵ ~ بنباخەڵ، دەغڵودان ~ دەخڵودان و....... هیتریش.

(٧) هەڵبژاردنی گیانداریکی وەک (بۆق)، هەر وا سەرپێیی نەبوە. ڕا و سەرنجی خۆمان دەربارەی ئەم گیاندارە بەگشتی لە شیتەڵکردنەوە ڕوکن و لایەنە هەستیارەکان کە بە سەرنجگە ناومان ناون، نیشان دەدەین، بەڵام لێرەشدا، بە باشمان زانی پەنجە بۆ بنج و بناوان و ڕیشەی، واتە ئێتمۆلۆژییەکەشی ڕابکێشین:

لە زمانی فارسی ناوەڕاست، یا پەهلەویدا بە (بۆق) وتراوە:

(ڤاک vāk و وەک vak)، بڕوانە: (ر. ئابرامیان ١٩٦٥: ١٣٦)، (دیویدنیل مکنزی ١٣٨٨: ٢٨٣)

لە فارسی نوێدا بە بۆق دەوترێت: (قورباغە)، بنجی ئەم وشەیە، براوەتە سەر زمانی تورکی، بڕوانە: (محمد معین١٣٨١: ٨٤٤)

لە کوردیشدا هەندێ ناوچە بەتایبەتی لە شارەزور، وشەکانی: (قورباق و قورواق) بەرگوێ دەکەون.

دەربارەی وشەی (بۆق) تسەبۆڵۆڤ، نوسیویەتی: لە کوردیدا، (بەق و بۆق) بنجەکەیان (بەقە baqa)ی تورکییە، کە بە (بۆق) و (کیسەڵ)، دەڵێن و دەنگە سروشتییەکەیانە.

بە ڕای ئەو لەگەڵ (بَـقّ baqa)ی عەرەبیشدا کە واتای (چەنەبازی) دەبەخشێت، دەشێت بەراورد بکرێت و (قورباغە)ی فارسیشی لە بنجدا بەستۆتەوە بە (قورباغە)ی تورکی کە لە (قور qūr)، واتە (قیرە)، سازێنراوە، بڕوانە: (ر. ل. تسەبۆلۆڤ ٢٠٠١: ١١٦- ١١٧)

یەکێک لەو تیۆرییانەی دەربارەی ئەسڵی پەیدابونی زمان، پێی دەوترێت: (تیۆری لاساییکردنەوە). لەو بارەیەوە (رێفۆرماتسکی) نوسیویەتی: مرۆڤ بەرلەوەی زمان بگرێت، دەنگی سروشتی بەر گوێ کەوتوە، وەک: خورەی ئاو، ئاوازی باڵندە و .... هی تریش، هەوڵی داوە لاساییان بکاتەوە، بەڵام ئەو جۆرە وشانە ئەوەندە نین و کەمن و ئەم تیۆرییە، تەنیا ئەو شتانە دەگرێتەوە کە دەنگیان لێ وەبێت، ئەی ئەوانەی کە دەنگیان لێ نایەت، چ حسابێکیان بۆ بکرێت؟ سەرنجدان لە زمان، وا نیشان دەدات، کە ئەم جۆرە وشانە لەو زمانانەدا کە تازە گەشەیان سەندوە، زیاتر بەدی دەکرێت، مرۆڤی سەرەتایی بۆئەوەی بتوانێت لاسایی بکاتەوە، پێویستی بە قورگێکی کامڵبو بوە، بە قورگێک کە جاریَ خۆی نەگرتوە و کامڵ نەبوە، نەیتوانیوە، لاسایی بکاتەوە. بڕوانە: (آ. آ. رێفۆرماتسکی ١٩٩٧: ٤٥٨).

لە کوردیشدا، ژمارەیەک (ناو) لە دەنگە سروشتییەکان بەزۆری بە دوبارەبونەوەیان، کەمتریش بەتەنیا و هەندێ جار بە هەردو شێوەکەش، سازبون. ئەو ناوانە لەسەر بنەمای پەیوەندییان بە مرۆڤ و گیانداری تر و باڵندە و بێگانەوە هەیە، دەتوانین بەسەر (٤) چوار گروپدا، دابەشیان بکەین:

١- لای مرۆڤ: قاقای پێکەنین، قیرەقیڕ، پرخەپرخ، بۆڵە بۆڵ، قاوەقیژ، شاتەشات، مڵچەمڵچ و..... هی تریش.

٢- لای گیانداری تر، یا حەیوانات: نەڕەی شێر، حیلەی ئەسپ، لورە لوری گورگ، وەڕەوەڕی سەگ، بۆڕە بۆڕی گا، باعەباعی بەرخ، باڕە باڕی بزن، میاوە میاوی پشیلە، قرتە قرتی مشک، زەڕەزەڕی کەر، فیشکە فیشکی مار و ....... هی تریش.

٣- لای باڵندە: قوقەقوقی کەڵەشێر، گارەگاری مریشک، قیرەقیڕی قاز، جریوەجریوی چۆلەکە و ...... هی تریش.

٤- لای بێ گیان: خوڕە خوڕی ئاو، تکەتکی ئاو، گڤەگڤی با، ترپە ترپی دڵ، خیزەخیزی سنگ، جیڕەجیڕی ددان، پرتەپرتی چار و ...... هی تریش.

هەر لەم دەنگە سروشتییانەش، (ناوی ڕوداو)، سازبوە کە دەشێت لەسەر بناغەی ئەو ڕێگایانەی پێی پێکهێنراون بەسەر (٣) سێ گروپدا دابەشیان بکەین:

١- بە یارمەتی (سوفیکسی –اند و –ن)، وەک: قیڕاندن، پرخاندن، بۆڵاندن، نەڕاندن، حیلاندن، لوراندن، بۆڕاندن، باعاندن، باڕاندن، میاواندن، فیشکاندن و ..... هی تریش.

٢- بە یارمەتی [ناوی ڕوداوی (کردن)]، وەک: پرتە پرت کردن، گارەگارکردن، ترپەترپ کردن، جیڕەجیڕکردن، قرتەقرت کردن و هی تریش.

٣- بەیارمەتی (سوفیکسی –ین)، وەک: وەڕین، زەڕین و هی تریش.

لە زمانی کوردیشدا، بێچوی هەندێ مەل و باڵندەی ماڵی و کێوی، سازبوی دەنگە سروشتییەکانی تازە لەدایکبون و وردیانن لەگەڵ هەندێ سوفیکسی ناوی بچوککراوە و ناسکونازداری، وەک: (–ە، –ەڵە، –چک، –جک....هی تریش) ناو لەو باڵندانە، نراوە، وەک: جوجو، جوجەڵە، جوجک، جوچک و هی تریش. جگە لەوانە: (تاق تاقکەرە و کوکوختی)یش، هەر لەسەر بناغەی دەنگە سروشتییەکانیان ئەو ناوانەیان، پێ براوە.

ئێستا، ڕاکانی تسەبۆڵۆڤ کە یەکێکیان، گوایە (بەق و بۆق) سەرچاوەیان (قورباغە)ی تورکیە و ئەویتریان کە دەشێت لەگەڵ (بَقّ) عەرەبیدا، بەراوردیان بکەین بەڕاست و دروست، نازانین.

ئێستا، دەربارەی جەوهەری وشەی (بۆق) و ڤەریانتەکانی لە زمانی کوردیدا، گەیشتینە ئەو ڕاستییەی کە ڕەگ و ڕیشەیەکی قوڵی داکوتاوی ئێرانییە و لەسەر بناغەی دەنگە سروشتییەکەی ئەو ناوەی پێ براوە.

(٨) کێوی (قۆف)ی بەرتەنگی لە فارسیدا، بەرامبەرەکەی (کێوی قاف)ە.

لەبارەی ڕەگ و ڕیشە و جەوهەری (قاف)ەوە، نوسراوە:

(قاف Qāf)، هەندێ بنجەکەی بە (قەفقاز) و هەندێکی تر بە (کۆفkof)ی پەهلەوی دەزانن.

لێکدەرەوەکان، وای بۆچون کە ئەو کێوە، ئەوەیە کە دەوری زەوی گرتوە و ژێرەکەشی زمروتی سەوزە و سەوزایی ئاسمانیش، ڕەنگدانەوەی ئەوە، ئەم کێوە، بناغەی هەمو کێوەکانی تری زەمینە. هەندێ، وتویانە کە بەینی ئەم کێوە و ئاسمان بەقەدەر بالآی مرۆڤێکە، بەلای هەندێکیشەوە، ئاسمان و ئەو کێوە لەیەکیان، داوە. تاقمێکیش لەو باوەڕەدا، بون کە لە پشت ئەو کێوەوە جیهانی ترو زیندەوەری تر، هەن کە خودا، نەبێت کەس، ژمارەیان، نازانێت. ڕۆژ لەوێوە، هەڵدێت و لەوێشەوە، ئاوا، دەبێت، پێشینان بە (ئەلبورز)، ناویان، هێناوە. بڕوانە: (محمد معین ١٣٨١: ٨٢٣)

لەناو کوردیشدا، وتراوە: چەند شتێک، ناویان، هەیە، بەلاّم کەس، نەیبینیون، وەک: شاخی جابولقا [دیارە مەبەست (جبل القاف)ی عەرەبییە- نوسەر] و تەیری (عەنقا). (عەنقا) لە عەرەبیدا، بە (سیمرغ) کە باڵندەیەکی ئەفسانەیییە و گوایە ملی زۆر درێژ بوە. وتراوە بەڕای دوکتۆر محەمەد جەعفەر یاحەقی وشەی سیمرغ (عَنقا، سیترنگ) هەر هەمان (سیمن مورو) Sēn-mu پەهلەوییە کە واتای (مرغ سین) دەگەیەنێت. بڕوانە: (محمد جعفر یاحقی ١٣٨٨: ٥٠٣)

(٩) وشەی (مهر)، یا (مترا Mithras) لەم زمانانەدا، ئەمە شێوەکانی بوە: لە ئاوێستا و فارسی کۆندا (مەسیرە Mithra) لە سانسکریتییدا، (میترە Mitra) لە پەهلەویدا، (میترMitr)، بڕوانە: (محمد جعفر یاحقی ١٣٨٨: ٧٨٧)

## سەرچاوە:

### بەزمانی کوردی:

- دیوانی هێمن (٢٠٠٢)، سەنتەری برایەتی کوردستانی ئازاد، ئەستەمبول.

### بەزمانی فارسی:

- ای . م . ارانسکی (١٣٧٩) مقدمۀ فقه اللغۀ ایرانی، ترجمۀ کریم کشاورز، چاپ دوم، تهران.
- پرویز ناتل خانلری (١٣٩٣) تاریخ زبان فارسی، تهران.
- دیوید نیل مکنزی (١٣٨٨)، فرهنگ کوچک زبان پهلوی، ترجمه دکتر مهشید میر فخرایی، تهران.
- محمد جعفر یاحقی (١٣٨٨)، فرهنگ اساطیر و داستان وارەها در ادبیات فارسی، تهران.
- محمد معین (١٣٨١) فرهنگ فارسی، چاپ چهارم، تهران.

### بەزمانی عارەبی

- القرآن الکریم

### بەزمانی ڕوسی:

- آ. آ. ڕێفۆرماتسکی (١٩٩٧) سەرەتایەک لە زمانناسی، پێنجەم چاپ، مۆسکۆ.
- ت. ن. پاخالینە (١٩٦٩) زمانەکانی پامیر، مۆسکۆ.
- ر. ئابرامیان (١٩٦٥)، فەرهەنگی پەهلەوی- فارسی- ئەرمەنی- ڕوسی- ئینگلیزی، یەریڤان.
- ر. ل. تسەبۆلۆڤ (٢٠٠١) فەرهەنگی ئێتمۆلۆژی زمانی کوردی، یەکەم بەرگ، مۆسکۆ.
- ڤ. س. سەکەلۆڤا (١٩٦٠) تێکستە بەرتەنگییەکان و فەرهەنگ، مۆسکۆ، لێنینگراد.

ئێتمۆلۆژی چەند وشەیەک کە لەم باسەدا بەسەر کراونەتەوە:

ئەبزار، ئەوزار، چار، چارە ، سیمرغ، بۆق، قورباق، قورواق، کێوی قاف، یا قۆف، شاخی جابولقا، میهر، میترا.

## ملخص البحث

# العهد ونقض العهد في قصتين فولكلوريتين بعنوان واحد:" ابن الملك والضفدعة " عند " البَرْتَنْگ " و" الكورد " في ميزان المقارنة

الأستاذ الدكتور فاروق عمر صديق
العضو العامل في الأكاديمية الكوردية/ أربيل

إنَّ الأحداث والوقائع والكوارث الطبيعية وغيرالطبيعية المحكية تمثل مرآة صادقة تعكس الأفكار والمعتقدات وأنماط المعايش والعلاقات الإجتماعية للأيام الغابرة من حياة الناس، والتي قد ضمنت في تضاعيف ومضامين القصص والحكايات الفولكلورية من أجل تقديم النصح والتوجيه والإرشاد، وأخذ العبر والعظات التي تمخضت عن سرد تلك الأحداث في الحكايات.

فالبحث الذي بين أيديكم بحث أدبي مقارن مادته تحليل الأحداث والمواقف التي وردت في قصة" ابن الملك والضفدعة " الفولكلورية، وهي في نصين مستقلين، وبلغتين مختلفتين، غير أنَّ محتواهما واحد.

فالنص الأول: يعود لشعب" البَرْتَنْگ " الذي يقطن ويعيش في سفوح جبال "پامير" العَصيّة الشامخة.

والثاني: يعود لشعبنا " الكورد " ي حيث ينشر في هذا البحث لأول مرة.

وتبين لنا عند المقارنة أنَّ الاختلاف والتشابه في المحطات المشتركة بين النصين قد دلّا على أنَّهما من أصل واحد، هذا من جهة، ومن جهة أخرى تُنبئ عن افتراق الشعبين " البَرْتَنْگ " و"الكورد" في الماضي.

يقع البحث في مقدمة وخاتمة بأهم النتائج ومبحثين:

المبحث الأول: عرض لأهم المحطات الحساسة التي استحقت الوقوف عليها.

والمبحث الثاني: إجراء المقارنة الموضوعية بين الجوانب المتشابهة والمتخالفة في طبيعة وجوهر مضامين القصة في النصين .

## Abstract

Promise Keeping and Promise Breaking in Two Kurdish and Bartang Stories Carrying the Same Title “The Prince and the Frog”: A Comparative Study



**Professor Dr. Farooq Omer Sidiq**
**Active Member of the Kurdish Academy-Erbil**



Happenings, events, natural and unnatural disasters are actually indicators and reflections of manners and patterns of thinking, lifestyles and social relations of the people from the past moulded in folk stories aimed at giving moral lessons and advice to people.

The folk story “The Prince and the Frog” in two different texts, albeit identical in origin, are drawn as materials of this study. The first belongs to the Bartang Pamiris who live at the foot of Pamir mountains in Tajikstan, and the second is Kurdish which is published for the first time here.

Moreover, the similarity of focus and vision of both stories demonstrate that they stem from the same origin, but at the same time, it signals the separation and disconnection between the Kurds and the Pamiri Bartangs.

The present study consists of a preliminary, conclusions and two parts. The first part tackles the sensitive foci and the visions are explored which we need to cover. The second chapter investigates the nature and essence of the two stories are delimited and then compared.


نووسەری ئەم توێژینەوەیە لە نووسینەکانی خۆیدا هەموو (و)ێک بە یەک (و) دەنووسێ ، ئێمە بۆ ڕێزگرتن لە بیروڕای نووسەر دەستکاری توێژینەوەکەمان نەکرد و وەکو خۆی بڵاومان کردەوە - دەستەی نووسەران-

# گۆرانی و مەتەڵی فۆلکلۆری لە ناوچەی باڵەکایەتی

د. حسێن غازی کاک ئەمین
بەشی زمانی کوردی/ کۆلێژی پەروەردە /
زانکۆی سەلاحەددین-هەولێر

**پوختەی توێژینەوەکە**

توێژینەوەکــــە دەربـــارەی ئـــەدەبی فۆلکلۆرییـــە و گرنگـــی و تایبەتمەندیی خۆی هەیە لە ئەدەبی کوردیدا، لەبەر ئەوەی ناوچەی باڵەکایەتی توێژینەوەی لەم بابەتەی لەسەر نەکراوە و کەچی زۆر دەوڵەمەندە لە فۆلکلۆر بە هەموو جۆرەکانییەوە لەبەر دووری و سەختیی ناوچەکە توێژینەوەی کەم لەسەر کراوە، بۆیە بەباشمان زانی توێژینەوەیەکی زانستی و ئەکادیمی لەسەر هەموو جۆرەکانی فۆلکلۆری ناوچەی باڵەکایەتی بکەین یەکەم جاریش لەسەر (گۆرانی و مەتەڵ) دەنووسین، چونکە جێگای بایەخ بوو بەلای ئێمەوە.

توێژینەوەکە لە سێ تەوەر پێکهاتووە.

**بەشی یەکەم** کورتە باسێکی فۆلکلۆر و چەمک و پێناسەی فۆلکلۆر و سنووری توێژینەوە واتە ناوچەی باڵەکایەتی.

**تەوەری دووەم** گۆرانی بە هەموو جۆرەکانییەوە کە بریتییە لە گۆرانی (شایی و دروێنە و، مەشکە ژاندن و، بێریاتی، جۆنی کوتان، خەواندنی منداڵ و، بە لۆرە و، ئایینی و، مەتارێز، بووک گواستنەوە).

**تـەوەری سـێیەم** خۆی لە مەتەڵ بە هەموو جۆرەکانییەوە دەدۆزیتەوە کە تایبەتن بە (مرۆڤ، ئاژەڵ، سروشت، خۆراک و کەرەستەکانی، ئایینی، دروێنە و کەرەستەکانی، رووەک و سەوزە و میوە، خانووبەرە و کەرەستەکانی، کەرەستەی رووناککەرەوە، رستن و چنین، هەروەها مەتەڵی هەمەجۆر).

لە کۆتایی توێژینەوەکە ئەنجام و لیستی سەرچاوەکان خراونەتەروو.

**پێشەکی**

ئەدەبی فۆلکلۆر و بەرهەمە کۆنەکانی هەر میللەتێک، بەشێکن لە مێژووی نەتەوەکە و جێگای توێژینەوەیە لەم سامانە دەوڵەمەندە بۆ ئەوەی کۆڵانە تاریکەکانی ئەمرۆی ئەدەبی فۆلکلۆر بەرەو هەنگاوی گەشتر بنێت، هەر لەبەر ئەمەشە کە گەلان بە پەرۆشەوە پارێزگاری لێ دەکەن.

گەلی کوردیش بە گشتی و ناوچەی باڵەکایەتی بە تایبەتی خاوەن گەنجینەیەکی دەوڵەمەندی فۆلکلۆرە، بۆیە ناوچەکە شیاوە بۆ ئەوەی توێژەران توێژینەوەی زیاتری لەسەر بکەن بۆ ئەوەی ئەو سامانەی لە دەمی باوباپیرانمان وەرگیراوە و ماوە لە فەوتان ڕزگاری بکەین و بیانخەینە سەر کاغەز بۆ ئەوەی خزمەتێکی گەورە بە ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی بکەین و فەرامۆشی نەکەین.

بەهۆی ئەوەی ناوچەی باڵەکایەتی ناوچەیەکی شاخاوی و سەختە و پێکهاتەی جوگرافیای لە دۆڵ و گرد و زەوی و ڕووبار و کوێستانی زۆری تێدایە ناوچەکەش شیاوە بۆ کشتوکاڵ و ڕەزگەری خەڵکەکە توانیویانە داب و نەریتی خۆیان بپارێزن و زمانە ڕەسەنەکە بە زیندوویی بهێڵنەوە. بۆیە پێویستە لەسەر نووسەران و توێژەران گرنگییەکی زۆر بەو کەلتوورە بدەن و ئەوەی نەزانراوە و نەبینراوە بە خوێنەری کوردی ئاشنا بکەین.

ئەم هۆیانە وایان لێ کردین کەوا گرنگیی تایبەت بەم بابەتە بدەین بۆ بەدەرخستنی لایەنە شاراوەکان و نەبیستراوەکان.

سنووری توێژینەوەکە: گۆرانی و مەتەڵەکانی سنووری ناوچەی باڵەکایەتی.

**ئامانجی توێژینەوەکە:** ئامانجی لیکۆڵینەوەکە بریتییە لە بەدیارخستنی ئەو لایەنانەی کە لە ئەدەبی فۆلکلۆری ناوچەکەدا هەیە و بخەینە بەر دیدی خوێنەرانی ئەم بوارە، بەتایبەتی گۆرانی و مەتەڵ و جۆرەکانی.

**ئاستەنگەکانی ڕێگەی توێژینەوەکە:** هەڵبژاردنی ئەم بابەتە کەمێک زەحمەت بوو، لەبەر دووریی ڕێگاکە و نەمانی پیاو و پیرەژنە بە تەمەنەکان لە ژیاندا، بۆیە پێویستی بە گەڕانێکی زۆر هەبوو بۆ دۆزینەوە و دەستنیشانکردنی کەسانی شارەزا لەم دوو بابەتە بۆ دۆزینەوەی کەسانی شیاو لەم بابەتە.

**میتۆدی توێژینەوەکە:** بۆ ئەوەی توێژینەوەکەمان لەسەر بنەمای میتۆدی زانستی و ئەکادیمی بڕوات هەردوو میتۆدی وەسفی و شیکاریمان بەکارهێناوە، میتۆدی وەسفیمان بەکارهێناوە بۆ ئەوەی لایەنی تیۆریی توێژینەوەکە ڕوون بکەینەوە و میتۆدی شیکاریشمان بۆ گۆرانی و مەتەڵەکان بەکارهێناوە بۆ ئەوەی لەبەر ڕۆشنایی ئەم میتۆدە لە بەرهەمەکان بکۆڵینەوە و شیبکەینەوە.

**هۆی هەڵبژاردنی بابەتەکە:** هەڵبژاردنی ئەم بابەتە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە لە ئەدەبی فۆلکلۆری، بە تایبەتی لە ناوچەی باڵەکایەتی هیچ لێکۆڵینەوەیەکی لەم جۆرە نەکراوە بە کوردی و زۆر بە کەمی لێکۆڵینەوەی لەسەر کراوە، بۆیە بە چاکمان زانی توێژینەوە لەسەر ئەم بابەتە بکەین تاکو تەمومژی کەم بکەینەوە لەسەر بابەتەکە و بۆ خوێنەری ڕوون بکەینەوە و لە هەمان کاتدا لە فەوتان بیپارێزین.

## بەشی یەکەم: لێدوان دەربارەی زاراوەی فۆلکلۆر

### ١-١: کورتە باسێکی تەوەری یەکەم فۆلکلۆر لە ناوچەی باڵەکایەتی:

ئەو ناوچانەی کە دوورە دەستن و دوورن لە شارستانییەت زیاتر فۆلکلۆر گەشەی تێدا دەکات، بە حوکمی ئەوەی خەڵکی ئەم ناوچانە بەتایبەتی ناوچەی باڵەکایەتی کە هەموو سنوورەکەی خۆی لە ناوچەی شاخاوی و کوێستان دەبینێتەوە، لە کۆن بەهۆی نەبوونی ڕێگاوبانی پێویست و نەبوونی قوتابخانە و کارەبا و ئەو شتانەی هۆکارن بۆ پێشکەوتن، خەڵکی ناوچەکە زیاتر خەریکی بەخێوکردنی مەڕو ماڵات و

چێڵ و مانگا و پەلەوەری وەکو مریشک و عەلەشیش و مراوی و قازیان بەخێو دەکرد و خەریکی ڕاوکردن و بەرێژەیەکی زۆر خەریکی ڕەزداری و تووتن چاندن و گەنم و جۆ و جۆخین و دانانی ئاشی ئاو بۆ گەنم لێکردن لە ئاش بۆ ئارد و دەستارکردنی بۆ ساوار و کەرەستەی تری خواردن، هەروەها خەریکی چاندنی سەوزە و میوە بە هەموو جۆرەکانییەوە و وشک کردنی بۆ وەرزی زستانان واتە مشووری هەر چوار وەرزیان خواردووە، جا لێرەدا شەوانە خەڵکی گوندەکان لە ماڵێک لە ماڵەکان کۆدەبوونەوە بۆ گوتنی گۆرانی و حەیران و گەڕەلاوژە و یاریکردن و مەتەڵ و پەندی پێشینان و قسەی نەستەق و حەکایەت ((فۆلکلۆری کۆن و ڕەسەن کەلەپوورێکی دەماودەمییە دانەرەکەی نادیارە))(کامەران موکری، ١٩٨٤،ل٤) واتە هەر بابەتێکی فۆلکلۆر کە باس دەکرێ خاوەنی سەرەکی دیار نییە و دەماودەم دەگێڕدرایەوە لە دەمی یەکێک بۆ یەکێکی تر هاتووە هەندێکیان ماون و هەندێکیان فەوتاون و نەنووسراون یاخود لەلای هەندێ کەس بووە خەڵکی تر نەیزانیوە و لەژیاندا نەماوە و لەگەڵ مردنی فەوتاوە. فۆلکلۆر لەناو هەر نەتەوەیەک جێگای خۆی دەکاتەوە و خۆی دەگونجێنێ لەگەڵ کەڵچەری ناوچەکە ئەگەر خۆی نەگونجێنێ ئەوا فۆلکلۆر نییە ((شەقڵی ئەو گەلەی پێوەیە، کە خولقێنەریەتی))(کامەران موکری،ل٦) واتە فۆلکلۆری باڵەکایەتی شەقڵی ژیانی ناوچەکەی پێوە دیارە بە هەموو جۆرەکانییەوە ((ئەدەبی کۆمەڵی ئادەمیزادی کۆن لە نەوەییێک بۆ نەوەیێکی تر بە میرات ماوەتەوە و، بەناو مێشک پارێزراوە و بەدەم ئەزبەر گێڕراوەتەوە))(د. مارف خەزنەدار، ٢٠٠١، ل١٥٨) واتە ئەم ئەدەبە لەناو مێشکی مرۆڤەکان پارێزراوە و لەبەرکراوە لە نەوەیەک بۆ نەوەیەک ماوەتەوە بۆتە سەرچاوە و ناسنامەی گەلی کورد و بناغەی ئەدەبی کوردی لەسەر بنیات نراوە.

**تەوەری دووەم:**

**١-٢: چەمک و پێناسەی فۆلکلۆر:**

وشەی فۆلکلۆر وشەیەکی لاتینییە هەر لەکۆنەوە بۆ بەرهەمی کۆنی نەتەوەکان بەکارهاتووە، بۆ یەکەم جار لای زانای ئینگلیزی (ولیەم تۆمس) بەکارهاتووە وشەی (folk) واتە خەڵک وشەی (Lor) واتە زانستی گەل (کامەران موکری، ١٩٨٤، ل٢٩).

هەروەها لەبارەی فۆلکلۆر لە نەتەوەیەک بۆ نەتەوەیەکی تر جیاوازە ((ئەم بەرهەمە داهێنەرانەیە کە دەماودەم منداڵ لە باوک و دایکی گوێی لێ دەبێ و ئەمێنێتەوە. هەر لەبەر ئەمەیە کە ئەدەبی فۆلکلۆر بە بەرهەمی تاکە کەس دانانرێ ئەدرێتە پاڵ هەموو میللەتەکە))(عیزەدین مستەفا رەسول، ٢٠١١، ل٦) واتە فۆلکلۆر خاوەنی دیار نییە خاوەنەکەی میللەتە ئەوەی ئێمەش خاوەنی نییە دەماودەم گێڕدرایتەوە و لەبەرکراوە. بەرهەمە فۆلکلۆرییەکان خاوەنەکانیان دیار نین و کەس نازانێت بەرهەمی کێنە و کێ دایناون (شێخ محەمەدی خاڵ، ٢٠٠٧، ل٨) واتە خاوەنی سەرەکی نادیارە و گەل خاوەنییەتی ((ڤان جەنپ ی فەرەنسی Van Gennep لەگەڵ چەند توێژەرێکی ئەوروپای رۆژئاوا فۆلکلۆر بە (ئەثنۆگرافیا) دائەنێن، بەڵام ئەڵمانەکان زانستی فۆلکلۆر ئەبەستنەوە بە لێکۆڵینەوە نەتەوایەتی و خۆماڵییەکان، وە هەشە کە فۆلکلۆر تەنیا بە هۆنراوەی سەرزاری خەڵکی دادەنێ)) (Dundes, 1965, p2) واتە هەر نەتەوەیەک لە سۆنگەی خۆیەوە دەڕوانێتە فۆلکلۆر و دیاری دەکات.

**١-٣: سنووری ناوچەی باڵەکایەتی:**

ناوچەی باڵەکایەتی سنوورێکی فراوان و ناوچەیەکی سەختی شاخاوی هەڵکەوتووە لە باکووری ناوچەکە شارۆچکەی حاجی ئۆمەرانە، لە گوندی شیوەڕەش کە هاوسنوورە لەگەڵ وڵاتی ئێران، عەشیرەتی بەگزادە جیا دەبێتەوە، لە رۆژئاوا تا گوندی بێشە واتە

گــەروێ بێشــی لــە عەشــیرەتی برادۆســت جیامــان دەکاتــەوە، لــە ڕۆژهەڵاتیش تاکو گوندی پردە شاڵ و چیای قەندیل جیامان دەکاتەوە لەگەڵ ناوچەی پشدەر و عەشیرەتی ئاکۆ، ناوچەی باڵەکایەتی لەڕووی پێکهاتــەی ئیدارییــەوە لــە ناوەنــدی قــەزای چۆمــان و چــوار ناحیــە پێکهاتووە، کە هەریەک لە ناحیەی گەڵاڵە کە مێژووی بوونی بە ناحیە بۆ ساڵی ١٨٩٠ دەگەڕێتەوە واتە ١٢٩ ساڵ بەر لە ئێستا ناحیە بوو، ناحیەی حاجی ئۆمەران ١٩٧٥ بووە بە ناحیە و ناحیەی سمیلان لە دۆڵی ڕوستێ لە ساڵی ٢٠٠٠ بووە بە ناحیە هەروەها ناحیەی قەسرێ کە لە ساڵی ٢٠٠٧ بووە بە ناحیە واتە سنووری باڵەکایەتی لە ناوەندی قەزای چۆمان و چوار ناحیە و ٩٦ گوند پێکهاتووە و بەسەر پێنج دۆڵ و ناوچــە دابــەش بــووە، کــە بــریتیین لــە (دۆڵــی باڵــەییان، دۆڵــێ شیوەزووری، بەری سەکرایەتی، دۆڵی ڕۆستێ، سنووری قەسرێ) (گۆران شاخەوان، ٢٠١٥، ل١٨، ١٩، ٢٤، ٣٣).

## بەشی دووەم

### تەوەری یەکەم

### ٢ـ چەمک و پێناسەی گۆرانی:

گۆرانی لە ئەدەبی فۆلکلۆر بریتییە لە دەربڕینی هەست و سۆزی گۆرانی بێژ لەبەرامبەر تاکێک یاخود کۆمەڵەیەک بۆ خۆشەویستی و ماندوو حەساندنەوەی گوێگرەکان کە زیاتر خۆیان لە ئیش و کار دەدۆزییەوە ((گەلیش لە ڕاستی یا خۆی خولقێنەری بلیمەتی بەشی زۆری گۆرانییــە، گــۆرانی ئاوێنــەی گیــانی میللــەت و گــەنج و بیــر و ئامانجیەتی، هەمیشە قووڵیی هەست و عاتیفە و لیریک، خۆی لە بەشی تری بەرهەمی ئەدەبی جیا ئەکاتەوە و تەنیا ئاوێنەی هەستی تایبەتی دانەرەکەی نییە، بەڵکو هەستی فراوانترین کۆمەڵی خەڵک دەرئەبڕێ، گــۆرانی لــەناو ژانرەکــانی ئــەدەبی فۆلکلــۆرا جێگەیــەکی گرنگــی هەیــە، هاوشــانی ئــادەمیزادە لــە بێشــکەوە تــا ژێــر خــاک، هــاوڕێی ژیانییــەتی، هاوبەشــی ئیشــکردنی ئــادەمیزاد. شــیرینکەری جــەژن و شــاییە، وەک

تنۆکی شـادی لـەکاتی حەوانـەوەدا زاخـاوی مێشـک ئەداتـەوە، گـۆرانی هاودەمی ئافرەتـان و شـایی نـاو خێزان و جوانی بـەیان و خـۆر ئـاوا و ئێوارانە))(شوکریە رەسوڵ، ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی، ل١١٥).

بۆیە دەبینین لە سەرەتای ژیانی ئادەمیزاد بەتایبەتی میللـەتی کورد ژیـان لەسـەر خـۆی بـووە ئـەرکی قـورس بـووە بۆیـە پـەنای بـۆ شـتێکی دەروونی بردووە کە دەروون و گیانی پێ بحەسێتەوە و وزە ببەخشێ بەخۆی و هاوەڵانی لەکاتی ئیشکردندا.

هـەروەها دەبێتـە هـۆی ئـەوەی کاتەکـە بەخۆشـی و شـادی بـەڕێ بکـات، هـەروەها لـە گـۆرانی کوردیدا ((زۆر شـەقڵی ئـاینی و ئیشـکردن هەیە))(عیزەدین مستەفا رەسوڵ، لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی، ١٩٧٩، ل٤٤).

گـۆرانیش لـە فۆلکلـۆری کوردیـدا دابـەش بـووە بەسـەر گـۆرانی کـارکردن و وەکو: دروێنـە، سـاوار کوتـان، دەسـتاڕ هـاڕین، شـوانکاری، جووتیاری، مـازووچنین، مەشـکەژان، بێریـاتی، ڕاوکـردن، بەشـێکی تـری گۆرانی بۆنەکانە کە خۆی لە گۆرانی، منداڵبوون، خەتەنـەکردن، شـین و لاواندنەوە، بەشێکی تری گۆرانی یاریکردن، لایەلایە، دڵداری.

بۆیـە لـە توێژینەوەکـە سروشـتی باڵەکایـەتی چونکـە ناوچەیـەکی شاخاوییە فۆلکلۆر و ڕێگای هاتوچۆی لەسەرەتا زۆر کەم بووە تەنیا بە وڵاخ و پیـادە بـووە بۆیـە دەبینـین لـەڕووی فۆلکلـۆر زۆر دەوڵەمەنـدە دووری شـوێن لـە شارسـتانییەت دەبێتـە هـۆی دەوڵەمەنـدی فۆلکلـۆر چونکە خێزان و تاک بەرپرسیارییەتی ژیان لە ئەستۆی خۆی دەگرێ و بۆ ئەمەش ئەم هونەرە جوانەی فۆلکلۆری لێ دەخولقێنێ.

**تەوەری دووەم: جۆرەکانی گۆرانی لە ناوچەی باڵەکایەتی:**

**٢-١: گۆرانی دروێنەی گەنم و جۆ:**

هـــــــەدارا دارا دارا، دارێ سـەرچیــــــلە و چـــــــۆما
کەزیلــەت مـــاری ئاویـــا، خـــۆی داوێتـــۆ لـــە گۆمـــا
بـــــەژنێ تــــۆم دارا دارا هـــــێ، وەی دارێ شــــیوێ
بەژنێ تۆم دارا دارا هێ، وەی دارێ شیوێ شێخانێ شێخانێ
پیلـــی یـــارێم دادەســـت نـــێن دەرم کـــەن لـــە دونیـــایێ
پیلـــی یـــارێم دادەســـت نـــێن بمکەنـــە کوێخـــای دۆمـــان
هـــــــــەدارا دارا دارە دارێ عـــــــــالم لەبنـــــــــە
بە شـــەخصی فەقـــێ و مـــەلا شـــۆڕە گـــوڵ یارا منـــە
(حەمید گەلاڵەیی)

**٢-١: گۆرانی دروێنەی گەنم و جۆ :**

مەبەستی ئەم گۆرانییە کە لەکاتی گەنم دروێنە دەگوترا باس لە بەژن و باڵای یار دەکات کە بە داری سەرچیلەی چواندووە واتە داری توخوبی نێوان باخچە و زەوییەکانە، کەزی پرچت وەکو ماری ئاوییە خۆی داوێتە ناو گۆم بەژنەکەت وەکو داری شیوێیەوانە داری ناو کەند کە لە شیوی شێخانی هەیە کە ناوی گوندێکە لە بناری چیای حەسەن بەگ ئەگەر یارم ڕادەست بکەن با لە دونیای دەرم کەن و بمکەنە کوێخای دۆمانیش ڕازیمە بەو دارەی کە خەڵک لەبنی دانیشتییە بەشەخصی فەقێ و مەلا واتە سوێند بە کەسایەتییان دەخوات کە شۆڕە گوڵ یاری ئەوە.

**٢-٢: گۆرانی دروێنەی نیسک و ماش و نۆک:**

بـــەژنـــــــێ تـــــــــۆم دارا دارا
دارێ ســـەرچیلـــــە و چـــۆمـــــا
کـەزیلـــــەی مـــــاری ڕەش بـــوو
خـــــۆی داوێتـــــۆ لـــــە گۆمـــــا

قاسید و بازرگانم
سبحەی دەڕۆم بەیانی
کارەشێ خۆم لەپێ کرد
گۆریم بەستن لە ڕانی
بەسەر دەبرێ بەسەردا
بەسەر دەشت و نیو دەشتێ
پێم دەرکێفێ بۆرەی نا
خەزێم زێڕم گەیشتێ
بەسەر دەبرێ بەسەردا
بەسەر دەشتی ماوانێ
سەد حوشتری بە بار بوو
هەمووم نارد لۆ لاجانێ
هەمووم دان بە دەرزییەکێ
شۆر پێ بکا و ڕوومانێ
یاخوا دەرزیت لێ پسێ
دەگەر داوەتێ هەڵدانێ
بەژنێ وێم دارا دارا
دارێ سەرچیلە و چۆما
کەزیلەی ماری ئاویا
خۆی داوێتۆ لە گۆما
کەزیلەی ماری ئاویا
خۆی داوێتۆ لە گۆما
(یەحیا بەگی ڕۆستایی)

**٢-٣: گۆرانی درووێنە:**

هە دارە دارە دارێ سەرکەندە شینێ
یارەبی خێرێ لە گوڵەی نەبینێ
هەدارە دارە داربی سەرچیلە و چۆمان

سەماڵەت بەسەری تۆ کەتمە بن باری لۆمان
هەستەک هات لە بانێیمە یار بوو ڕاکرد شەوێری
بە چاوی خۆم نەدیبوو گەر نوستم دەخەوێم دی
دەچمە سەربالێ تەیران ئاسمان چەرخ و فەلەکە
دونیا لەمن خەرابوو بۆ چاوی ڕەش بەڵەکە
هەڵگورد دەبڕۆ هەڵگوردە هەڵگوردی بڵندو نەوی
چەندت برووسک وێکەوێ بەردت لێ ببنە زەوی
(حسێن ئەبوشوارب گەلاڵەیی)

**٢ـ٤: گۆرانی جۆنی کوتان:**

منجۆلی لێرەو لەوێ... هەی هەی منجۆلی
بە جۆت خەومان لێ کەوێ... هاوار منجۆلی
منجۆلیم هینە و مینا... دەی دای منجۆلیێ
هەتا چووم جلکم هێنا.... هەی های منجۆلیێ
منجۆلیم شەکر و شەبە... هاوار منجۆلیێ
چاوجوانێ لەکن مەبە.... دەی دای منجۆلیێ
مێردە گولەکەی بەتمەسەبە... هەی های منجۆلیێ
مێردە گولەکەی بەتمەسەبە... دەی دای منجۆلیێ
منجۆلیەکەم لە خەلانێ... هاوار منجۆلیێ
منجۆلیەکەم لە خەلانێ... دەی دای منجۆلیێ
منجۆلیەکەم منجۆلیێ... دەی دای منجۆلیێ
کچێ لە چۆلیان دەنوستم... هەی های منجۆلیێ
چۆکم دا وەرز هارستم.... دەی دای منجۆلیێ
منجۆلیێ وەرز هێخستم... دەی دای منجۆلیێ
منجۆلیێ وەز هێخستم هاوار منجۆلیێ
منجۆلیەکەم هینە و مینا... دەی دای منجۆلیێ
منجۆلیەکەم هینە و مینا... هاوار منجۆلیێ
(زبێر باڵەک)

لێرە مەبەستی گۆرانییەکە لە جۆنی کوتانە کە منجۆلی ئەو ژنەیە کە جۆی دەکوتێ و جۆنی کوتی تر پیاوەکەیە کە گۆرانی بەسەردا دەڵێ.

**٢ـ٥: گۆرانی بێریاتی**

هۆی دەرێم بێریلی دەی دەی جا بێر لە کەندێدایە
مـــەرێ بـــابێ تـــۆم دەلال وە تـــالآنێ لـــێ دایـــە
وای دەرێـــــم بێریلـــــێ وای بێـــــریلم دوونـــــە
وای دەرێـــــم بێریلـــــێ وای بێـــــریلم دوونـــــە
دە کـــــورە بـــــەرم دە وەی وەڵداشـــــم چووینـــــە
دە کـــــورە بـــــەرم دە وەی وەڵداشـــــم چووینـــــە
وەی دەرێـــــم بێریلـــــێ وەی بێـــــریم گەلـــــەکن
وەی دەرێـــــم بێریلـــــێ وەی بێـــــریم گەلـــــەکن
وەی بێریـــــێ گچکۆکـــــە وەی چاویـــــە بەڵـــــەکن
وەی بێریـــێ گچکۆکە وەی چـــــاویە بەڵـــــەکن
(حەمید گەلاڵی)

ئەم گۆرانییەش لەکاتی هاتنەوەی مەڕو ماڵاتەکانی بێری ڕووی تێ دەکەن و مەڕو ماڵات لە دووری هەوار دەدۆشن بە زۆریش بێری ژنن دووانن.

**٢ـ٦: گۆرانی مەشکەژاندن:**

مەشـــــکم مەشـــــکێ گامێشـــــێ
چەنـــدم شـــان و قـــۆڵ دێشـــێ
چەنـــدم کردیـــە مەشـــکەژەنی
ســـــەرم بۆتـــە تەپڵـــە چـــوێنی
حـــــازاب نبـــــی پـــــێم نـــــامینی
هـــەی ماڵـــە بـــابێ مـــن بـــی

بـــار دەکـــەین بـــۆ جانـــدارە
ڕوونی دەگــــــرین بــە بـــارە
لــەبــۆ پـــایـــــزە هـــــەوارە
هــەی عــەمرو چــاوێ مــن بــی
مەشـــــکم مەشـــکێ نێریـــانی
دەژیـــــــنم لـــــــە تـــــــەلانی
هــەی عــەمرو چــاوێ مــن بــی
هـــــەی ماڵــــــە بابــێ من بی
(یەحیا بەگی ڕۆستایی)

بـە زۆری ئافرەتـان ئـەم کارەیـان ئـەنجام داوە و مەشـکەژاندن جوانییـەکی زۆر بـە ژن دەبەخشـێ هـەموو گیانی دەجوولێ عەشـق لـە بەرامبـەری دروست دەکات وێنەیـەکی هونـەری جـوان دەبەخشـێ بـەو کەسەی بەرامبەری تەماشای بکات.

**٢ـ٧: مەشکە ژاندن:**

مەشـــــکم مەشـــــکێ بـــــەرانی
ئـــــەوا لـــــــەبن تــــــەلانـــــی
مەشـــکم مەشـــکێ گـــایێ ســـۆر
لـــــە کابـــــانێ زەرد و ســـــۆر
مەشـــــکم مەشـــــکێ مانگـــــایێ
بـــــەبێ تـــــۆ ســـــەبرم نـــــایێ
مەشـــــکم مەشـــــکێ بـــــەرانی
ئـــــــەوا لـــــــەبن تـــــــەلانی
بـــــووک پیـــــرۆزی خـــــودانێ
بـــــووک پیرۆزی خودانێ
(زرار ڕایەتی)

لێرە ئەوەی گۆرانییەکە دەڵێ باس لە جۆری مەشکەکە و شوێنی مەشکەژانەکە دیاری دەکات.

**٢ـ٨: گۆرانی خەواندنی منداڵ:**

رۆڵـە لای لای بەرخەکـەم لای لایـە
کۆرپـــەی ئـــازیزم دەلای لایـــە
رۆڵـــە شـــیرنەکەم دەلای لایـــە
ئـــەوە بەیانـــە بـــەیان بەردانـــە
رۆڵـــە شـــیرنەکەم دەلای لایـــە
رۆڵـە کوردسـتان چـاوی لـە رێتـە
هیـوای دوا رۆژی پێتـە دەلای لایـە
رۆڵـــە دەلای لا بـــەرخم دەلای لای
لای لایـــێ بەرخەکـــەم دەلای لایـــێ
لای لایـــێ بەرخەکـــەم دەلای لایـــێ
کۆرپەکـەی دایـێ لـۆ خـەوت نـایێ
بـابی بـێ سـەرت هـیچ دەنگی نایـە
خـــودایی هـــەژاران بـــەهانام نـــایێ
سـووتا و بـرژاوم لـۆ خـەوت نـایێ
رۆڵـــە دەلای لا بـــەرخم دەلای لای
(خەدیجە مام ئەحمەد گەلاڵەیی)

لێـرەدا دایـک لـە خـەمی کۆرپەڵەکەیـەتی کـە خـەوی لـێ ناکـەوێ بەدیاری گۆرانی بۆ دەڵێ بۆ ئەوەی خەوی لێ بکەوێ دایک دەسووتێ ئەگەر کۆرپەڵەی خەوی لێ نەکەوێ ئیسراحەت بکات.

**٢ـ٩: گۆرانی بەلۆرە:**

گۆرانی بەلۆرە ئەوەیە کاتێک کورو کچ یەکتری لە کوێستانان بانگ دەکەن واتە کچ بانگی کوڕ دەکا بەڵام بە پەنجە لە گەرووی خۆی دەدا

بۆ ئەوەی سۆزی خۆشەویستی لە دەنگی دەنگ بداتەوە و هەستی کوڕ بجووڵێنێ.

کچ:

لاوی مـــــن لـــەوی بـــــەری
تـوخـــوا وەرە ئـــەوی بـــــەری

کوڕ:

حـــەیران خۆزیـــە بـــەخۆزی داران بریـــەک بـــە
بریـایێ بریـنـداران ئـەمن ئەوسـاڵ فەسـلی بـەهارێ
ڕاوەکـــم دانـابـــا لـــــە کێلـــێ ی کـــویێستانا
لـە تینـەکانگانێ لـە چەقـەڵی فـەقێ برایمـی لـە بەستێ
مـــاربێنێ دەبـــا بێمـــەوە گـــەرەی بـــەردە بـــووکی
ئـەمن کارەمـامزێ خـۆ شـۆڕ دەکـردەوە لـەبۆ گـۆرە
دێـــری شـــۆڕم دەکـــردەوە مـــەزرێ گـــەلاڵێ
لـــە عـــاردم دەدا لـــەناو مـــەزری گـــەلاڵێ
ڕاوی عالـــەمێ لـــە دوو تـــەیر و تاشـــی بـــوو
ئـــێ منـــێ غـــەریبی لـــەدوو کـــار مـــامزێ بـــوو
کـــە شـــوانان دامـــەن دەهێشـــتنەوە بـــۆ جـــوانێ
کە خۆ دەشـەقینی لـەدوای مێگـەلان چیبکـەمێ نایگـاتێ

(یەحیا بەگی ڕۆستایی)

**٢-١٠: گۆرانی بەلۆرە**

کـــچ دەڵـــێ کـــورە کـــوڕ دەڵـــێ کچـــێ
هـــەلاڵ بـــوونی لـــەناو سوســـینا
شـــین بـــوون لـــەناو تـــەرازنا
دەبـــا لـــەبۆت بکـــەم مـــەتحێ ژنـــا
با لەبۆت بکەم مەتحێی جوانیێ شیرین
کیـــژ پـــۆرەتێ بـــەرچێر نەخشـــین
کیـــژ بـــۆ ڕەتـــی بـــەرچێر بـــەخاڵ

لـــە هـــەینی نووســـیوە گەوهـــەر
لــە هــەین نووســیوە ســێ و دووە
کـــچ دەڵـــێ بـــەناز و هـــەر زووە
کـــاکی گـــەورەم لـــە مـــاڵ چـــووە
هـــێ کـــورِە هـــەتیم بـــرِۆ دەرێ

کورِ دەڵێ:

هـــێ کـــچێ خـــرِ کـــەڵـــێ
بـــەژنـت بیـا ســەر قـۆتـەڵـێ
بینـە ماچـت کـەم کـاک چ نـاڵێ
بـــە نـــارِازی ناچـــم لـــەوێ
تـا لەسـەر سینگت نەکـەم خـەوێ

کچ دەڵێ:

خـــۆم دەکەمـــە مـــەمارە درِی
وەهاوانیشـــت هــــــەر بفـــرِی
هـــیچ زەفـــەرت بـــەمن نییـــە
هـــێ کـــورِە هـــەتیم بـــرِۆ دەرێ

کورِ دەڵێ:

هێتیمەکـــــێ دەیـــنـــــم
تەورۆکـــەی لـەگـــــەڵ دینــم
لــــەرِوو پێکانـــــت دەردێــــنم
بێنـــە کـــیش دەنگـــەو زیـــنم
بـــە نـــارِازی نـــاچم لـــەوێ
تـا لەسـەر سـینگت نەکـەم خـەوێ

کچ دەڵێ:

خـۆم دەکەمـە سـێوی سـەر لکانـە
دەچمەوە نـــــاو باغــی میرانە
لـــێم بـــگـــرن بـاغـــــەوانە
تـــو نـــەوێری بێیــە ئــەو لانــە
هــێ کــورە هــەتیم بــڕۆ دەرێ

کوڕ دەڵێ:

خـۆم دەکەمـە نەخۆشـەکی گرانـە
بمبەنـــە گـــەرمێن و کوێســـتانە
ســـێوێ ســـەر لکــان دەرمانــە
لــــە میراتیشـــت دەستینـــم
بێنـــە کێشـــت دەگـوزینـــم

کچ دەڵێ:

خـۆم دەکەمـەوە کەلـەک ڕیحانـە
دەچمـــەوە دووکـــانێ فەقێیانـــە
ئـــەوجا فـــەقێ زۆر شـــەیتانن
تـــو نـــەوێری بێیـــە ئەولانـــە

کوڕ دەڵێ:

خـۆم دەکەمـە شـوانی بەرخۆلانـە
بـــەرخان دەبەمـــە کوێســـتانە
مامۆســـتا بتـــبم بـــە قوربانـــە
دەتـدەمێ بـەرخی دوونـگ پانـە
تـۆ بیـدە مـن کـەلک ڕەیحانـە

لــــە فـەقێیانیشـــت دەستێنـــم
بێنـــە کـێشـــت دەگـــەوزینـــم

کچ دەڵێ:
خـۆم دەکەمـە ماینـەکێ بەحرییـە
دەچمـــەوە بنـــی ژێـــر زمییـــە
هـــیچ زەفـــەرت بـــە مـــن نییـــە
هـــێ کـــورە هـــەتیم بـــڕۆ دەرێ

کوڕ دەڵێ:
منـیش خـۆم دەکەمـەوە ماسـییە
دێـمـــەوە بـنـــێ ژێـــــر زمییـــە
دەســـــتت دەگـــــرم دەکـــــەزیا
کێـــوی پـــێ دەکەمـــەوە کـــەویا
هــیچ بــە نــاڕازی نــاچم لــەوێ
تـا لەسـەر سـینگت نەکـەم خـەوێ

کچ دەڵێ:
خـــۆم دەکەمـــە کۆترەکـــە ڕاژیـــە
ئەچمـــە بـــن گـــەواری هەوریـــە
هـــیچ زەفـــەرت بـــە مـــن نییـــە
هـــێ کـــورە هـــەتیم بـــڕۆ دەرێ

کوڕ دەڵێ:
منـــیش خـــۆم دەکەمـــە تـــەیرێکی لـــەکورەوە
گـــــــــەوارانت لـــــــــێ دەبڕمـــــــــــەوە
لـە هاوانیشـت دەگـرم لـە عاردیشـت دەپوچکوڕمـەوە

بـــــە نـــــارازی نـاچـــــــم لــــــــەوێ
تــــا لەســــەر سینگـــت نەکـــەم خــــەوێ

کچ دەڵێ:

خۆم دەکەمە کەوری قاقمێ
دەچمەوە سەر ملی حاکمێ
هـیچ زەفـەرت بـە مـن نییـە
هێ کوڕە هـەتیم بڕۆ دەرێ

کوڕ دەڵێ:

منـیش قاقمانیشـت دەسـتینم
دەســەملی نــەخۆت دادیـنم
لــە حاکمانیشــت دەســتینم
بێنــە کیشــت دەگــەوزینم

کچ دەڵێ:

ڕەنـــــگ زەردی فـــــەقیرە
خۆت لۆ داوێمەوە ماڵێ میرە

کوڕ دەڵێ:

مـــاڵێ میـــرانیش خــــەرابن
ئەویش بە پەروەردە و حجابن
بـرینــم کـولــن هـێـدی نـابن

کچ دەڵێ:

کوڕە نەرم بە نەرم وەرە پاڵم
تێـک وەربـدە خـەت و خـاڵم

واگــا مەینــە مــاڵم و حــاڵم
(یەحیا بەگی رۆستایی)

ئـەم گۆرانییـەی بـەلۆرە بـە یەكـەم جـار نووسـراوەتەوە و بەقسـەی خـاوەن گـۆرانی یـەحیا بـەگ یەكـەمجار وتوویـەتی و ئێمـەش خسـتمانە سەر لاپەڕەی ئەدەبی فۆلكلۆری كوردی بۆ ئـەوەی لـە فـەوتان ڕزگـاری بكەین، چونكە بەرهەمەكە نـەمرە و جۆرەكی گرنگی گۆرانی فۆلكلۆری كوردی ناوچـەی باڵەكایەتییە چونكـە ئـەم جـۆرە گۆرانییـە بـەزۆری لـە كوێستانەكانی ناوچە شاخاوییەكان گوتراوە.

**٢ـ١١: گۆرانی شایی**

**شایی ڕۆینێ:**

ئـــــەی هـــــەمینێ هـــــەمینێ
جـــەرگم پڕبـــوو لـــە خـــوینێ
داوەتـــــا كـــــە دەگـــــەڕێ
لـــەســـــەر لێـــوێ چۆخینـــێ
ئەمـــــن دەســـــتم درێژكـــــرد
یەكســـەر گەییـــە دۆخینـــێ
ئەمـــن چ خوشكـــم نینـــە
ئەمـــڕۆ بیـــدەم لـــە خـــوینێ

٭ ٭ ٭ ٭

عـــەلـــــۆ بـــابـــــم عـــەلـــــۆ
عـــەلـــــۆ ســـــواری مـــاینێ
فـــێـــــری كـــــردە قـــەلـونـــێ
عـــەلـــۆ بـــابـــم عـــەلـــۆ
عـەلۆ توخـوا تـو مـەچووە داران
عـــەلـــــۆ بـــابـــــم عـــەلـــــۆ
دەتـگـاتـــــێ لاوێ جـــــــاران

عـــەلـــــۆ بـــابـــــم عـــەلـــــۆ
(یەحیا بەگی رۆستایی)
((مەبەست لە وشەی (عەلۆ) حەلیمەی خۆشەویستی بووە)).

**گۆرانی شایی:**

**شایی کەپرۆکە:**

فـاتمۆکێ هــەی دەلالــێ چەنـدم گـۆ وەرە ئێـرە
فاتمۆکێ هێ دەلالێ ئەوە دەڕۆین بەرەو بەهارا
فـاتمۆکێ هـێ دەلالـێ کوێسـتانان کـەوی کـەوێ
فـاتمۆکێ هـێ دەلالـێ هـەڵگوردی بڵندە و نـەوی
فاتمۆکێ هێ دەلالێ ڕەبی برووسکی وێ کەوی
فــاتمۆکێ هــێ دەلالــێ بــا یــارم وەســـەرکەوێ
(یەحیا بەگی رۆستایی)

شـایی کـەپرۆک واتـە شـایی بازنـەیی یـەک گرتنـی هـەمووان بـە پەنجەی بچووکی دەست.

**٢-١٢: گۆرانی مەتارێزی**[*]:

جـاران لـە ناوچـەی باڵەکایـەتی ژن هێنـان بەسـواری وڵاخ بـووە و یەکێک ڕێشەی مایني و دوو کەسیش لەولاو لەولای بووکێ کە لەسـەر مایني بوو دەڕۆیشتن گۆرانییان دەگوت.

هـــۆی مــــەتارێزێ هـــۆی لـــە شـــیو و شـــارا باوێنـــە شـــۆرێ
هـــۆی مــــەتارێزێ هـــۆی قـــەڵا تـــوکێ جـــا بـــەخۆم کـــردی
هـــــــەی میـــــــری و حاکمـــــــان جـــــــا شـــــــەڕ تێکـــــــردی

[*] مەتارێز واتە هێڵی بەرگری کاتی خۆی لە شەڕ بەکار دەهات سەربازەکان لە پێش خۆیان مەتارێزیان بەکاردەهێناو لەپشت مەتارێز تیروکەوانیان دەوەشاند بۆ دوژمنان.

هـــۆی مـــــەتارێزێ باوێنـــــە شـــۆرێ هـــۆی مـــــەتارێزێ
هۆی بە سەرمایێ هۆی بە گەرمایێ باوێنە شۆرێ هۆی مەتارێزێ

* * *

کاتێک بووک دەگەیشتە جێ، گۆرانییەکە بەم شێوەی لێدەهات واتـە هەنگاو بەهەنگاو دەگۆڕا:

دەلالــێ لــەو مــەگرەو مەگازینــە
دەلالـــێ ئـــەوا بووکمـــان هینـــا
هــەواڵـــــێ زاوا تـێڕامینـــــــە
دەلالــــێ چـێکـــەن چـێکـــەن
هـــــەواڵێ بالیفـــــەکێ چێکـــەن
دەلالێ زاوا و بووک سەر وێ کەن

* * *

کـــــچ مـاڵـــــێ خـەڵکینـــــە
کـــــــوڕ گـــــــوی زێڕینـــــە

دوای دانیشـتنی بـووک، زاوا هەڵدەسـتێت کۆمـەڵێک دەسـماڵ دێنـێ دابەشی دەکات لەسەر شاییکەران هەریـەکی دەسـماڵێکی لەبـەر پشـتێنێ ڕادەکا وەکو دیاریی زاوا ئینجا گۆرانی بەم شێوە دەگوترا لە شایی:

لەگـــەر تۆمـــە ســـەرچۆپی کـــێش
ســـــەبر بــــڕۆ نــــەرم کـــێش
چـاوی خـــۆم لــۆ بـــدە دونیـایێ
بـــەبێ کـــۆترا دەنگمـــا نـــایێ
هـەروا دەڕوا بەرتیـەوە شـیلان شـیلان
چارۆگـــە ڕەشـــی لەســـەر پـــیلان
یـان دۆسـتم بـە یــــان دەسـگیران
وەکـــی دەڕوا بـــۆ ســـەر بیـری
چـارۆک مـــۆری زی کـــو شـێری
شـەیتـــان زۆرن یـــار نـاگـــیری

هـــــــەروا دەڕوا بـنـــــەو بـنـــــە
پـانـیـــــێ سـۆلـــــێ دەرزی چـنـــە
خـــۆی لـــێ مـــــەدەن یـــارا مـنــە
(یەحیا بەگی ڕۆستایی)

کـاتی بردنــەوەی مـاینێ بـۆ مـاڵێ سـاحێبی کەڵــەبابێک یـاخود مریشکێکی سەرەمریان دەهێنا بە پاشە زینی ماینێیان وەدەکرد بۆ مـاڵێ خاوەن وەڵاخیان دەبرد وەکو دیاری.

**٢ـ١٣: گۆرانی ئایینی:**

بــەخێر بێـی ڕۆژی مـیلادی محەممــەد
بـەخێر بێـی وەقتـی ئیجـادی محەممـەد
بـەخێر بێی عـەینی میعـادی محەممـەد
* * *
بـەخێر بێـی ڕۆژی بـێ بـاکی مــەلائک
بــەخێر بێــی ڕاهــی ئیـدڕاکی مــەلائک
بــەخێر بێــی مــاهی ئیـدڕاکی مــەلائک
بـەخێر بێـی ڕۆژی مـیلادی محەممــەد
* * *
محەممــەد ڕەونــەقی ئــەرز و ســەمایە
محەممەد مەنبـەعی شـەمس و الضـحایا
محەممــەد شــوعلەیی نــووری خودایــە
لـــەبۆ دەردی دڵـــی مـــن ئـــەو دەوایــە
* * *
محەممەد بوو لە عوقبادا عرووجی بۆ سەما برد و بەبێ باکی
محەممــەد بــوو بــە ئەنگوســتی شــەقی کـرد مــاهی ئــەفلاکی
محەممــەد بــوو خــودا فــەرمووی ئــەتۆ لــەم عالەمــە تــاکی
چ خۆشــــــە وەعــــــز و ئیرشــــــادی محــــــەممــــــەد

ئەم گۆرانییە لەکاتی کەباری پاشیوان و شەوانی جومعە و ڕۆژانی جومعە پێش خوتبە دەگوترا لە شارۆچکەی گەڵاڵە پیاوێک بەناوی (مینەی هەیبی) هەبوو دەنگی زۆر خۆش بووە کاتێ ئەم گۆرانییە ئایینییانەی گوتووە لە مزگەوت ماڵی جوولەکە هەبوون لە گەڵاڵەی کچێکیان ئەم دەنگەی زۆر پێ خۆش دەبێت و لەبەر خاتری ئەم دەنگە خۆشە مێردی بە حاجی مینەی هەیبی دەکا و دەبێ بە موسڵمان خەڵکی باڵەکایەتی زۆر دیندار و میواندار بوون هەردەم خاوەن دەروێش و صۆفی بوون کە سەر بە تەریقەتی شێخانی کوردستان بوون بەتایبەتی شێخانی تەوێڵە و بیارە.

چونکێ ئیمڕۆ یار نەدیوە دڵ دەکاتن شیوەنێ
جەرگ و دڵ وا بۆی دەسووتێن هەروەکو دارەبەنێ
جەرگ و دڵ بوون بەکەبابا یار لە روحێی دام قولابا
وەختە بم بە قەترێ ئابا لەبەر خاتری گەردەنێ
لەبەر خاڵی دوو ڕووانی جەرگ و دڵ بوون بە بووریانی
روح بە فیدای دوو زولفانی قەد وەکو با سەمەلێ
قەد وەکو داری شەشادە دین و دونیام چوون بە بادە
بۆ روحم هات ئەو جەللادە ئەو حەکیمە بە تەنێ
ئەو حەکیمە سەربەخۆیە چەنگ و باز چاو هەڵۆیە
ئەی چیبکەم مفتەن گەڵاڵەیە یا ئەڵڵا قیسمەت هەڵقەنێ
قیسمەت یەکە و حەی موبینە خۆم لێرەو یار لە مەدینە
دڵ دەکا عەزمی فڕینە روح دەرچوو لە بەدەنێ
(مەلا دڵشاد گەڵاڵی)

ئەی حەسەن بێ خاڵ و خوردی پیر نەبووی یان پیری کردی یار تا دەمری مەیلی مەلێ.

ئەم جۆرە گۆرانییە ئایینییانە لە موناسەبەی مەولود و عەقیقە دەگوتران کاتێک خێزانێک منداڵی ببوایە ئەگەر کوڕ بوایە دوو سەر ئاژەڵیان سەردەبڕی و ئەگەر کچ بووایە یەک سەر ئاژەڵیان سەردەبڕی

خەڵکیان دەعوەت دەکرد و پاش نان خواردن ئەم جۆرە گۆرانییە ئایینییانە دەخوێنرانەوە.
دیمانە لەگەڵ مامۆستا مەلا دڵشاد گەلاڵەیی، ٢٠١٩/٨/٩.

**بەشی سێیەم: لێدوان دەربارەی مەتەڵ**

**٣ـ تەوەری یەکەم: چەمک و پێناسەی مەتەڵ و سوودەکانی:**

یەکێکی تر لە جۆرەکانی ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی مەتەڵە، ئەویش هەڵدانیەتی بۆ کەسێک یاخود کۆمەڵە کەسێک بەچەند وشەیەکی کورت یاخود ڕستەیەک یاخود لە شێوەی شیعرێکی کورت کێش و سەروادار. مەتەڵ لە ناوەرۆکدا واتاکەی شاراوەیە یاخود ئاڵۆزە هەڵیدەدەی بۆ گوێگران ئەوانیش بیری لێدەکەنەوە و واتاکەی دەڵێن، هەندێ جار واتاکەی کاتێکی زۆر دەبات و بیرکردنەوەی باشی دەوێت. هەندێ جار هەڵدانی مەتەڵ لەسەر شت دەکرا دەعوەتی نان خواردن یاخود خواردنی شەوانە وەکو لەتکە هەنجیر و کاکڵ و مێوژ. ئەم مەتەڵەش بۆ زاخاوی مێشک زۆر بەسوودە ((لەچەند وشە و ڕستەیەکی کەم، یەکێک دایناوە بۆ زاخاوی مێشک، واتە بیری لە شتێک کردۆتەوە، ئەو شتەی خستۆتە قالبی چەند وشەیەکەوە ئەیپرسێتەوە لە کەسانی تر بۆ ئەوەی ئەوان بیری خۆیان بخەنە کار بۆ هەڵهێنانی))(عەلائەدین سەجادی، ١٩٧٨، ل١٦٢) واتە مەتەڵ بیری مرۆڤ تیژ دەکات و هەردەم ڕایدەهێنێ و چالاکی دەکات هێزی بیرکردنەوە بەهێز دەکات ((مەتەڵ لقێکە لە لق و پۆپەکانی فۆلکلۆری کوردی، کە باوک و باپیرانمان هەر لەکۆنەوە دایانناوە، بۆ زاخاوی مێشک و جیاکردنەوەی کەسانی هۆشیار و ژیر)) (هوشیار نوری لەک، ل١٦٢). واتە مەتەڵ کە شەوان هەڵدەدران زاخاوی مێشکی بەهێز دەکرد و خواردنی شەوانەی مەتەڵ هەڵدان کە بریتی بوون لە مێوژ و کاکڵە گوێز یاخود خۆشاو دەبوونە بەهێزبوونی مێشک وەکو ئەوەی ئێستا لە زانستە پزیشکییەکان دەریانخستووە ((مەتەڵ ئاوێنەی ڕاستەقینەی هۆش و جۆری بیرکردنەوە و لێکدانەوە و

شارستانیەتە بەڵگەی ژیان و مرۆڤی ئەو ژیانەیە، مێژووە، دەریایە، جیهانێکی سەیرو سیحراوییە، بووژانەوەیە، خەمڕەوێنە، هاودەم و هاوڕێیە))(نەسرین فەخری، ٢٠٠٥، ل٤٥) مەتەڵ مێژووی میللەتەکە نیشان دەدات و بژێویی ئەو سەردەم دیاری دەکات و بۆ کات بەسەربردن و توانستی گەنجان و مرۆڤی کوردی نیشان داوە، چ جا توانستی مێشک و زیرەکی میللەتی کورد و شارستانیەتی ئەو سەردەم و بەردەوامبوونی مەتەڵ هەڵدان بە شەوان خوانەی گەورەتر و کەشێکی سیحراوی جوانی کێشاوە. لە ڕووی دەروونیشەوە ئەو کەسەی مەتەڵ دەزانێ بڕوا بەخۆبوونی زیاتر دەبێ و خۆشی بە سەرکەوتوو دەزانێ، مەتەڵ هۆکارێکە بۆ ناسینەوەی ناوچەیەک، چونکە مەتەڵی ناوچەی شاخاوی تا ڕادەیەک جیایە لە مەتەڵی دەشت بە حوکمی ناوچەی شاخاوی خەریکی مەڕوماڵات بەخێوکردن و ڕەز و باغ و کشتوکاڵی و چنین و ڕستن و تووتن و گەنم و جۆ و نیسک و وێنجە و سەوزەوات و برنج و ئاشی ئاو و گیای بەهاران و کوێستان و گەرمیان و دارکردن و خانوو خۆڵەبان کردن و هێنانی جۆگەی ئاو و دروێنە و دەستاڕکردن و ساوار کوڵان و کوتان و وشک کردنی میوەکان بۆ وەرزی زستان ئەمانە و زیاتر بوونە هۆی ئەوەی کە ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی زیاتر گەشە بکات و مرۆڤی ئەو سەردەمیش بەهۆی ئەوەی کەمتر لە ئێستا ئامێری کارەبایی و ئەلکترۆنی هەبووە، خۆی خەریکی ئەم جۆرە فۆلکلۆرانە کردووە بە هەموو جۆرەکانییەوە و کردوویەتی بەناسنامەی نەتەوە و ناوچەی باڵەکایەتیش یەکێک بووە لەو ناوچانەی کە فۆلکلۆر لێی پارێزراوە و دەماودەم لەسەر زاری پیاوە خاوەن تەجروبەکان و گەنجان و پیرەژنەکان کە هەرچەندە نەخوێندەوار بوونە بەڵام فۆلکلۆرەکەیان بە زیندوویی هێشتۆتەوە.

### ٣ـ١: سوودەکانی مەتەڵ

١ـ مەتەڵ بۆ زاخاوی مێشک و کات بەخۆشی بەسەربردن لەلای خەڵکی لادێکان گوتراوە. ئەوەی مەتەڵ هەڵئەدا توانا و بیرێکی باشی

هەیە، هەروەها ئەوەی مەتەڵەکە هەڵدێنێ ئەویش توانا و بەهرەیەکی زۆری هەیە، چونکە مەتەڵ هەڵهێنان وەکو بیرکاری وایە پێویست بە بیرکردنەوەی قووڵ هەیە بۆ گەیشتن بە ماناکەی. مرۆڤی پێشتریش وەکو ئێستا نەبووە بیری زۆر ئاڵۆز بێت بە ئامێرە ئەلکترۆنی و کارەباییەکان بۆیە زووتر توانیویانە مەتەڵ زوو هەڵبهێنن.

٢ـ مەتەڵ هەڵدان لەناو هەر میللەتێکدا یاخود ناوچەیەکدا ئەوەی هەڵیدەدا و ئەوانەی هەڵیدێنن هەست بەسەرکەوتن دەکەن واتە حەزێک لە گیانیان دروست دەبێت جاری وا هەیە دوو بەرە یاخود دوو گوند یاخود دوو ناوچە پێشبڕکێ دەکەن لەسەر هەڵدانی مەتەڵ و هەڵهێنانی.

٣ـ مەتەڵەکان و چۆنیەتی دارشتنیان ئەوە بەدیار دەخەن کەوا باری ئابووری و کۆمەڵایەتی. دەروونی و ژیانی رۆژانەی خەڵکی کورد و ناوچەکە و هەموو بوارەکان لەخۆ دەگرن.

٤ـ مەتەڵ زارو زمانی ناوچەی پێوە دیارە بۆ زمانزانێک ئاسان دەبێت کە شێوەزاری چ ناوچەیەک لەناو مەتەڵەکە بەدیار دەکەوێ، هەروەها شوێن جوگرافیا و مێژووی مەتەڵەکە لە زمانی هەڵدانیدا دیاری دەبێت.

**تەوەری دووەم: جۆرەکانی مەتەڵ**

**٢.٣: ئەو مەتەڵانەی پەیوەندییان بەمرۆڤەوە هەیە:**

لە ناوچەی باڵەکایەتی بەتایبەتی و لە کوردستان بەگشتی مەتەڵ زۆر لەسەر مرۆڤ و ئەندامانی جەستەی مرۆڤ و لەبەرکردن و لەپێکردنی شتەکان لەلایەن مرۆڤەوە زۆری لەسەر گوترایە بۆیە ئەم جۆرە مەتەڵانە بۆتە هۆی بەهێزکردنی مێشکی مرۆڤ و توانای بیرکردنەوەی زیاتر دەکات.

١. کە پیسە دەخورێ کە خاوێنە ناخورێ = پێستەی سەرە.

٢. ئەولا دیوار ئەولا دیوار تێیدا بزبزۆکەی هەرزان = زمانە.

٣. ئەولا دیوار ئەولا دیوار پڕە لە تەپشوولەی جوان = ددانە
٤. مردی زیندی ڕاکێشا کەندێ = چوونە سەرپێ ← واتە چوونە ئەدەبخانە
٥. کەندوولە پڕ لە تەپشوولە = زار
٦. چوومە سەرگردەکی پێم کەتە کووپەکی = پۆتین
٧. دەبزانە بزبزۆکێ هەرزانە = زمانە
٨. تاکو نەیبەستییەوە ناڕوا = پێڵاوە
٩. هەتەڵۆک و مەتەڵۆک سەری باوت مەنجەڵۆک = کڵاو و جەمەدانی
١٠. ماڵم لە تاتانە بەختم بەفاتانە = بێ بەخت
١١. ئەولا پەرژین ئەولا پەرژین دەناوی دا کۆتەکەکی نەخشین = چاوە
١٢. تەپە خڕیلەی گیا وردیلە = سەرە
١٣ـ لەدوو هۆبان تیران داوێنە گۆمان چییە لەناو لینگێ داکمان = مەنجەڵی بێری مەڕو بزن دۆشینە.
١٤. بانەکە و بن بانەکە چوار مەڕ و شوانەکە = دەست
١٥. هەتاکو سەراوبن نەکەی پڕ نابێ = کڵاوە
١٦. بەران داکێ مەڕیە = باوکە حەوایە کە دایکە حەوای لێ خولقایە
١٧ـ چار برا لە چۆمەکی تیران داوێنە چۆمەکی = بێری مەڕو بزن دۆشین
١٨ـ بە زولێ و بە زولیخێ ماڵیان پڕکرد لە رمێنێ = شەڕی دوو خوشک لە ماڵێ
١٩. لەسەری یەک لەبنی دووە بەناو لاقی باو باپیرتدا چووە = شەرواڵ
٢٠. سپی قودرەتی رەشی عەمەلی = پرچی مرۆڤ لە گەنجی و پیری

**٣ـ٣: مەتەڵ لەسەر ئاژەڵان و ئەوەی پەیوەندی پێوە هەیە:**

مەتەڵ لەسەر ئاژەڵ زۆر گوتراوە چونکە مرۆڤی کۆن زۆر لەگەڵ ئاژەڵ پەیوەندی هەبووە چ لە بەخێوکردن چ لەبۆ پاراستنی مرۆڤ چ

لـەبۆ کـاری ڕۆژانـەی وەکـو کـێڵان و سـواربوون و گواسـتنەوە و زۆر شتی تر بەکارهاتووە بەروبوومی باشی هەبووە بۆ بژێویی ژیان.

٢١. داری دوولک پڕ لە کوڵک = برینگ یاخود کەلەخ ← ئەوەی خوری حەیوانی پێ دەبڕێتەوە.

٢٢. هەپک تەپک پیچەکەدی = ریخی ڕەشە وڵاخ

٢٣. زەردی زەردان لەبن بەردان = مار

٢٤. پیرە مامی بن گەرە گەلێ، بە سمێلان ئەلێ بەلێ بەلێ = کیسەڵ

٢٥. پیرە مامی لە دەشتێ سێڵۆکەکی لە پشتێ = کیسەڵ

٢٦. چار پێی قوندەکە
لەسەر بانی رادەکا
بۆقە و پێت ناڵێم

٢٧. بە دەوری ئەسحابان کوڕ گەورەترن لە بابان = هێستر

٢٨. بە دەوری ئەسحابان مێیە قەت نازێ = هێستر

٢٩. خواردنە ژمارەیە زیندەوەرە = سیسرکەیە

| <u>سێ</u> | <u>سرکە</u> | <u>سیسرکە</u> |
|---|---|---|
| ژمارە | خواردن | زیندەوەر |

٣٠. <u>دوو لەقن</u> <u>دوو زەقن</u> <u>دوو ڕەقن</u> <u>چار چەقن</u> = بزنە
دوو گوێچکە چاو قۆچ چوار پێ

٣١. <u>شەشت بە شەشێ</u> <u>بیست و چارت بەڕەشێ</u> <u>لەسەر چاران دابەشێ</u> = ناڵی ئەسپ

بۆ هەر ناڵێک شەش بزمار چوار ناڵی ڕەش بەکاردێ واتە هەر قاچەو ناڵێکی لێ دەدرێن

٣٢: ئەڕوا ئەڕوا بنارۆکە خۆی پێچایە بەچارۆکە = کیسەڵە

٣٣. نەکەوە نە باڕۆکە قوندەی بێ موو = بۆقە

٣٤. چار ئێ چێڵێ = گوانێ چێڵ
هەشت ئێ دێڵێ = گوانێ سەگ
دوازدەینە ڕمەکێری = گوانێ بەرازی مێیە

٣٥. سەری ئەسپە قوونی قەسپە = کلۆیە

پێی مشارە گوێی بەگوارە = کلۆیە

٣٦. شیری ئەدا بزن نییە ئەفڕی کەو نییە = شەمشەمە کۆرە

**٣.٤: مەتەڵ لەسەر سروشت و ئەوەی پەیوەندی بە سروشت هەیە:**

سروشتیش لە کوردستان بەگشتی و لە ناوچەی باڵەکایەتی بەتایبەتی، ناوچەیەکی زۆری باڵەکایەتی کوێستانن و شاخاوی و ڕووبار و کانی و بەفری زۆر و ڕەزو باخ و داروباری جوان بەشێکن لە مەتەڵەکانی ناوچەکە.

٣٧. تا دەڕۆی تەواو نابێ = ڕێگایە

٣٨. تا دەڕۆی لە دووت دێت = سێبەرە

٣٩. بەشەو دەڕوا خدرۆکە بەڕۆژ دەڕوا فرۆکە = ڕووبار

٤٠. سپیە و لووسە و زل = زلووکە گیایە

٤١. گلۆڵە بایە هەڵم دایە ڕێیە قەت نەبڕایە = ڕێ

٤٢. لە دووری دێ و لە بوور دێ قەڵەم کاغەزی سووردێ = برووسکە

٤٣. تا کەرم بەستەوە جاشک چۆ سەربانی = دووکەڵی سۆبە

٤٤. دارەکم هەیە چار ڕەگە لەسەرەوە دوازدە قەدە هەر قەدی سی پەلکی پێوەیە هەر پەلکی ڕەش و لایەکی سپییە = ساڵ و وەرزەکان و مانگ و شەو و ڕۆژ.

٤٥. هێلکەی بازان لە هەورازان کەتە بازان = تەرزە

**٣.٥: مەتەڵی خۆراک و کەرەستەی خۆراک**

خۆراک و کەرەستەی خۆراک بەشێکی گرنگی ژیانی مرۆڤی کۆن بووە، چونکە مرۆڤ هەموو شتێکی لەسەر خۆی بووە بۆیە پێویست بووە خۆی ئەم داهێنانە بکات بۆ ئەوەی بژێویی ژیانی خۆی بەڕێوەببات بۆیە لە مەتەڵی فۆلکلۆری ناوچەی باڵەکایەتی ئەم جۆرە مەتەڵانە شوێنی باشیان گرتووە و زۆر بەکارهاتووە.

٤٦. لە دەشتێ ژێری مێم دی لەسەر نێری = دەستاڕ
٤٧. هەورۆکە هەورۆکە لێیدا داری بەفرۆکە = بێژینگی ئارد
٤٨. مردی بەپێوە پەڕۆی بەقوونێوە = کەندووی ئارد
٤٩. ئەولا دیوار ئەولا دیوار تێیدا سەگێکی هاری هار = ئاش
٥٠. دەعاردیم نا یەک بوو دەرم هێنا بوونە هەزار لێیان دەخوارد دەوڵەمەند و هەژار = پەتاتە
٥١. سەری سانە بنی قورئانە = کوارگ
٥٢. تاکو تێت نێن لێت وەخۆش دێت = نان واتە هەتاکو پارووی نان لە دەمت بنێی پێت خۆشە
٥٣. تاکو لێی دەردێنی هەر زۆر دەبێ = گوڵەبەڕۆژە
٥٤. بە زستانان ڕووت ئەکرێ بەهاوینان جل ئەکرێ = سێڵێ نانی
٥٥. یەک لینگەی لە دەشتێ دوو لینگەی گەیشتێ هاویشتیە سەرپشتێ = گەنم دوورینە
٥٦. نە پێی پێوە نە پانی ئەچیتە بنەبانێ خانی = هێلکەی مریشک
٥٧. ئاگر دەناو ئاوێدا خەڵکی دەورە لێدا = سەماواری بەپەنگران
٥٨. لەسەری ئاوە لەبنی ئاگر = سەماوار
٥٩. بەگەرمایێ جل ئەکەی بەسەرمایێ ڕووت ئەکەی = سێڵێ نانی
٦٠. سەری سۆرو ڕەشە عەلامەتی بنی قۆڕە قیامەت بە تەڕی تێدەنێت و بە وشکی دێتەدەر = تەندوورێ نانێ
٦١. مردی زار بەش = مەشکە
٦٢. ئەیکرِی ڕەشە بەکاری دەینی سۆرە وەکی فڕەیەدەی سپییە = مشکی ڕەژوو واتە خۆڵەمێشی ڕەژوو
٦٣. هەڵتەگرم و داتەنێم
دە جۆرکەکی گووتەنێم
هەتا ئەمری تێتەنێم
= مڵاکی شیوێ
٦٤. هەرچەندی بڕوات ماندی نابیت = ئاوە
٦٥. ڕەق لەسەر ڕەقی دەستت بەڕەقی = دەستارە

٦٦. سوورەم دەناو دوو ڕەقان نا نەرم و سپیم لێ دەرینا = گەنم لە ئاش کردن

**٦.٣: مەتەڵی ئایینی ئەوەی پەیوەندی بە ئایینەوە هەیە:**

کوردستان زۆرینەی موسڵمانە ناوچەی باڵەکایەتیش زۆر پابەندی ئایین و داب و نەریتی ئیسلامن بۆیە فۆلکلۆرەکەشی لەم جۆرە مەتەڵانە بێ بەش نەبووە بەجوانترین شێواز مەتەڵیان لەسەر داناوە و بۆتە ناسنامەی ناوچەکە و کوردستان.

٦٧. لە پێشی چوارە لە پشتی هەزارە = جەنازە

٦٨. ئەولای تات و ئەولای تات ئەی بابە جیقم دەرهات = قەبر

٦٩. تەیرێک هات بە هانە هان گەورەی گرتن گچکەی بەردان = مانگی ڕەمەزان

٧٠. بە مام خدر و مام عەولای
غاریان دایە لای مەلای
لە کەپەنەک و لە حەلوای
ئێکیان لۆ باوێتە ئەولای
= میرات دابەشکردنە

٧١. مام خدری هێڕی هێڕی خۆ بەدیواران دادێڕی چ ماڵان بەجێ نایێڵی = هەتاو

**٧.٣: مەتەڵی دروێنە و کەرەستەی دروێنە:**

ئەمەش پیشەی زۆربەی خەڵکی باڵەکایەتییە کە زۆر شارەزابوون لەم بوارە، چونکە بژێویی ژیانی خەڵکەکە لەسەر کشتوکاڵ بوو بۆیە زۆر بەجوانی مەتەڵەکانیان لەسەر ئەم بوارەش دادەڕشت.

٧٢. کاچوو مادان = کاتی شەنە هەڵدان

٧٣. ڕیسی گرێ گرێ ئەگەر نزانی قونتە خورێ = تاینچەی کایێ ئەمە وەکو تۆڕی گۆڵ وایە بۆ هەڵگرتنی کا لەسەر پشتی گوێدرێژ بار دەکرێت.

٧٤ـ بە شەماڵی کاری دەوێ بەزریانی خەوی دەوێ = جۆخین
٧٥ـ یەک لە دەستیدایە چار لە هەوایدایە دەرمانی دەردی گەنم و کایە = شەنە

### ٣ـ٨: ڕووەک و سەوزە و میوە:

ناوچەی باڵەکایەتی بە حوکمی ئەوەی کە ناوچەیەکی شاخاوییە و پڕیەتی لە کانیاو و ڕووبار و ڕووەک و سەوزە و میوەی جوانی لێ بەرهەم دەهێنرێت و خۆی لە مەتەڵی فۆلکلۆری دەدۆزێتەوە بەشێکی فۆلکلۆرەکەی پێ دەوڵەمەند دەکات.

٧٦ـ سەری دەبڕی و لۆیە گریێ = پیواز
٧٧ـ دام لەدیوار بوو بە سەد هەزار لە ڕەنگێکی جوان = هەنار
٧٨ـ داری تەپشوو نەدیتی ئاردی ئاش نەدیتی = سنجییە
٧٩ـ سەوزە وەک خیار مزرە وەک هەنار = ڕێواس
٨٠ـ سەری سەوزە بنی سوورە ئەگەر نزانی کەرە توورە
٨١ـ بە گەنجی ڕیشی سپییە بە پیری ڕیشی ڕەشە = ترێیە
٨٢ـ کە سەوزە هەموو ئەخورێ = چەقەلە باوی
٨٣ـ بە هەزار برای دیوار خانەیەک = هەنار

### ٣ـ٩: مەتەڵی کەرەستەی خانووبەرە و حەوانەوەی کوێستانەکان و گەرمێن:

لە دێر زەمانەوە ژیان زۆر سادە و ساکار بووە بۆیە خانووبەرەی خەڵک لە گڵ و بەرد و دار دروست دەکرا بۆ زستان و هاوینان بە ڕەشماڵ لە کوێستانان دەژیان لەم بوارەش مەتەڵی ناوچەی باڵەکایەتی شوێنی خۆی وەرگرتووە لە فۆلکلۆری کوردی.

٨٤ـ ئەولای دارە ئەولای دارە ئەگەر نزانی کەرە مشارە
٨٥ـ ئەگەر نوست هەندی گایەکیە ئەگەر هەستا هەندی چیایەکییە = ڕەشماڵ
٨٦ـ پیرەمێردی سەربانی لۆلکی ئەخوا بەزمانی = باگوردان

٨٧ـ شەمعوونی دوو قوون = باگوردان
٨٨ـ شەمعوونی دوو کون = باگوردان

**٣ـ١٠: مەتەڵی کەرەستەی ڕووناککەرەوە:**

خەڵکی جاران بەخۆی ڕووناکی بۆ خۆی دادەنا و بەسادەیی و ساکاری دەژیان شەوان قەندیلیان بەکاردەهێنا و لەدوایی کارەبا پەیدابوو بۆیە مەتەڵی جوانیان لەسەر ڕووناکی هەیە:
٨٩ـ بە ڕۆژ نووستووە بە شەو بەخەبەرە = چرایە
٩٠ـ بەڕۆژ مەیموونە بەشەو خاتوونە = چرایە
٩١ـ خڕە وەک تۆپەکی پڕ بەژۆرەکی = گلۆپە
٩٢ـ هەندووکە بە دمدووکە لەپێش میر و حاکمان دەڵێی بووکە = قەندیل (چرای کۆن)

**٣ـ١١: مەتەڵی ڕستن و چنین و دەرین:**

لە فۆلکلۆری کوردی و ژیانی کۆنی خەڵک ڕستن و چنین زۆر باو بووە و بژێویی ژیانی پێ دابین کراوە بۆیە لەسەر زاری خەڵک زۆر مەتەڵی پێ هەڵدراوە و بۆتە قسەی سەر زاری خەڵکی بۆ بەسەربردنی شەوان.
٩٣ـ هەزار سوار لەبەر سوارێک ئەلەرزی = هەپک کە لە تەونی دەدەی
٩٤ـ دەسک داری سەر ئاسن کوڕە نەفام درێشە. درێشە بۆ کونکردنی پێڵاو و شتی ڕەق بەکاردەهات
٩٥ـ بنی دارە سەری دەشتە
لەسەر دەشتی بستە
لەسەر بستێ ڕستە = تەشی ڕێستن
لەسەر ڕستێ گوستە
لەسەر گوستێ مشتە
٩٦ـ تەڕکە ڕەپکە تێڕاکە = داو و دەرزی

**٣–١٢: مەتەڵی خۆپاراستن:**

ئەم جۆرە مەتەڵانە بۆ خۆپاراستن بووە لە گیانلەبەر و دڕندە.

٩٧. مردی تڕ قەوی = تفەنگ

٩٨. شەو تاریکە لاق باریکە بەخۆم ناچم ئەویەنێرم = تفەنگ تەقاندن بۆ دەرکردنی گورک لەلای مەڕان

**٣–١٣: مەتەڵی هەمەجۆر:** واتە زیاتر لە بابەتێک لەخۆ دەگرێ:

٩٩. بی تەڕ تاڵە = سروشت (داربی)

خوێیە سوێرە = خۆراک (خوێ)

داسە خوارە = داس ( دروێنە)

١٠٠. لێو تەڕە دوونە = مرۆڤ (لێو)

بی تەڕە شینە = سروشت (بی)

فقال بی تەڕ تاڵە = سروشت (بی)  واتە دار بی سروشتییە و دارێکی تاڵە تەڕە

١٠١. نە پێی پێوە نە پانی بەهەموو دەرکان ئەزانی = پارە    واتە پارە بێ پێیە و دەچێتە هەموو ماڵێک

١٠٢. داری لۆک لە گوێ بەلۆک، گوێ بەلۆک پێش کەوی، پێ پانۆک وەدوو کەوی

غەلیفی هەنگوین          کەر          مرۆڤ

١٠٣. هەوری پتک پتک کوڕی کۆرە باوکی گونک

١٠٤. سواری نەزۆکی بووم  بە نەبراوی داچووم  تۆم هێنا تۆ شین بوو

هێستر          ڕێ          خوێ

١٠٥. خەتێ بێ خۆڵ = خەتی نووسین

داری بێ بەر = هێستر

شارێ بێ بانگ = قەبرستان

١٠٦. بەرخۆکێ سەرچیایی ناهێڵی بسکە گیایی = مووس، مووسی ڕیش تاشین

١٠٧. سایەقەی ساماڵ هەوری فەرەنگی = هێلکە

دوو ئاو لە جامێک هەریەک لە ڕەنگی = چاو

١٠٨. ئی داکێ لەپەکە ئی باوی بستەکە = نوێژ. ڕاوەستانی ژن و پیاو بۆ نوێژ واتە بەینی پێیەکانیان

١٠٩. بەدوو بۆنێ کەبابی داچوو کە چوو کەریان داغەکرد = ئەسپ ناڵکردنە

**ئەنجام**

١ـ ئـەدەبی فۆلکلـۆری ئـەدەبێکی گرنگـە لـەناو هـەموو میللـەتانی جیهـان مێژوویـەکی دەوڵەمەنـدی هەیـە، کـوردیش بەتایبـەتی خـاوەن ئــەدەبێکی دەوڵەمەنــدی فۆلکلۆرییــە، ناوچــەی باڵەکایــەتیش خــاوەن فۆلکلـۆری تایبـەت بەخۆیـەتی بـەڵام لەبـەر دووره دەسـتی فـەرامۆش کراوە.

٢. لە ئەنجامی ئەم توێژینەوە دەرکەوت هەر ناوچەیەک دوور بێت لە شارستانییەت زیاتر دەوڵەمەندە بە جۆرەکانی فۆلکلۆر لەبەر ئەوەی زیـاتر متمانـەیان بـەخۆیان هـەبووە هـەلیان بۆ خۆیـان ڕەخسـاندووە لـە کەلوپەلی دەستکرد بۆ بژێویی ژیانی خۆیـان چاویـان لـە دەسـتی خـەڵک نەبووە پێیان وابووە داهێنان دایکی پێویستییەکانە.

٣ـ سـوودێکی تـری ئـەدەبی فۆلکلـۆری ئـەوەبوو کـە دەکـرێ لـە ڕێگەیەوە سوود لە بوارەکانی تری زانستی وەربگیرێت وەکو زانسـتی کۆمەڵایـەتی و دەروونـی و جوگرافیـای سروشـت و کـەش و هـەوا و پیشەسـازیی بـەرد و پێسـتە و ئـاو و بەنـداو و کشـتوکاڵ و پەلـەوەر و ئاژەڵ بەخێوکردن و ژیانی کۆچەری... هتد.

٤. هـەروەها لـە ئـەنجامی ئـەم توێژینەوەیـە بۆمـان دەرکـەوت کـەوا توانای تاکە کەسی لە ژیانی ڕۆژانەدا چەندە و بەهرە و دەست ڕەنگینی

ژن و پیاو و هاریكاركردنی هەردوو ڕەگەز لە هەموو بوارەكانی ژیانیان واتە ژن هاوشانی پیاو بووە لە ژیانیدا ڕۆڵی زیاتر نەبووبێت كەمتر نەبووە.

٥ـ گۆرانی و مەتەڵەكانی ناوچەكە ئەوە دەردەخەن كە خەڵكەكە چەندە بەختەوەر و دڵخۆش بوونە لە ژیانی ڕۆژانەیاندا و توانستی مێشكیان چەند بەرز بووە و بۆ هەر بۆنەیەكیش خاوەنی گۆرانی تایبەتی خۆیان بوونە، چونكە مەتەڵ بیری مرۆڤ گەشە پێدەدات، هەروەها بوونەتە ئامۆژگاری و پەند بۆ نەوەكانی دوای خۆیان، چونكە هەر مەتەڵێك كارێكی گەورە یان چیرۆكێكی لە پشتدا بووە كە مەتەڵەكەی لێ هەڵێنجراوە.

٦ـ گۆرانی و مەتەڵ پارێزگاری لە زاراوەكانی زمانی ناوچەكە دەكەن و زمانی كوردی دەوڵەمەند دەكەن.

٧ـ گۆرانی و مەتەڵ هەموو لایەنەكانی ژیانی ناوچەكە دەخەنە ڕوو و هەروەها لایەنی جوگرافیا و مێژووی ناوچەكە و ئاسوودەیی ژیانی خەڵكەكە دیاری دەكەن.

**سەرچاوەكان:**

**كتێب بەزمانی كوردی:**

١ـ د. شوكریە ڕەسول ئیبراهیم، ١٩٨٤، ئەدەبی فۆلكلۆری كوردی، بەشی دووەم، چاپخانەی زانكۆی سەلاحەددین، هەولێر.
٢ـ علائەدین سەجادی، ١٩٧٨، دەقەكانی ئەدەبی كوردی، لە چاپكراوەكانی كۆڕی زانیاری كورد، چاپخانەی كۆڕی زانیاری كورد، بەغدا.
٣ـ عیزەدین مستەفا رەسول، ١٩٧٩، لێكۆڵینەوەی ئەدەبی فۆلكلۆری كوردی، چاپی دووەم، چاپخانەی زانكۆی سلێمانی، سلێمانی.
٤ـ كامەران موكری، ١٩٨٤، ئەدەبی فۆلكلۆری كوردی، بەشی یەكەم، زانكۆی سەلاحەددین، هەولێر.
٥ـ گۆران شاخەوان، ٢٠١٥، چەپكێك لە زمان و فەرهەنگی باڵەكایەتی، چاپی یەكەم، چاپخانەی شەهاب، هەولێر.

٦ـ شێخ محەمەدی خاڵ، ٢٠٠٧، پەندی پێشینان، چاپی چوارەم، چاپخانەی شڤان، سلێمانی.
٧ـ د. مارف خەزنەدار، ٢٠٠١، مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی یەکەم، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر.
٨ـ هۆشیار نوری لەک، ٢٠١٠، کتێبێکی فۆلکلۆر لە بڵاوکراوەکانی نواڵەی نویێ، چاپی یەکەم، چاپخانەی چوارچرا، هەولێر.

**سەرچاوە بەزمانی عەرەبی:**

٩ـ عزالدين مصطفى رسول، ٢٠١١، دراسة في الادب الكردي، من منشورات الاكاديمية الكردية، مطبعة الحاج هاشم، اربيل.

**سەرچاوە بەزمانی ئینگلیزی:**

10- Pundes, A. (1965), The Study of folklore, Englewood cliffs: Prentice Hall, p.2.

**گۆڤارەکان:**

١ـ د. نەسرین فەخری ٢٠٠٥، مەتەڵ و زمان پاڵاوتن و زاخاوی مێشک، ئاسۆی فۆلکلۆری، ژمارە ٧، بەغدا.

**چاوپێکەوتن و دیدەنی لەگەڵ ئەو کەسانەی کەوا گۆرانی و مەتەڵمان لێ وەرگرتوون:**

١ـ حسێن ئەبو شوارب گەلاڵەیی، لەدایکبووی ساڵی ١٩٤٩، کۆمەڵگای گەلاڵە، چاوپێکەوتنمان لەگەڵ کردووە لە رۆژی ٢٠١٩/٨/١٥ کە خاوەن مەتەڵەکانی ژمارە [٨، ١٢، ١٣، ١٥، ١٦، ١٧، ٢٧، ٢٨، ٢٩، ٣٠، ٤٣، ٤٥، ٥٧، ٥٨، ٥٩، ٦٠، ٧٦، ٩٨، ١٠٢، ١٠٣، ١٠٤، ١٠٥].
٢ـ حەمید گەلاڵی، لەدایکبووی ساڵی ١٩٥٥، چۆمان، چاوپێکەوتنمان لەگەڵ کردووە لە رۆژی ٢٠١٩/٧/٥

٣ـ خەدیجە مامە ئەحمەد گەلاڵەیی، لەدایکبووی ساڵی ١٩٦٥، کۆمەڵگەی گەلاڵە، چاوپێکەوتنمان لەگەڵ کردووە لە رۆژی ٢٠١٩/٨/٢٨ کە خاوەن مەتەڵەکانی ژمارە [ ١٧، ٢٠، ٣١، ٣٣، ٣٥، ٤٢، ٥٠، ٥٤، ٥٥، ٦٢، ٦٤، ٦٥، ٦٦].

٤. مەلا دڵشاد گەلاڵی، لەدایکبووی ساڵی ١٩٧٣، هەولێر چاوپێکەوتنمان لەگەڵ کردووە لە رۆژی ٢٠١٩./٨/٩

٥ـ زرار ڕایەتی، لەدایکبووی ساڵی ١٩٥٧، ڕایەت، چاوپێکەوتنمان لەگەڵ کردووە لە رۆژی ٢٠١٩./٧/١٥

٦ـ زوبێر باڵەک، لەدایکبووی ساڵی ١٩٧٢، قەزای سۆران، چاوپێکەوتنمان لەگەڵ کردووە لە رۆژی ٢٠١٩./٧/١٠

٧ـ سەلیم مینا ئاغای ڕایەتی، لەدایکبووی ساڵی ١٩٦٣، باوەکراوە، چاوپێکەوتنمان لەگەڵ کردووە لە رۆژی ٢٠١٩/٨/٢٥، کە خاوەن مەتەڵەکانی ژمارە [١، ٢، ٣، ٤، ٥، ٦، ٧، ٩، ١٠، ١١، ١٤، ٢١، ٢٢، ٢٣، ٢٤، ٢٥، ٢٦، ٣٧، ٣٨، ٣٩، ٤٠، ٤١، ٤٦، ٤٧، ٤٨، ٤٩، ٥١، ٥٢، ٥٣، ٥٦، ٦١، ٦٧، ٦٨، ٧٢، ٧٣، ٧٤، ٧٨، ٨٥، ٨٩، ٩٠، ٩١، ٩٢، ٩٣، ٩٧، ٩٩، ١٠٠، ١٠١].

٨. مستەفا حەمەدی حەلیمێی چۆمبالۆکی، لەدایکبووی ساڵی ١٩٧٣، هەولێر چاوپێکەوتنمان لەگەڵ کردووە لە رۆژی٢٠١٩/٨/٢٠، کە خاوەن مەتەڵەکانی ژمارە [ ٦٩، ٧٧، ٧٩، ٨٠، ٨١، ٨٢، ٨٤، ٨٦، ٨٧، ٨٨، ٩٤، ٩٦، ١٠٨، ١٠٩].

٩ـ یەحیا بەگ ڕۆستایی، لەدایکبووی ساڵی ١٩٦٢، حەریر، چاوپێکەوتنمان لەگەڵ کردووە لە رۆژی ٢٠١٩/٧/٢٥.

# هۆكارە كاريگەرەكان لەسەر بارودۆخی كۆمەڵايەتيی شاری كەركووك
## ( ١٩٢١ – ١٩٥٨ )

**د. دڵشـاد محمود عبدالرحمن**
بەشی مێژوو– كۆلێژی ئاداب-
زانكۆی سەلاحەددين/ هەولێر

**پێشەكی**

**گرنگيی توێژينەوە:** شاری كەركووك لە شارە دێرين و گرنگەكانی كوردستانە، لەگەڵ ئەوەی لە گەلێك ديـاردە و سيماكاندا هاوچەشـن و وێكچووە لەگەڵ شارەكانی ديكەی كوردستان و عيراق، بەڵام لە هەمـان كاتـدا خـاوەن تايبەتمەنـدێتی تـايبەت بە خـۆيەتی، كەوای كـردووە بە ئاسـانی لە لە شـارەكانی ديكەی كوردسـتان و عيـراق جيـا بكـرێتەوە. شـارەكە سـەرباری ئەوەی لە رووی پاشـخانی مێژوويـی و قـووڵايی جوگرافييەوە سـەر بە هەرێمی كوردسـتانە، وەلێ خـاوەن پێكهـاتەيەكی كۆمەڵايەتی جياوازە. فرەنەتەوە و فرەئايين و فرەرەگەز و فرەمەزهەب خەسـڵەتێكی ديـاری پێكهـاتە كـۆمەڵايەتييەكەی شـاری كەركـووكە. بە درێژايـی مێـژوو، لە چەنـد وێسـتگەيەكی كەمـدا نەبێـت، پێكەوەژيـانی ئاشـتييانە سـيمای ديـاری كـۆمەڵگەی كەركـووكی بـووە. لەو چەنـد وێستگەيەشـدا كە ململانـێ كۆمەڵايەتييەكـان و ئيتنـی – ئايينييەكـان لە يەكتر تيژ بوونەتەوە، هۆيە بابەتی و خودی خۆيان هەبووە.

ئەم لێكـۆڵينەوەيە كە لە ژێـر ناوونيشـانی "هـۆيە كاريگەرەكـان لەسـەر بـارودۆخی كـۆمەڵايەتيی كەركـووك لە سـەردەمی پاشـايەتيدا (١٩٢١-١٩٥٨)" هەوڵێكی زانستييە بۆ بەدواداچوون و لێكدانەوەی ئەو هـۆيە زەق و گەورانەی كاريگەرييـان لەسـەر بـارودۆخی كـۆمەڵايەتيی شاری كەركووك هەبووە لە ماوەيەكی دياريكراوی هەستياردا.

**پێکهاتەی توێژینەوە:** توێژینەوەکە دوو باسی سەرەکی لەخۆ دەگرێت؛ باسی یەکەمیان، تایبەت کراوە بۆ باسی ڕۆڵی کۆمپانیای نەوتی عیراق لەسەر گۆڕانە کۆمەڵایەتییەکانی شاری کەرکووک. ئەو کۆمپانیایەی بە گوتەی شایەتحاڵ و نووسەرێکی ئەو ڕۆژگارەی شارەکە (هنری استارجیان): " شادەماری ژیانی شاری کەرکووک"ی پێکدەهێنا. باسی دووەم، تەرخانکراوە بۆ باری سیاسی و کاریگەریی لەسەر بارودۆخی کۆمەڵایەتیی شاری کەرکووک. لە میانەیدا، ئاماژە بە سیاسەت و هەڵوێستەکانی هەر یەک لە دەسەڵاتدارانی ئینگلیز و حکومەتە عیراقییە یەک لەدوایییەکانی ڕۆژگاری پاشایەتی کراوە، بەرانبەر بە پێکهاتەی کۆمەڵایەتیی شاری کەرکووک.

**ڕێبازی توێژینەوە:** توێژەر بۆ گەیشتن بە ئەنجامێکی باشتر و زانستییانەتر هەردوو ڕێبازی گێڕانەوەی مێژوویی و ڕێبازی راڤەکاری پەیڕەو کردووە لە نووسینی توێژینەوەکەدا. چونکە بابەتە کۆمەڵایەتییەکان پێویستیان بە پاشخانی مێژوویی هەیە بۆ تێگەیشتن و لێکدانەوە و هەڵوەستە لەسەرکردنیان.

**سەرچاوەکانی توێژینەوە:** بۆ ئامادەکردنی ئەم توێژینەوەیە، پشت بە چەند سەرچاوەیەکی زانستی و جێ بڕوای مێژوویی بە زمانە جیاوازەکان بەستراوە، هەر لە بەڵگەنامە و بڵاوکراوە حکومییەکان و کتێب و یادداشت و چاوپێکەوتن و وتار و توێژینەوەکان.

**یەکەم: ڕۆڵی کۆمپانیای نەوتی عیراق لە گۆڕانە کۆمەڵایەتییەکاندا:**

کاری هەڵکۆڵین لە بیرە نەوتەکانی کەرکووک (K1) کۆتاییەکانی (حوزەیرانی ١٩٢٧) لە ناوچەکانی باباگوڕگوڕ دەستی پێکرد، کە تەنیا (١٠) کیلۆمەتر لە ناوەندی شاری کەرکووکەوە دوور بوو ( Longrigg, 1968, p.71). لە ئاکامدا (١٤ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٧) نەوت بە بڕێکی زۆر دۆزرایەوە، ئەوەش ڕووداوێکی مێژوویی گرنگ و سەرەتای دەستپێکی قۆناغێکی نوێ بوو لە مێژووی ئابووریی شاری کەرکووک بە تایبەتی و عیراق بە شێوەیەکی گشتی (عبدالعزیز، ٢٠١٤، ص٧٤).

كەوتنەكاری كۆمپانیای نەوتی توركی[1] (ساڵی ١٩٢٧)، لە دواتردا كۆمپانیای نەوتی عیراقی سنووردار (Iraq Petroleum Company Limited)، هەروەها گواستنەوەی ئۆفیسی سەرەكیی كۆمپانیاكە لە شارۆچكەی دووزەوە بۆ نێوشاری كەركووك (ساڵی ١٩٣١) و دەرهێنان و هەناردەكردنی نەوت (ساڵی ١٩٣٤)، وێڕای كۆمەڵێك هۆی دیكەی سیاسی و ئابووری و كۆمەڵایەتی، پەرەسەندنێكی بەرچاوی بەسەر شاری كەركووكدا هێنا (البرازي، ١٩٦٩، ص١٢٨).

كار و پرۆژەكانی كۆمپانیای نەوت جۆربەجۆر و بە قەبارە گەورە بوون، كە بە پانتایی دەیان كیلۆمەتر درێژ دەبۆوە لە دەوروبەری شاری كەركووك، بە دەیان كارگە و دامودەزگا و ئامێری لەخۆ گرتبوو، لە بابەتی دامەزراوە (وەك وێستگەكان و كێڵگەكانی نەوت) و هۆیەكانی گواستنەوە (وەك هێڵی شەمەندەفەر)، بۆ راییكردنی كاروبارەكانی. لە سەرەتادا ژمارەی كارمەندە بیانییەكان لەم كۆمپانیا گەورەیەدا، بە تایبەت ئینگلیزەكان، زۆر بوون. بە هەزاران كارمەند و كرێكاری كارامە و ناكارامەی دانیشتووی كەركووك و دەوروبەری و گوندە دوورە دەستەكان و شارەكانی دیكەی عیراق، پەیوەندییان پێوە كرد. لەو بەرەنجامەدا و لە ماوەیەكی كورتدا، كۆمەڵگەیەكی نوێ بە خەسڵەتێكی پەی پێ نەبراو و نامۆ بە ناوچەكە هاتەبوون. ئەم كۆمپانیایە، بە هۆی جۆربەجۆری كار و پرۆژەكانی و لە ئاكامی هەمەچەشنیی كارمەندەكانی لە رووی زمان و رەگەز و زێد و داب و نەریتەوە، كاریگەری زۆری كردە سەر باری كۆمەڵایەتیی شاری كەركووك (شریف، كركوك، خریف ٢٠٠٤- شتاء ٢٠٠٥، ص٢١٥). بە وتەی شایەتحاڵێك، رۆڵی كۆمپانیای نەوت لەو گۆڕانەدا بە رادەیەك بوو، كە شاری كەركووكی لە شارێكی سەدەكانی ناوەڕاستەوە خستە باوەشی سەدەی بیستەم (استارجیان، ٢٠١٨، ص٣٢).

دەكارێت كاریگەرییەكانی كۆمپانیای نەوتی عیراق لەسەر بارودۆخی كۆمەڵایەتیی شاری كەركووك لە ماوەی دیاریكراوی لێكۆڵینەوەكەدا، بە پوختی، لەم چەند خاڵەی خوارەوەدا روون بكرێتەوە:

### ١- پێکهاتەی دانیشتوان:

أ- کۆمپانیـــای نەوتـــی عیـــراق هەر لەگەڵ دەســـتبەکاربوونی، ژمارەیەکی بەرچاوی کارمەندی (کارامە و ناکارامەی) خستەسـەر کار. ئەو کارمەنـدانە بەشـێکی زۆر کەمیـان دانیشـتووی رەسـەنی شـاری کەرکـووک بـوون. ئەمـانە لە رووی زێـد و شـوێنی لەدایکبوونیـانەوە، خەڵـک و دانیشـتووی لیواکـانی دیـکەی عیـراق بـوون، وەک: (مووسـڵ، بەغدا، رومادی، هەولێر و.. لیواکانی دیکە). هۆی سەرەکی ئەم بابەتەش دەگەڕایەوە بۆ هەنگاو و سیاسـەتەکانی بەرپرسـانی کۆمپانیـای نەوتـی عیـراق، کە بریتیبـوو لە کەمکـردنەوەی کرێـی رۆژانەی کرێکـاران و چەوســـاندنەوە و فشـــار خستنەســـەریان. بە گـــوێرەی راپـــۆرتە کارگێڕییەکانی بریتانیا لە عیراق ساڵی (١٩٢٧) کرێی مانگانەی کرێکارە عیـراقییە ناکارامەکـانی کۆمپانیـای نەوتـی عیراقـی سـنووردار تەنهـا بریتیبـووە لە (٨) رووپیە[٢] ( Iraq Administration Reports, Vol: (8), 1925-1927, P.29). ئەمە لە کاتێکدا بوو، کە کرێی کرێکارانی کارگەی رستن و چنینی فەتاح پاشا (١٨٦١-١٩٣٦) لە کرێی ئەوان زیاتر بوو. سـەرباری ئەوەش کـاتژمێری کـاری کرێکـارانی کۆمپانیـای نەوتـی عیـراق نـزیکەی (٣٠) کـاتژمێر لە کرێکارانی کـارگەی رسـتن و چنـین لە مانگێکدا زیـاتر بـوو (احمد، ١٩٨١، ص٧٤).

ب-بە گوێرەی راپۆرتی شارەوانیی کەرکووک، بارودۆخی خراپی کرێکـارانی ناکـارامەی کۆمپانیـای نەوت، لە سییەکانیشـدا، بەرەو باشـتر هەنگاوی هەڵنەگرتووە و وەکو خۆی ماوەتەوە (د.ک.و.ع، (١٩٣٢-١٩٣٨)، ص٥٣). بە گـوتەی شـایەتحاڵێک، ئەم بـارودۆخە خـراپە، وای دەکـرد کەم کەس لەنێو شـاری کەرکـووک نـاوی خـۆی لە کۆمپانیـای نەوت تۆمـار بکـات (دیمانەیەک لەگەڵ نووری فەقێ، کەرکووک، ٢٦ی مایسی ٢٠٠٥).

ج-لە بەرانبەریشـدا هەڵقـوڵینی نەوت و بەکـارکەوتنی کۆمپانیـای نەوتی عیراقی سنووردار تەکانێکی بە چالاکییە پشەسـازییەکانی عیراق و ناوچەکە دا، بووە هۆی کەمبوونەوەیەکی بەرچـاو لە رێژەی ئەوانەی

لە بواری کشتوکاڵکردندا کاریان دەکرد و زیادبوونی ڕێژەی ئەوانەی لە بواری پیشەسازیدا کەوتنەکار (Moore, 1961, p.99). هەڵبەتە روونە کە ئەو پەرەسەندنە، وەک لە خوارەوەدا بە تێروتەسەلتر روونکراوەتەوە، لەسەر حسێبی گۆڕانی پێکهاتەی کۆمەڵایەتیی شاری کەرکووک کەوتووە.

ژمارەی کرێکارانی کۆمپانیای نەوتی عیراق لە یەکەم ساڵی کارکردنیدا (١٩٢٧)، بریتیبووە لە (٢٠٠٠) تەنیا دوو هەزار کرێکار و ساڵی دواتر بووە بە (٢٥٠٠) کرێکار (Iraq Administration Reports, Vol: (8), 1925-1927, P.106). بەڵام لە ئاکامی فرۆشتنی نەوت و دەستکەوتنی داهاتێکی زۆر و بەرفرانبوونی پانتایی کارەکانی کۆمپانیای نەوت، ساڵ لەدوای ساڵ، ژمارەی کرێکارانی کۆمپانیای نەوتی عیراقی سنووردار زیادی کردووە، تاوەکو ساڵی (١٩٤٧) گەیشتووەتە ئەوپەڕی و خۆیداوە لە (١٤) هەزار کرێکار بە گوێرەی زانیارییەکانی مێژوونووس کەمال مەزهەر ئەحمەد (أحمد، ١٩٨١، ص٦١). بەڵام داتا و سەرژمێرییە حکومییەکان ژمارەیەکی دیکەیان تۆمار کردووە. لەو ساڵەدا سەرژمێرییە حکومییەکان کۆی گشتیی کارمەندانی کۆمپانیای نەوتی عیراق بە (١١٧٣٦) کارمەند هەژمار دەکەن. لەو ژمارەیە (١١١٩٤) کرێکاری عیراقی بوونە (المجموعة الاحصائية السنوية العامة لسنة ١٩٥٠، ١٩٥٢، ص١٧٠). هەرچۆنێک بێت ئەمە ژمارەیەکی زۆرە و لەباریدا هەیە پێکهاتەی دانیشتوان بە شێوەیەکی دیار، لە هەر ناوچەیەکدا بگۆڕێت. لێرەدا ئەوەی پێویستە سەرنجی بخرێتە سەر، زۆرینەی هەرە زۆری کارمەندانی کۆمپانیای نەوتی عیراق لە رەگەزی نێر بوونە، ئەمەش بە واتای راکێشان و هێنانی خاووخێزانەکانیان، لە زۆر کاتدا، بۆ نزیکی شوێنی کارکردنیان و نیشتەجێبوون تیایدا.

ژمارەی کرێکارانی کۆمپانیای نەوتی عیراق لە ساڵانی دواتردا، هەرچەندە گۆڕانکاری بەسەردا هات و بەرەو کەمبوونەوە چووە، بەڵام هێشتا هۆیەکی کاریگەر لە گۆڕانی پێکهاتەی کۆمەڵایەتیی دانیشتوانی

شـــاری كەركـــووك پێكـــدەهێنا. ئەم خشـــتەیە خـــوارەوە ئەركـــی روونكـردنەوەی ژمـارە و رەگەزنـامەی كرێكـارانی كۆمپانیـای نەوتـی عیراق، لە نێوان سـالانی (١٩٤٨-١٩٥٧)دا دەگرێتەخۆ (المجموعة الاحصائية السنوية العامة لسنة ١٩٥٢، ١٩٥٤، ص٢٣٥؛ المجموعة الاحصائية السنوية العامة لسنة ١٩٥٧، ١٩٥٨، ص١٤٠).

**خشتەی ژمارە (١)**

**ژمارە و رەگەزنامەی كارمەندانی كۆمپانیای نەوتی عیراق**

**لە نێوان سالانی (١٩٤٨-١٩٥٧)دا**

| سال | ١٩٤٨ | ١٩٤٩ | ١٩٥٠ | ١٩٥١ | ١٩٥٢ | ١٩٥٤ | ١٩٥٥ | ١٩٥٦ | ١٩٥٧ |
| --- | --- | --- | --- | --- | --- | --- | --- | --- | --- |
| عیراقی | ١٠٤٩١ | ٩٠٦٠ | ٧٢٧٢ | ٦٨٦٩ | ٧٨٨٧ | ٦٨٩٧ | ٧٠٩٥ | ٧٣٥٣ | ٧٠٠٢ |
| بیانی | ٦٠٠ | ٦٠٣ | ٥٣٣ | ٤٢٢ | ٤٤٥ | ٤٣٩ | ٤٦٤ | ٤٧٨ | ٤٢٨ |
| كۆی گشتی | ١١٠٩١ | ٩٦٦٣ | ٧٨٠٥ | ٧٢٠١ | ٨٣٣٢ | ٧٣٣٦ | ٧٥٥٩ | ٧٨٣١ | ٧٤٣٠ |

لە خشـتەی سـەرەوەدا روون دەبێـتەوە، كە ژمـارەی كارمەنـدانی عیراقـی لە سـالی (١٩٤٨)ەوە، بە بەراورد بە سـالی (١٩٤٧)، دابەزیـوە و بەرەو كەمبـوونەوە چـووە. هـۆی سـەرەكی بەرزبـوونەوەی ژمـارەی كرێكارانی عیراقی لە سالی (١٩٤٧)، بریتیبوو لە سیاسـەتی بەرپرسانی كۆمپانیـای نەوت، كە دوای مـانگرتنی كرێكـارانی كۆمپانیـای نەوت لە گاوربـاغی (١٩٤٦)، بە مەبەسـت، سـەرمایەكی زۆریـان خسـتەگەڕ بـۆ كارپێكردنی كرێكارانی عیراقی، هەروەهـا بە هـۆی فراوانكردنی پانتـایی كارەكانی كۆمپانیای نەوتی عیراق و راكێشـانی دوو هێلـی بۆڕی نەوت، بۆ بەندەرەكانی حەیفا (فەلەسـتین) و تەرابلـووس (لوبنـان)، لەو سـالەدا پێویستی بە دەستی كار زۆر زیادی كرد. ئەوەش هۆیەكی دیكە بوو بۆ بەرزبوونەوەی ژمارەی كرێكـارانی كۆمپانیـای نەوت. لە لایەكـی دیكە، كەمبـوونەوەی ژمـارەی كرێكـارانی كۆمپانیـای نەوت، لە دوای سـالی (١٩٤٨)ەوە، دەگەڕایەوە بـۆ تەواوبـوونی كارەكـانی راكێشـانی بـۆڕییە

نەوتییەکانی کۆمپانیای نەوتی عیراق، بۆ کەنار دەریای ناوەڕاست و دامەزراندن و ڕاگەیاندنی دەوڵەتی ئیسرائیل (١٩٤٨) و وەستانی هەناردەکردنی نەوت بۆ حەیفا و چەند هۆیەکی دیکە (لونكريك و ستوكس، ٢٠٠٩، ص١٥٨).

بوونی ئۆفیسی سەرەکیی کۆمپانیای نەوتی عیراقی سنووردار، لە ناوەندی شاری کەرکووک و ڕەخسانی دەرفەتی کار لە شارەکەدا، زۆرێک لە کرێکارانی شارەکانی دیکەی بۆ خۆی پەلکێشکرد (خورشيد، ٢٠٠٥، ص١٠١). بە تایبەت کاتێک دەسەڵاتدارانی کۆمپانیای نەوت، گرنگی و بایەخی تایبەتییان بە کرێکارانی مەسیحی و عەرەب دابوو، بۆ کارکردن لە پڕۆژەکانی کۆمپانیا و کورد و تورکمانەکان، بە پلەیەکی کەمتر کاریان پێدەدرا (تاڵەبانی، ٢٠٠٤، ل٥-٥١). ئەمەش وای لە ژمارەیەکی زۆری کرێکاری ناوچەکانی مووسڵ و بەغدا و دیالە و شارەکانی ناوەڕاست و خوارووی عیراق کرد، کە بە ماڵ و خێزانەوە بۆ شاری کەرکووک بگوازنەوە و بە تێپەڕینی کات ببنە هۆکارێک بۆ دروستبوونی گۆڕانی پێکهاتەی کۆمەڵایەتیی لە شارەکەدا (مينتيشاشڤيلى، ١٩٩٩، ل٣٠٠ ؛ حسين، ١٩٧٣، ص ص٧٣-٧٤؛ نجم الدين، ١٩٧٠، ص١٠٩).

کار و پڕۆژەکانی کۆمپانیای نەوتی عیراق و درامەتە جۆربەجۆرەکانی، کاریگەرییان کردبووە سەر باشبوونی ئاستەکانی بژێویی هاووڵاتیانی کەرکووک. لەو ئاکامەشدا ژمارەی دانیشتوانی قەزای ناوەندیی کەرکووک، لە چلەکان و پەنجایەکانی سەدەی بیستەمدا، لە بەرەنجامی کۆمەڵێک هۆ، لەوانەش: (باشبوونی بژێوی دانیشتوان، باشبوونی ڕەوشی تەندروستی، زێدەبوونی ژمارەی لەدایکبووان، هەروا دیاردەی کۆچی نێوخۆیی دانیشتوان بۆ بەدەستخستنی کار و دەرفەت لە کەرتی نەوتدا)، بەردەوام لە هەڵکشاندا بووە (عبدالعزيز، ٢٠١٤، ص١٩٩؛ البرازي والعاني، ١٩٧٩، ص١٤٢).

کاریگەریی کۆمپانیای نەوتی عیراق لەسەر پێکهاتەی دانیشتوانی کەرکووک، لە دە ساڵەی کۆتایی ڕۆژگاری پاشایەتیدا، زۆر زەقتر دەرکەوت. بە گوێرە داتا و زانیارییەکانی ئامارە فەرمییەکانی حکومەتی

عیراق، دانیشتوانی قەزای ناوەندیی كەركووك، لە ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٤٧-١٩٥٧)دا، پەرەسەندنێكی گەورەی لێهاتۆتە ئارا. بەپێی زانیارییە تۆماركراوەكانی سەرژمێریی گشتیی دانیشتوانی ساڵی (١٩٤٧)، ژمارەی دانیشتوانی قەزای ناوەندیی كەركووك بریتیبووە لە (٩١٥٨٢) كەس (إحصاء السكان لسنة ١٩٤٧، الجزء الثاني، لواء كركوك، ص١٠٣). كەچی ژمارەی دانیشتوانی قەزای ناوەندیی كەركووك لە سەرژمێریی گشتیی دانیشتوان بۆ ساڵی (١٩٥٧)، خۆیداوە لە (٢٢١٨٥١) كەس (المجموعة الإحصائية لتسجيل عام ١٩٥٧، لوائي السليمانية و كركوك، ص١٤٥).

ئەم پەرەسەندنە ناسروشتییە لە ژمارەی دانیشتوانی قەزای ناوەندیی كەركووك، كە بە رادەی جیاوازیی نێوان دوو سەرژمێرییە فەرمییەكە، بریتییە لە (١٣٠٢٦٩) كەس، سەرباری كۆچی نێوخۆیی دانیشتوانی گوندەكان بۆ ناوشارەكان، بەڵگە و ئاماژەیەكی روونی رۆڵی كۆمپانیای نەوتی عیراقی سنوردارە، لە دروستكردنی گۆڕان لە پێكهاتەی كۆمەڵایەتیی دانیشتوان. چونكە زۆرێك لەوانەی لە ماوەی ئەو دوو سەرژمێرییەدا هاتبوونە شارەكە بە هۆی كارەوە بووە.

بێسوود نابێت لەم رووەوە، بۆ روونكردنەوەی زیاتری ئەم بابەتە، بەراوردێك لە نێوان رێژەی زیدەبوونی دانیشتوانی قەزا ناوەندییەكانی لیوا كوردییەكانی دیكەی ناوچەكە، لەگەڵ قەزای ناوەندیی كەركووك بكرێت (إحصاء السكان لسنة ١٩٤٧؛ المجموعة الإحصائية لتسجيل عام ١٩٥٧).

**خشتەی ژمارە (٢)**

**رێژەی زیدەبوونی دانیشتوانی قەزای ناوەندیی كەركووك بە بەراورد بە قەزا ناوەندییەكانی دیكەی لیوا كوردییەكان.**

| قەزای ناوەندی | ژمارەی دانیشتوان | | زیدەبوونی نێوان دوو ئامارەكە |
|---|---|---|---|
| | ١٩٤٧ | ١٩٥٧ | |
| كەركووك | ٩١.٥٨٢ | ٢٢١.٨٥١ | ١٣٠.٢٦٩ |
| سلێمانی | ٤٣.٠١٤ | ١١٠.١٧١ | ٦٧.١٥٧ |
| هەولێر | ٢٦.٨٨٥ | ٨٤.٥٣٦ | ٥٧.٦٥١ |

لە خشتەی ژمارە (٢)ی سەرەوەدا، بە روونی دەردەکەوێت، کە ژمارەی زێدەبوونی قەزای ناوەندیی کەرکووک، بە بەراورد بە قەزا ناوەندییەکانی سلێمانی و هەولێر زۆر زیاترە، بە ڕادەی دوو هێندە. هەڵبەتە دیارە کە لەو رۆژگارەدا، شاری کەرکووک بنکە فراوانتر و شارێکی باشتری کار پەیداکردن بووە و لە رووی پیشەسازییەوە پێشکەوتووتر بووە. هۆی زۆری ئەو بارودۆخەش بۆ پڕۆژە زۆرەکانی کۆمپانیای نەوتی عیراق دەگەڕایەوە لە شارەکەدا، وەک لە بابەتەکانی خوارەوەدا خراونەتە بەرباس و توێژینەوە.

**٢- دابەشبوونی جوگرافیی دانیشتوان:**

شاری کەرکووک لە ماوەی لێکۆڵینەوەکەماندا، بریتیبووە لە سێ بەشی سەرەکی: (قەڵا، بەرقەڵا، قۆریە). بەشی قۆریە، کە بە تەنیا دەکەوێتە ئەوبەری چەمی خاسە و رۆژئاوای شار، لەچاو بەشەکانی دیکەی شاردا مێژوویەکی نوێی هەیە. کۆتاییەکانی رۆژگاری عوسمانی لە سێ گەڕەکی سەرەکی پێکدەهات: (بەگلەر، شاترلوو، ساری کەهیە). زۆرینەی دانیشتوانی تورکمان و بڕێکیش لە نەتەوە و رەگەزە جۆربەجۆرەکانی دیکەی تێدا نیشتەجێ ببوون (موصل ولایتی سالنامەسي، (١٣١٢هجری/ ١٨٩٤میلادی)، ص٢٩٩). سەربارى ئەوەی ئۆفیسی سەرەکیی کۆمپانیای نەوتی عیراق کەوتبووە ئەم بەشەی شار. بە تێپەڕینی ساڵ و لە ئاکامی کار و پڕۆژەکانی کۆمپانیای نەوت، وێڕای هۆی دیکە، باری ئاوەدانی ئەم بەشەی شاری کەرکووک، بە بەراورد بە بەشەکانی دیکەی شار، پەرەسەندنی زۆری بەخۆوە گرت.

رۆڵی کۆمپانیای نەوت لە گۆڕینی شێوە دابەشبوونی جوگرافیی دانیشتوانی شاری کەرکووک، لە رۆژگاری پاشایەتی بەرچاو و دیارە. هەر لە سەرەتای کارکردنی کۆمپانیاوە لە بیرە نەوتی بابەگوڕگوڕدا، یان بە دەربڕینی دەسەڵاتدارانی کۆمپانیا، (کەیوەن)[٣] (K-1)، وردە وردە باری ئاوەدانی لە نزیک شوێنی کار و پڕۆژەکانی کۆمپانیا گۆڕانی بەسەردا هات و کرێکاران و ئەوانەی بۆ خزمەتی کۆمپانیا کاریان

دەكرد، ماڵ و حاڵیان بۆ نزیک كارەكانی خۆیان گواستەوە. چونكە لە سەرەتادا هۆیەكانی گەیاندن و گواستنەوە دواكەوتوو بوو. كرێكاران كە زۆریان لە بەشەكانی دیكەی شار نیشتەجێبوون، دەبوو بە پێ، یا لە رێگەی هۆیە سەرەتاییەكانی گواستنەوە، بگەنە سەر كارەكانیان. لەو ئاكامەدا، هێدی هێدی بەشی قۆریە ئاوەدانی زیاتری تێكەوت و لە نزیک كێڵگەی نەوتی بابەگوڕگوڕ، ئاوەدانی تازە پەیدابوون. هۆی ئەوەش دەگەڕایەوە بۆ ئەو كرێكارانەی لە كۆمپانیای نەوت كاریان دەكرد، رەشۆكی خەڵک بوون و سەرمایە و سامانێكی وایان نەبوو، كە لە توانیاندا هەبێت خانوو لە گەڕەكەكانی قۆریە بكڕن، یان لانیكەم، زۆرینەیان خانوو لەو گەڕەكانە بە كرێ بگرن (دیمانە لەگەڵ نووری فەقێ، كەركووک، ٢٦ی مایسی ٢٠٠٥).

هاوهەنگاو لەگەڵ دروستبوونی كۆمەڵی نوێی ئاوەدانی لە بەشی قۆریە، باری ئاوەدانی گەڕەكەكانی بەشەكانی دیكەی شار لە كورتی داوە. لە بەرانبەردا گەڕەكەكانی بەشی قۆریە، ساڵ دوای ساڵ، ئاوەدانتر و گەورەتر بووە. بە گوێرەی زانیاریی لێكۆڵینەوەیەكی مێژوویی دەربارەی (گەڕەكەكانی شاری كەركووک لە سەردەمی پاشایەتیدا) هەندێک لە گەڕەكەكانی قەڵا: (نموونەی گەڕەكی حەمام مەسیحی) و بەرقەڵا: (نموونەی گەڕەكی چای) ژمارەی دانیشتوانی لە كورتی داوە بۆ بەرژەوەندی گەڕەكەكانی بەشی قۆریە (عبدالرحمن، ٢٠١٢، ل٣٠-٥٦).

هۆیەكی دیاری ئەو بابەتە دەگەڕایەوە بۆ رۆڵی بەرچاوی كۆمپانیای نەوت، لە گەشانەوە و باری پڕ لە ئاوەدانی و پەیدابوونی سیما و رووخسارەكانی شارستانی و سەردەمییانە لەم بەشەی شاردا. چونكە لە ساڵی (١٩٣٠)ەوە، كۆمپانیای نەوتی عیراق دەستی كردووە بە دروستكردنی یەكەكانی نیشتەجێبوون بۆ كارمەندەكانی، بە شێوازێكی سەردەمییانە و پێشكەوتوو، لە ناوچەی مێژوویی (عەرەفە)، كە بە نمرە یەک (First Classes) ناوزەد كرا. ئەوەی كە لە دواتردا، پێی دەوترا

(عەرەفەی یەکەم). ئەم پـرۆژەیە لە سـاڵی (١٩٥٠)دا کۆتـایی پێهـات. نەخشەسازیی ئەم یەکانە تەواو پێچەوانەی خانووە کۆنەکانی شاری کەرکـووک بـوون. سـەرباری ئەمە، کۆمپانیـای نەوت هاوکـات چەنـدان یەکەی نیشتەجێبوونی دیکەی لە ناوچەی عەرەفە بنیادنا، کە بە بابـای رۆژهەڵات (East Baba) ناوزەدیان کردبوو (عبدالعزیز، ٢٠١٤، ص٢٤٢).

لە دوای سـاڵانی جەنگـی دووەمـی جیهـانییش، کۆمپانیـای نەوتـی عیراق ساڵی (١٩٤٧)، بە مەبەستی برەودان بە کارەکانی، دەستیکرد بە دروستکردنی چەندان یەکەی نیشتەجێبوونی نوێ لە ناوچەی جیاجیا، بە کوالیتیکی بەرز و پڕ لە حەسانەوە بۆ کارمەندەکانی. ساڵی (١٩٤٩) بەشـێکیان تەواو بـوون (Longrigg, 1968, p.178). ئەو یەکـانە بە بابـای رۆژئـاوا (West Baba) نـاوزەدکران. چونکە دەکەوتنە بەشـی رۆژئـاوای کـێڵگەی نەوتـی بـابەگوڕگوڕ. لە سـاڵانی دواتریشـدا، (١٩٥٠-١٩٥٥) چەندان یەکەی نیشتەجێبوونی دیکە (Second Classes) و (Third Classes) بەو شـێوازە پێشـکەوتووە لە کەرکـووک دروسـتکران. کـۆی گشـتیی یەکەکـانی نیشـتەجێبوون کە لە لایەن کۆمپانیـای نەوتەوە لە شـاری کەرکووک دروستکران خۆیدا لە (٧٧٨) یەکە (عبدالعزیز، ٢٠١٤، ص٢٤٣).

ئەوەی تێبینـی گەورە، سـەبارەت بە رۆڵـی کۆمپانیـای نەوت، لە گـۆڕینی دابەشـبوونی جـوگرافیی دانیشـتوانی کەرکـووک هەڵـدەگرێت، بـریتییە لە خـزین و رووتێکردنـی بەشـێکی زۆری مەسـیحییەکانی کەرکـووک، بەرەو بەشـی قـۆریە بە مەبەسـتی نیشـتەجێبوون. مەسـیحییەکان کە لە لایەن بەرپرسـانی کۆمپانیـای نەوتەوە حسـێبی تایبەتیان بۆ کراوە و بەشێکی بەرچاوی کارمەندانی کۆمپانیای نەوت لەوان وەرگیراون، لە سییەکانەوە، روویان لە گەڕەکەکانی بەشی قۆریە کـردووە. ئەوەش بە پـلە یەک بە هـۆی کۆمپانیـای نەوت و خزمەتگوزارییەکـانی لەم بەشـەی شـاردا هەبـوون، لە (دروسـتکردنی شـەقامی فـراوان و هەڵمەتـی رازانـدنەوەی شـەقامەکان بە روواندنی دارودرەخـت لەمـبەر و ئەوبەری شـەقامەکان و رووناککردنەوەیـان لە

شـەواندا بە تەزووی کارەبـا و..هتـد)، هەروەهـا لە پلەیەکـی دواتـردا، بە هۆی بەرزبوونەوەی ئاستی بژێوی و داهاتیان، لە قۆناغێکی درەنگتردا، وای کـردووە خـانووە کۆنەکانیـان بەجـێ بهـێڵن، چـونکە لەگەڵ پـێگەی ئـابووری و کـۆمەڵایەتیی نوێیـان نەگونجـاو بـووە. داهـاتی تـاکی کەرکـووکی بە هـۆی رۆڵـی کۆمپانیـای نەوت و جێبەجێکردنـی پـرۆژە جۆربەجۆرەکـانی و گەشـانەوەی بـاری ئـابووری شـارەکە، لە سـاڵی (١٩٥٦)دا، لە رووی بەرزیـی داهـاتی تـاکەوە، لە دوای شـاری بەغـدای پایتەخت هاتووە (حسیب، ١٩٦٤، ص ص٤٢٠-٤٢١).

لەو ئاکـامەدا، گەڕەکە سـەرەکییەکانی بەشـی قـۆریە، سـاڵ دوای سـاڵ دانیشـتوانی مەسـیحی زێتـر بـووە، بە ئەنـدازەیەک گەیشـتووە، کە زۆرینەیان شوێنی رەسەنی خۆیان، کە گەڕەکی (حەمام مەسیحی) بووە لەسـەر قەڵا، جێهێشـتووە و روویـان لە گەڕەکەکـانی بەشـی قـۆریە کـردووە. ئەو رۆژگـارە، خەڵـک وەک دیـاردەیەکی مـۆدێرن روویـان لە بەشی قۆریە کردووە (عرب اغا و ملا مصطفی، ١٩٥٧، صص٤٨-٤٩).

بە گـوێرەی سـەرژمێریی گشـتیی دانیشـتوان بـۆ سـاڵی (١٩٥٧) لە کـۆی گشـتی (١٢٦٩١) مەسـیحیی ناوشـاری کەرکـووک، تەنیـا (٨٣٠) مەسـیحی لە گەڕەکەکـانی قەڵا و بەرقەڵا مـاونەتەوە (المجموعـة الإحصـائية لتسجيل عام ١٩٥٧، لوائي السليمانية و كركوك، ص ص١٦٨-١٧٠).

لە کـۆی گشـتیی دانیشـتوانی مەسـیحیی شـاری کەرکـووک تەنیـا (٥٣٢٦) کەسـیان خەڵکـی رەسـەنی کەرکـووکن، ئەوانەی دیـکە زێـد و شـوێنی لەدایکبوونیـان لیواکـانی دیکەی عیـراقە، وەک: (مووسـڵ (٢٨٣٥) کەس، بەغـداد (٩٠٨) کەس، هەولێـر (٨٧٩) کەس، رومـادی و بـادیەی شـیمالی (٣٨٠) کەس)، یـان خەڵکـی دەرەوەی عیـراقن، وەک: (تورکیـا (١١٦٣) کەس، ئەوروپـا (٦٣٩) کەس، ئێـران (١٦٠) کەس). پێویسـتە بوترێـت، ئەم ژمـارانە کـۆکراوەی رەگەزی نێـر و مێیە کە بە نزیکەیـی هاوتەریبن لەگەڵ یەکدا (المجموعة الإحصائية لتسجيل عام ١٩٥٧، لوائي السليمانية و كركوك، ص ص٢٣٦-٢٣٨). ئەمەش بە واتـای ئەوە دێـت کە زۆریـنەی هەرە

زۆریـان بـۆ کـارکرن لە کۆمپانیـای نەوت هـاتوونەتە شـارەکە و لەگەڵ خۆیاندا خاوخێزانیشیان هێناوە.

بە هەمـان رەوت و ئاسـت، خەڵکێکـی زۆر لە نەتەوەی عەرەب بە هـۆی کۆمپانیـای نەوتـی عیـراقەوە، بە خێزانەکانیـانەوە هـاتنە شـاری کەرکـووک و تیـادا نیشـتەجێبوون. کۆمپانیـای نەوت پـاش ئەوەی دەسـتیکرد بە راکێشـانی هێڵـی بـۆڕییە نەوتییەکـان بـۆ سـەر کەنـاری دەریـای ناوەڕاسـت، پێویسـتی بە دەسـتی کـار زیـادی کـرد. لە لایەکـی دیکەش ئەو بۆڕییانە بە ناوچەی لادێنشینە عەرەبییەکان تێدەپەڕی، بۆیە کۆمپانیا خەڵکێکی زۆری ئەو ناوچانەی لە وێستگە و پرۆژەکانی خۆیدا کـارپێکرد. ئەمـانە دوای پەیداکردنی ئەزمـوون و لە نـزیکەوە ئاشـنایەتی پەیـداکردنیان بە پێشـکەوتنە شارسـتانیەکان، چاویـان بـڕییە ژیـانێکی فەراهـامتر و شایسـتەتر، بـۆیە لە دواتـردا کـۆمەڵ کـۆمەڵ روویـان لە شـاری کەرکـووک کـرد بـۆ نیشـتەجیبوون و کارپەیـداکردن. بە هـۆی ئەوەش، بە شێوەیەکی گەورە و بە تێکڕای (٣٩,٣%)، رێژەی دانیشتوانی شارنشینی لە کەرکووک ساڵی (١٩٥٧) زیـادی کـردووە (السمـاک، د.ت، ص٩٧).

### ٣- پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی دانیشتوان:

پەیوەنـدییە کۆمەڵایەتییەکـانی مەیسـیحییەکانی شـار لەگەڵ موسـڵمانەکان بە تێپەڕینـی کـات لە سـەردەمی کۆتـایی پاشـایەتی بەش بەشـبوونی بەخـۆوە گـرت، ئەوانەی لەسـەر قەڵا مـابوونەوە بە هـۆی بەهێزیی پەیوەندییەکانیان لەگەڵ دانیشتوان جیا نەدەکرانەوە. کەچی ئەو بەشەیان کە لە بەشی قۆریە، لە گەڕەکی (کەرکووکی نوێ) (عەرەفە) و گەڕەکە نزیکەکانی نیشتەجێبوون، پەیوەندییەکی لاوازی کۆمەڵایەتییـان هەبـوو بە دانیشـتوانی کەرکـووکەوە. ئەم بەشـەیان لەنێـو شـاردا، کۆمەڵێکی جیاواز و گۆشەگیری کۆمەڵایەتییان پێکهێناوە. چونکە ئەمـانە لە بنەڕەتدا زۆریان لە دەرەوەی کەرکووک روویان کردبووە ئەم شارە

و زۆربەیان بۆ كاركردن، لە لای ئینگلیزەكان و لە دواییدا لە كۆمپانیای نەوت دەست بەكاربوون (Galletti, Assyrain Academic Studies, 2005, p.22).

**٤- خوێندن و فێركردن:**

پێش هەموو شت كۆمپانیای نەوت كاریگەری بەرچاوی لەسەر فێربوونی زمانی شاری كەركووك هەبوو، ئەویش بە دوو چەشن: یەكەمیان بریتیبوو لە فێربوونی زمانی ئینگلیزی لە لایەن كارمەند و كرێكاران بە هۆی بەشداربوونیان لە كارەكانی كۆمپانیا و مامەڵەكردنیان لەگەڵ كارمەندە بیانییەكانی دیكەی كۆمپانیای نەوت. ئەم بارودۆخە، كاریگەری كردە سەر ناوشاری كەركووك و سەری كێشا بۆ ئەوانەی لەناو شاری كەركووك مامەڵەی كڕین و فرۆشتنیان لەگەڵ كۆمپانیای نەوت دەكرد. دووەمیان بریتیبوو لە گۆڕانێكی چۆنێتی لە شێوەزاری كوردیی شاری كەركووك. لە ئاكامی هاتنی كرێكارانی كوردی لیواكانی هەولێر و مووسڵ بۆ كاركردن لە كۆمپانیای نەوت، بە تێپەڕینی كات، گۆڕان بەسەر شێوەزاری كوردیی شاری كەركووكدا هات (شریف، كركوك، خریف ٢٠٠٤- شتاء ٢٠٠٥، ص ص٢١٥-٢١٦).

كۆمپانیای نەوتی عیراق لە زۆر باردا هاوكاریی دەسەلاتدارانی كەركووكی كردووە، سەبارەت بە دروستكردنی قوتابخانەی نوێ و باربووكردنی رەوشی خوێندن و فێركردن لە رێگەی دابینكردنی دارایی پێویست. كۆمپانیای نەوت رۆڵی دیاری لە بنیاتنانی قوتابخانە بۆ منداڵانی كارمەندەكانی هەبوو، بە هاوكاری لەگەڵ حكومەتی عیراقی. ئەو قوتابخانانە لە لایەن وەزارەتی مەعاریفەوە سەرپەرشتی دەكران و كادری فێركردنی بۆیان دابین دەكرد. سەرباری ئەوەش بۆ خۆی گرنگییەكی تایبەتی بە پێگەیاندنی كادیری شارەزای بواری پیشەسازی داوە، لە كارمەندان و دانیشتوانی شاری كەركووك و ناوچەكە. ساڵی (١٩٥١) (ناوەندی راهێنانی پیشەسازی) لە عەرەفە دامەزراند. ئەم ناوەندە لە هەموو عیراق بێوێنە بوو، چونكە سەرجەم خوولەكانی لە یەك كاتدا هەردوو بواری تیۆری و پراكتیكی تیایدا دەخوێندرا.

ناوەندەکە کە لە باڵەخانەیەکی دوو نهۆمی گەورە پێکهاتبوو، خاوەنی بەشی فرەچەشن و چەند هۆڵێکی نموونەیی وانەوتنەوە بوو، کە شاشەی سینەمایان تێدا بوو. ئەم ناوەندە مەشقی پیشەسازی بە گەنج و لاوە دەرچووەکانی قوتابخانە حکومییەکانی شاری کەرکووک دەکرد. ئامانجی کۆمپانیا لەم ناوەندە، پێگەیاندنی کادیری شارەزا بوو لە بوارەکانی پیشەوەری و هونەری و نووسیاری و بەکاربەرانی بازرگانی (عرب اغا و ملا مصطفی، ١٩٥٧، ص١١٩).

ناوەندی راهێنانی پیشەسازی بایەخێکی تایبەتی بە کردنەوەی خوولەکان دەدا. چونکە لە رێگەی ئەم خوولانەوە دەیانویست کادیری شارەزا و بە ئەزموون لە کەرکووکییەکان و خەڵکی ناوچەکە دروست بکەن. ساڵانە خوولەکان بە شێوەیەکی بەردەوام بەڕێوەدەچوون. ساڵی (١٩٥٦) حەوت خوولی جیاجیا بەڕێوەچووە، بەمجۆرە (عرب اغا و ملا مصطفی، ١٩٥٧، ص ص١١٩-١٢١؛ المراسل، أهل النفط، حزيران ١٩٥٦، ص ص٤٨-٤٩):

یەکەم: خوولەکانی راهێنانی هونەری: بە شێوەیەکی ساڵانە بۆ ئەم خووله (٦٠) گەنجی خاوەن بڕوانامەی بەکالۆریی سەرەتایی وەردەگیران، کە تەمەنیان سەروو شانزە ساڵییە. ماوەی خوولەکە (٥) ساڵ بوو. تیایدا بابەتەکانی ماتماتیک، زانست، ئەندازە، مەشقکردن لە تاقیگە و کارگە. پاشان بابەتەکانی ئەندازەی میکانیک و ئەندازەی کارەبا و ئەندازەی شارستانی، کیمیا و فیزیا، پشکنینی نەوت و مامەڵە بازرگانییەکان دەخوێندران. لە کۆتایی خوولەکەدا، تاقیکردنەوەیان پێدەکرا و دەبوونە خاوەن بڕوانامەیەکی باوەڕپێکراوی جیهانی، لە بواری راهێنانی پیشەسازی و بازرگانی. هەمووشیان بە درێژایی ماوەی خوولەکە مووچەی مانگانەیان پێدەدرا.

دووەم: خوولەکانی راهێنانی پیشەیی: ماوەی خوولەکە دوو ساڵ بوو. ساڵانە (٤٠-٨٠) کەس وەردەگیران. ئامانجی خوولەکە پێگەیاندن و دەرچواندنی کادیری شارەزا لە بوارەکانی ساردکەرەوە، دارتاشی، لەحیمچێتی، چاککەرەوەی ئامێرەکان و.. هتد بوو. لە کاتی تەواوبوونی

خـوولەکە کۆمپانیـا وەک سـەرۆکی کرێکـاران و چـاودێرانی هـونەری دایدەمەزراندن.

سێیەم: خوولەکانی راهێنانی بازرگانی: ماوەی خـوولەکە نۆ مانگ بوو. ئامانج لێی راهێنان و پێگەیاندنی گەنجان بوو، تاوەکو لە دواتردا لە کۆمپانیا ئەرکەکانی تۆمار و نووسین لەئەستۆ بگرن. سێ قۆناغی جیای هەبوو: ساڵانە (٢٠) کەس بۆ ئەم خووله وەردەگیرا.

چوارەم: خوولەکـانی شـەوانەی پێگەیشـتووان: ئەم خـووله بـۆ ئەو کەسانە بوو کە لە خوێندنی شەوانە دەیانخوێند. بۆ ئەوەی ماوەیـان بـۆ برەخسـێنن تـاوەکو دواتـر لە کۆمپانیـا بکەونە کـار. هەفتـانە پێنج رۆژ خـوولەکە بەڕێوەدەچـوو، بـۆ مـاوەی (١٤) هەفـتە. ئامـانج لەم خـووله، پێگەیاندنی بەشداربووان بوو لە بواری کاری پراکتیکی کێڵگەی نەوت. ساڵی (١٩٥٣) (٤٠٠) کەس لەم خوولەدا بەشداربوونە.

پێنجەم: خوولەکانی راهێنـانی سەرپەرشـتیاران: ئامـانج لەم خـووله راهێنـــان بـــوو بە بەشـــداربووان بـــۆ ئەوەی کـــادیری شـــارەزا و بە ئەزموونیان لێ دروست بێت، تاوەکو لە کۆتاییدا وەک سەرپەرشـتیاری کرێکـارانی کۆمپانیـا بکەونە کـار. مەبەسـت لە خـوولەکە جەختکـردنەوە بـــوو لە بنەڕەتەکـــانی: (راهێنـــانی کـــارکردن)، (شـــێوازی کـــارکرن)، (پەیوەندییەکانی کارکردن).

شەشـەم: خوولەکـانی راهێنـانی بازرگـانیی تایبەتمەنـد: پـرۆژەیەک بـوو بە مەبەسـتی نـاردنی کارمەنـدانی کۆمپانیـا بـۆ بریتانیـا. مـاوەی خـــوولەکە (٦-٩) مانـــگ بـــوو. ســـاڵانە (١٢) کەس رەوانە دەکـــران بـــۆ خوێنـدن لەو وڵاتە. بە مەبەسـتی پێشخسـتنی ئاسـتی بەشـداربوون و سوودوەرگرتن لێیان لە دوای گەڕانەوەیان.

حەوتەم: خوولەکـانی زمـانی عەرەبی: ئەم خـوولانە بۆ بیانییەکـان دەکرانەوە، تاوەکو ئاشنایەتیان بە زمانی فەرمی دەوڵەتی عیراقی هەبێت و پەیوەنـدییەکانیان بە هەمـوو کارمەنـدان بەهێـز ببێـت و ناحـاڵیبوون لەگەڵ خەڵکی ناوچەکە دروست نەبێت.

لە ئەنجامی ڕێككەوتنی نوێی نێوان كۆمپانیای نەوتی عیراقی سنووردار (I.P.C.) و كۆمپانیا نەوتییەكانی دیكە، لەگەڵ حكومەتی عیراق (نووری سەعید)، لە (شوباتی ١٩٥٢)دا، كە بە ڕێككەوتنی وەكیەكی قازانج (مناصفة الارباح) ناسرا، بە گوێرەی ئەو ڕێككەوتنە دەبوو كۆمپانیا بڕە پارەیەک تەرخان بكات، بۆ خوێندنی قوتابیانی عیراقی لە زانكۆ بریتانییەكان، هەروەها كردنەوەی ناوەندەكانی مەشق و ڕاهێنان بۆ كارمەندانی عیراقی لە بواری پیشەسازیی نەوت (عبدالعزیز، ٢٠١٤، ص٩٠). لەو ئاكامەشدا، قوتابییەكی بەرچاوی كەركووكی، بە هۆی پشتگیرییە داراییەكانی كۆمپانیای نەوت، توانیان خوێندنی بەرز لە بریتانیا تەواو بكەن، لەوانە: هنری استارجیانی ئەرمەنی بوو لە بواری پزیشكی (استارجیان، ٢٠١٨، ص٨٩).

كۆمپانیای نەوت سەرباری ئەوانەش، ڕۆڵی دیاری لە چالاككردنی بزاڤی ڕۆشنبیری لەنێو كارمەندەكانی لە ڕێگەی مەڵبەند و ناوەندەكانی ڕاگەیاندنی تایبەت بە خۆیەوە گێڕاوە، بە دەرچوواندن و بڵاوكردنەوەی بڵاوكراوە و وەرزنامەی تایبەت بە خۆی، لە نموونەی: گۆڤاری (أهل النفط)، گۆڤاری (Iraq Petroleum) و.. هتد. ئامانجی كۆمپانیای نەوت لەم چاپكراوانە، بریتیبوو لە گەیاندنی هەواڵ و زانیارییەكانی ڕابوونی ڕۆشنبیری و كۆمەڵایەتی و بیناسازی و پیشەسازییەكانی كۆمپانیا بە كارمەندان و خێزانەكانیان. وێڕای ئەوەش ئامرازێک بوو بۆ گەیشتن و بەدەستخستنی لایەنی شارستانیانە، لە سۆنگەی بڵاوكردنەوەی بابەتە ئەدەبی و كۆمەڵایەتییەكانی خاوەن فیكر و ڕاگەیاندنكار و ئەدیبەكانی شارەكە.

**٥- بارودۆخی تەندروستی:**

شاری كەركووک لە سەردەمی پاشایەتی بە هۆی بوونی كۆمپانیای نەوتەوە، لە چارەسەری پزیشكی پێش زۆربەی شارەكانی دیكەی عیراق كەوتووە. بارودۆخی تەندروستیی دانیشتوانی كەركووک بە بەراورد بە ناوچە و شارەكانی دیكەی عیراق، چەند هەنگاوێک

لەپێشتر بووە. ساڵی (١٩٣٧) نەخۆشخانەی کەیوان (K1) کرایەوە، کە (٤٤) قەرەوێڵەی لەخۆ دەگرت، بە تێپەڕینی کات گەیشتە (١٢٥) قەرەوێڵە. باشترین ئامێر و پێداویستییە پزیشکییەکان و قاووشی نەشتەرگەری و شوێنی بینینی نەخۆش و بەشی تیشک و چارەسەری سروشتی و ناوەندی پزیشکیی ددانی لەخۆ دەگرت. سەرباری ئەوانەش شوێنی تایبەت بۆ منداڵبوون و سووتان تیایدا ئامادە کرابوو (عبدالعزیز، ٢٠١٤، ص٢٠٩).

نەخۆشخانەکە بە یەکێک لە باشترین نەخۆشخانەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست هەژمار کراوە. سەرباری ئەوەش باربووی کەسانی نەخۆش و پیر و پەککەوتە و ئەو کارمەندانەی مۆڵەتی نەخۆشییان هەبووە، کردووە. (لونکریک وستوکس، ٢٠٠٩، ص١٦٢).

ستافی نەخۆشخانەی کەیوان لە پزیشکی یەکەم و برینپێچێک و چەند پزیشکێکی دیکە پێکهاتبوو. هەروەها ژمارەیەک پەرستار کە لە سەرۆکێک و (١١) پەرستاری مەشقپێکراو لە نەخۆشخانەکە خزمەتیان کردووە. دوو دەرمانساز و پسپۆڕێکی تیشک و سێ کارمەندی شارەزای تاقیگەش لە نەخۆیشخانەکە هەبوون (المراسل، أهل النفط، تشرین الاول ١٩٥١، ص١٤).

سەرجەم ستاف و کادری نەخۆشخانەی کەیوان و ناوەندە پزیشکییەکانی کۆمپانیای نەوتی عیراق بە رەگەز بریتانی بوون. نەخۆشخانە و ناوەندەکانی سەر بە کۆمپانیا بێ بەرانبەر چارەسەری کارمەندان و کرێکارانی کۆمپانیاکەیان کردووە. ساڵی (١٩٤٦) نەخۆشخانەی کەیوان (٢٦٠٤) نەخۆشی چارەسەر کردووە، کە تێکڕای مانەوەی نەخۆشەکان لە نەخۆشخانە بریتیبووە لە (١٠) رۆژ (حسن، ١٩٤٧، ص٤٦).

نەخۆشخانەی کەیوان بایەخی تایبەتی بە پزیشکیی خۆپارێزیی داوە، هەموو ساڵێک کارمەندان و کرێکارانی کۆمپانیا پشکنینی پزیشکی و تیشکییان بۆ کراوە. هەڵمەتی کوتانیان دژی نەخۆشی خوریکە بۆ

كارمەندەكان ئەنجامداوە، بە هەمان شێوە پێكوتەی دژی نەخۆشی تیفۆ و ئیفلیجبوون و هەموو نەخۆشییەكانی دیكە بە منداڵەكانیان داوە. بۆ نموونە ساڵی (١٩٥٢) (٢٨٠٠٠) كەس پێكوتەیان وەرگرتووە و (١٥٠٠٠) كەسیش پشكنینی ئاساییان بۆ ئەنجامدراوە. نەخۆشخانەی كەیوان سەرباری چاودێریی پزیشكیی بۆ كارمەند و كرێكارەكانی، چارەسەری زۆری خێزانەكانیشیان كردووە. ئۆتۆمۆبێلی ئەمبوولانسی بە خۆرایی لە خزمەتی خەڵك و خێزانی كارمەندەكان بەكارهێناوە (عبدالعزیز، ٢٠١٤، ص٢١١).

**٦- خزمەتگوزارییە گشتییەكان:**

كۆمپانیای نەوتی عیراق وەك بوار و كایەكانی دیكە رۆڵێكی بەرچاوی لە پێشكەشكردنی خزمەتگوزارییە گشتییەكانی شاری كەركووكدا هەبووە. ئەو خزمەتگوزارییانەی لە چەندین رووەوە بە روونی جێ پەنجەی خۆی نەخشاندووە، وەك: راكێشانی ئاوی پاك بۆ شاری كەركووك لە رێگەی بۆری گەورەوە، ساڵی (١٩٣١) و ساڵانی دواتر. رووناككردنەوەی شەقام و شوێنە گشتییەكانی شاری كەركووك لە سەرەتادا بە تەزووی كارەبا. یەكەم وێستگەی كارەباش ساڵی (١٩٣٠) دەستی بەكار كرد (عبدالعزیز، ٢٠١٤، ص٢٢٩-٢٣٤). دروستكردن و چاككردنەوەی رێگاوبانەكان و رازاندنەوەیان بە دار و درەختی جوان و سەوزكردنی شار (لانكلی، ١٩٦٣، ص٦٦). كۆمپانیای نەوتی عیراق رۆڵی بەرچاوی هەبوو لە خۆشبوونی رێگاوبانەكانی كەركووك و قیرتاوكردنی[٤] بەشێكی زۆریان و رایەڵكردنی شەقام و رێگای نوێ و هاوكاریكردنی چەند پرۆژەیەك لەنێو شاردا، كە خزمەتی بەرژەوەندییەكانی كۆمپانیای نەوتی دەكرد (عبدالرحمن، ٢٠١٢، ل١٨٤-١٨٥).

شایەتحاڵێك بە گرنگییەوە باسی پێشكەوتن و گەشانەوەی شاری كەركووك دەكات لەو ساڵانەدا: ".. دەستی ئاوەدانی بە ئاشكرا گەیشتوتی، كۆشك و خانووبەرەی نایاب، باخچە و خیابانی تازەبابەت.

بە هەر لایەکدا بڕۆی بە تەواوی شارستانی تازەت بەرچاو ئەکەوێ" (سجادی، ١٩٥٦، ل٧٧).

**٧- ڕووخسارە کۆمەڵایەتییەکان:**

کۆمپانیای نەوتی عیراق، شوێن پەنجەی بەرچاو و دیاری لەسەر ڕووخسارە کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگەی کەرکووکی داناوە، وەرچەرخان و گۆڕانێکی زۆری بەسەر کایە کۆمەڵایەتییەکانی شارەکەدا هێناوە. دەکرێت بە شێوەیەکی پوخت، لە خوارەوەدا ئاماژە بە هەندێک لەو لایەنانەی بکەین:

یەکەم: لە ڕووی خانوو و شوێنی نیشتەجێبوونەوە:

کۆمپانیای نەوتی عیراق کاریگەرییەکی زۆری لەسەر شێوازی دروستکردنی خانووەکانی شاری کەرکووک، لە ناوچەی عەرەفە بەتایبەتی، بە نەخشەسازیی نوێی ڕۆژئاوایی هەبووە. بنیاتنانی خانووەکانی کەرکووک، لە پێش پەیدابوونی کۆمپانیای نەوتی عیراق، لەسەر ڕووبەرێکی بچووک و لەناو کۆڵانێکی تەسک و بە پێچ و پەنا و بە نەخشەسازییەکی کۆنی ڕۆژهەڵاتی (شوانی، ٢٠٠٦، ص٧٧)، لەسەر شێوازی بنیاتنانی عەبباسی دروست دەکران. واتە هەبوونی حەوشەیەک لە ناوەڕاستی ڕووبەری زەوییەکە و چوار دەوری بە ژوور گیراوە. ئەو خانووانە بۆ ئەوەی ئەرکی بەرگریکردنی تیایاندا ئاسان و بەهێز بێت لەپاڵ یەکدیدا هەڵدەچنران. هەر بەو شێوازە کۆنەی خانوو دروستکردن، بەردی کلسی و قوڕ و هەندێکیشیان گەچیان تێدا بەکاردەهێندرا. دەرگاکانیان لە دار گوێز دروست دەکران. زۆربەی خانووەکانیش خاوەن پەنجەرەی بچووکی شێوە بازنەیی بوون تاوەکو لە ڕووداوی دزین بەدووربن (الحسني، ١٩٢٥، ص١٥٢). ئەمە سیمای سەرەکیی خانووەکانی گەڕەکە کۆنەکانی شاری کەرکووک بوو.

لە ڕاستییدا شاری کەرکووک تا ساڵانی سییەکانی سەدەی ڕابردوو، نوێگەری لە لایەنی بیناسازی و نەخشەسازیی گەڕەک و

شـوێنە گشـتییەكانی تێدا بەرجەسـتەنەبوو. لەو سـاڵانەدا، بە وردیـیش سـاڵی (١٩٣١) بـۆ یەكەمجـار بەڵێنـدەرەكانی دروسـتكردنی تەلار و خـانووی سـەر بە كۆمپانیـای نەوتـی عیـراق شـێوازی ئەوروپییـان لە بنیاتنانی خانووەكانی كۆمپانیای نەوت دەستپێكرد (لانكلی، ١٩٦٣، ص٦٦). بە هـۆی هەوڵ و پرۆژەكـانی بنیاتنـانی یەكەكـانی نیشـتەجێبوون بـۆ كارمەندان و كرێكارانی كۆمپانیای نەوت شێوازێكی جیاوازی بنیاتنانی خانوو لە شاری كەركووك هاتە ئارا. ئەم شێوازە بیناسازییە نوێیە، لە خانووەكـانی كۆمپانیـای نەوت، كـاریگەری كـردە سـەر دەوڵەمەنـد و دەسترۆیشـتووەكانی شـاری كەركـووك، ئـارەزووی بنیاتنـانی خـانووی لەم شـێوەیان لەلا زیـادی كـرد و كەوتـنە كۆشـش بـۆ دروسـتكردنی خانووەكانیـان لەم چەشـنە بیناسـازییە، لە نـاوچە جیاوازەكـانی شـاری كەركووك (لانكلی، ١٩٦٣، ص٦٧).

لەو ئاكـامەدا خـانووی دوور لە یەكتـر و لەسـەر رووبەرێكـی بەرفراوانتر و بە شكڵێكی ئەندازەیی و نەخشەسازییەكی نوێی ئەوروپی، كە هەندێكیان لە دوو نهۆم (ڤێلا) پێكدەهاتن، لەناو كۆڵانی پان و بەرین و پڕ لە سەوزایی دروستكران. ئەوەش هەنگاو و دیاردەیەكی نوێ بوو سـەبارەت بە نـزیككەوتنەوەی شـاری كەركـووك لە خەسـڵەتەكانی شارێكی سەردەمییانە (عبدالرحمن، ٢٠١٢، ل٤٩).

پرۆژەی بە خـاوەنبوونی خانووەكـان (Home Ownership Scheme)، كە پرۆژەیەكی گەورەی كۆمپانیای نەوت بـوو بۆ ئەوەی كارمەندەكانی بكاتە خاوەن خانوو، لە ساڵی (١٩٥٢)ەوە، وەك پرۆژەی نیشـتەجێكردن دەستپێكرد (السماك، د.ت، ص٧٥). ئامانجی سەرەكی ئەم پرۆژەیە بریتیبوو لە بنیاتنـانی خانووەكـان و بەناوكردنیـان لەسـەر بەكـاربەرانی عیراقـی سـەر بە كۆمپانیـای نەوت، بەبـێ جیـاوازی لە پـلە و پۆسـتەكانیان، بە شـێوەی قیسـت. لە سـەرەتادا تەنیـا (١٠%)ی تێچـووی زەوی و خـانووەكەی دەدا، پاشـتر قیسـتەكانی دیـكە بەو توانـایەی كە بەشداربووەكە هەیەتـی بـڕە پـارە مـاوەكەی دەدا (عرب اغا و ملا مصطفى،

١٩٥٧، ص١١٨). دوای تەواوبوونی خزمەتی لە كۆمپانیا خانووەكەی بەناو دەكــرا. ئەم پــرۆژەیە رۆڵـــی بەرچـــاوی لە كەمبـــوونەوەی گرفتـــی نیشتەجێبوون لە شاری كەركووك هەبوو (المراسل، أهل النفط، آذار ١٩٥٦، ص ص٤٦-٤٧).

دووەم: لە رووی وەرزشەوە:

لە ئاكـــامی گـــۆڕانە سیاســـییەكان و وەرچەرخـــانە ئـــابووری و كۆمەڵایەتییە گەورەكانی ناوچەكە، لە سۆنگەی جەنگی یەكەمی جیهانی و جەنگی دووەمی جیهانی، گۆڕانێكی چۆنیەتی و چەندێتی بەسەر باری وەرزش و وەرزشكارانی ناوچەكەدا هات، بە تایبەت شاری كەركووك، ئەوەش بەشـێكی زۆری بە هـۆی رۆڵ و كاریگەرییەكـانی كۆمپانیـای نەوتی عیراقەوە بوو. دەسەڵاتدارانی كۆمپانیا زوو دەستیان كردووە بە زەمینەسـازی، بـۆ بووژانـدنەوە و پێشخسـتنی یـارییە وەرزشـییەكانی ناوچەكە بەگشتی و شـاری كەركووك بە تـایبەتی. رەنگە كاریگەرترین هەنگـــاو لەم رووەوە ئەوەیـــان بێـــت، كە ســـاڵی (١٩٤٧)، یاریگـــای وەرزشـــییان، كە ئەوان پێیـــان دەوت (ســـتادیۆم)، لە نـــاوچەی عەرەفە دروسـتكرد. ئەم یاریگـایە لە چـوار گۆرەپـانی یـاری تـۆپی پـێ، دوو گۆرەپانی یاری تێنسـی سـەر زەوی، گۆرەپانێكی وەرزشـی بـۆ یـارییە وەرزشـــییەكانی گۆرەپـــان و مەیـــدان، باڵاخـــانەیەكی مامناوەنـــدی ئامادەكراو، كە ژووری جل گۆڕینی یاریزانەكان و گەرماو و دەستشۆر و شوێنی حەسانەوە و كورسی و مێز و چەند كۆشكێك بۆ فرۆشتنی ساردەمەنی و خواردنی خێرا، لۆكەری ئاسنین بۆ هەڵگرتنی جلوبەرگی یاریزانەكان و شوێنی سەیركەرانی یارییە وەرزشییەكانی لەخۆ دەگرت. ئەم یاریگا گەورە و بێوێنەیە، بووە یاریگای تیپی وەرزشیی (كۆمپانیای نەوتـی عیـراق) (أهل النفط، نیسان ١٩٥٤، ص٤٣). یاریگـاكە باشـترین یاریگـای كەركـووك و نـاوچەكە بـوو، چـونكە بـێجگە لەو خزمەتگوزارییـانەی لەخـۆی دەگـرت، دەسـەڵاتدارانی كۆمپانیـا (جەفـت) رێژیـان كردبـوو، بـۆ ئەوەی لەبارتر بێت بۆ یـاریكردن و تەپ و تۆزی نەمێنێت. كارمەندانی

كۆمپانیـــای نەوت چالاكـــانە كەوتـــوونەتە كۆشـــش و وەرزشـــكردن، توانیویـانە تیپێكـی سـەركەوتوو و بەهێـز دابمەزرێـنن بەنـاوی تیپـی كۆمپانیای نەوت (المراسل، صورة من الحركة الرياضية في كركوك، (أهل النفط، نيسان ١٩٥٦، ص٤٢).

كۆمپانیـــای نەوت، ســـەرباری چـالاككردنی رەوتـــی وەرزشـــی لە كەركووك و ناوچەكە، كردنەوەی خوولە وەرزشییەكان و دەستپێكردنی ڤیستیڤاڵی ساڵانەی وەرزشی لە شارەكەدا، بۆ یەكەمجار چەند یارییەكی وەرزشی هێناوەتە شاری كەركووك، وەك: یاری تێنسی سەر زەوی، یاری تێنسی سەر مێز، یاری گۆلف، یاری سەبەتە، یاری بالە و یاری هۆكی و..هتد (عبدالعزيز، ٢٠١٤، ص٢٢٦).

سێیەم: لە رووی پیشەوەری و هۆیەكانی گەیاندن:

دانیشتوانی شاری كەركووك لە سایەی وەبەرهێنانە نەوتییەكانی كۆمپانیای نەوت و پێداویستییە جۆربەجۆرەكانی، لە كەرەستە و ئامێر و دەسـترەنگینی خەڵكی شـارەكە، جـووڵانەوەی ئـابووری تێدا چـالاك بووە و گەشاوەتەوە، ئەوەش بە هۆی ئەوەی كۆمپانیای نەوت لە دوای جەنگی دووەمی جیهانییەوە، كەوتە پەیڕەوكردنی سیاسـەتی تێكەڵبوون بە بـــازاڕە ناوخۆییەكـــان (عبـدالعزيز، ٢٠١٤، ص١٨٩)، بـــۆیە داواكـــاری و پێویستی كۆمپانیای نەوت لە بازاڕی ناوخۆی شاری كەركووك زیادی كرد، لەو بەرەنجامەشدا كۆمەڵێك پیشـەوەری لە شـاری كەركووك، بە بەراورد بە پیشـــەكانی دیـكە، رەواجـی زیـاتر پەیـدا كـردووە و لەو ئاكامەشـدا كەركـووك لەنێـو شـارەكانی دیـكەی عیـراق بەو پیشـانە دەناسـرێتەوە، لەوانە: پیشـەكانی: (بەرگـدرووی، دارتاشـی، ئاسـنگەری، كۆگاكردن و ..هتد). (لانكلي، ١٩٦٣، ص١٦١؛ حسن، ١٩٤٧، ص ص٤٠٠-٤٦٤؛ الدفتر و حسن، ١٩٥٨، ص ص٥٦٣-٥٨٢).

لە كاریگەرییەكـانی دیـكەی كۆمپانیـای نەوتـی عیـراق لەسـەر بـارودۆخی كـۆمەڵایەتیی شـاری كەركـووك، بریتیبـوو لە زیـادبوونی داهـاتی تـاكی كەركـووكی، بە تـایبەت لە كۆتاییەكـانی رۆژگـاری

پاشایەتیدا. لەو بەرەنجامەشدا کەرکووکییەکان روویان لە کڕینی هۆیە تایبەتەکانی گواستنەوە کرد، ئەوەش بووە هۆی پەیدابوونی پیشانگای ئۆتۆمۆبێل لە جۆری (شۆفرلێت)ی ئەمریکی لە شاری کەرکووک (الدفتر و حسن، ١٩٥٨، ص٥٢١). پارەدارەکانی کەرکووک بوونە خاوەن ئۆتۆمۆبێلی تایبەت بە خۆیان. لە لایەکی دیکە، بەشێکی زۆری دانیشتوانی کەرکووک کە پارەدار نەبوون روویان لە کڕینی دووچەرخە (بایسکل) کرد. ئەوەش بە هۆی هاندان و رێخۆشکردنەکانی کۆمپانیای نەوتی عیراق بوو، بۆ ئەوەی کرێکار و کارمەندەکانی پاسکیل بەکاربهێنن بۆ گەیشتن بۆ سەر کارەکانیان. بۆ ئەو مەبەستەش کۆمپانیا کۆگا و پیشانگای تایبەت بە پاسکیلی لە شاری کەرکووک، بە شێوە کڕینەکانی (ئامادە و قیست) کردەوە. لە دیارترین جۆری پاسکیلەکانیشی بریتیبوون لە: هەمبەر (Humber)، هێرکلیس (Hercules) و فلیپس (Phillips). (عبدالعزیز، ٢٠١٤، ص١٩٢). ئامارە فەرمییەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن، کە سال دوای سال رووکردن لە بەکارهێنانی پاسکیل، لەناو دانیشتوانی کەرکووک زیادی کردووە و بووەتە خوویەکی تەندروست بۆ شارەکە. بەپێی ئاماری سالی (١٩٥٠) ژمارەی پاسکیلەکانی شار بریتیبوونە لە (١٩٣٧) دانە، کەچی لە ئاماری سالی (١٩٥٦)دا، گەیشتووەتە (٤٥٣٣) دانە. (المجموعة الاحصائية السنوية العامة لسنة ١٩٥٠، ١٩٥٢، ص٢٥٠؛ المجموعة الاحصائية السنوية العامة لسنة ١٩٥٦، ١٩٥٧، ص١٣٥).

**دووەم: باری سیاسی و کاریگەری بەسەر بارودۆخی کۆمەڵایەتی:**

لایەنی سیاسی کاریگەری راستەوخۆی هەیە لەسەر بارودۆخی کۆمەڵایەتیی دانیشتوانی هەر ناوچەیەک. ئەوەی تایبەت بێت بە شاری کەرکووک دەتوانرێت سەرنج بخرێتە سەر (سیاسەتەکانی دەسەڵاتدارانی بریتانی و حکومەتە یەک لەدوای یەکەکانی عیراق لە سەردەمی پاشایەتیدا ١٩٢١-١٩٥٨) و بە شێوەیەکی زانستییانە تاووتوێ بکرێت:

**١- سیاسەتەكانی دەسەڵاتدارانی بریتانی و رەنگدانەوەی لەسەر بارودۆخی كۆمەڵایەتیی شار:**

پێكهاتەی قوچەكیی كۆمەڵایەتی (الهرم الاجتماعي)، شارە گەورەكانی عیراق بە شاری كەركووكەوە، لە رۆژگاری عوسمانیدا، لە چەند ئاستێک پێكدەهات، كە لە لوتكەكەیدا ئیدارەی توركی (والی و فەرمانبەرە ئیدارییە گەورەكان) و گەورە ئەفسەرانی سوپا و پۆلیس، جا تورک بن یان بە تورک بووبن دەهات. لە دوای ئەوانیش ژمارەیەک توێژی كۆمەڵایەتیی خۆجێی، لە نموونەی: (ئەشرافەكان و خێزانە ئەریستۆكراتییە كۆنەكان و گەورە بازرگان و موڵكدارەكان، هەروەها گەورە پیاوانی ئایینی) هەبوون. بەڵام بنكەی قوچەكە كۆمەڵایەتییەكە، كە زۆرینە بوون، لە توێژی هەژاران و زەحمەتكێشان پێكدەهات. لە نێوانی ئەو دوو ئاستەدا، چەند توێژێكی نێوەڕاست دەهاتن (بازرگانە بچووكەكان و پیشەگەر و خاوەن كارە سەربەخۆكان و ئەفسەران و قوتابیان و ..هتد). دوای كۆتایی هاتنی جەنگی یەكەمی جیهانی و پەیدابوونی سەردەمی داگیركاری (١٩١٨-١٩٢٠) و دواتریش سەردەمی ئینتیداب (١٩٢٠-١٩٣٢) لە لایەن بریتانییەوە بەسەر عیراق، بنكە كۆمەڵایەتییەكان بۆ حوكمڕانی لە شارەكانی عیراق گۆڕانیان بەسەردا هات. لە سەرووی دەسەڵاتی سیاسیی كۆمەڵایەتییەوە هێزی داگیركاری بریتانی و كادرە ئیدارییە هاوكارەكانیان دەهاتن. لە پلەی دووەم هێزە كۆمەڵایەتییە خۆجێییەكان (ئەشرافەكان، خێزانە ئەریستۆكراتییە كۆنەكان، بازرگانەكان، گەورە موڵكدارەكان، پیاوانی ئایینی، بە تایبەت سوننە و حاخامەكان). لە پلەی سێیەم میراتی مانەوی مەلیكی دانراو و كۆمەڵێک ئەفسەری عیراقی لە ریزی سوپای كۆنی عوسمانی دەهاتن. (الناصري، د.ت، ص ص٣٠-٣١).

ئەم گۆڕانە سیاسییانە و هەڵوێستی خۆسەپێنانەی دەسەڵاتدارانی داگیركاری بریتانی و هیوا و ئاواتی پێكهاتە كۆمەڵایەتییەكانی دانیشتوان بۆ سەربەخۆبوون و دۆزینەوەی رێگەی پێشكەوتن، لە كۆتاییدا

یەكـــانگیربوونەوە و لە ئەنجامـــدا دەیـــان بـــزووتنەوەی یـــاخیبوون و ڕاپەڕینی توندوتیژ و شۆڕشی بەرفراوانی، لە ناوچە جۆربەجۆرەكانی سێ ویلاتە كۆنەكەی عیراق: (مووسڵ، بەغدا، بەسرە) لێكەوتەوە. لە بەرەنجامـدا، دەســەڵاتدارانی بریتـانی بە توونـدی كەوتـنە پاڵپشـتی لە دروستكردنی بنكەیەكی نوێی كۆمەڵایەتی بۆ حوكمڕانی.

لە كەركووك دوای ئەوەی كاپتن ستیڤن هیمسلی لۆنگریگ ( S.H. Longrigg) كــرایە بریكــاری حــاكمی سیاســی، ئەركــی دامەزرانــدنی دەسەڵاتدارییە كارگێڕییەكانی گرتە ئەستۆ، دەستیكرد بە دروستكردنی ئەنجوومەنێكی بەڕێوەبردن لە پێكهاتە جیاوازەكانی كەركووك، تاوەكو هاوكـاریی حـاكمی سیاسـی بكـات. ئەو ئەنجـوومەنە لە: یەك ئەنـدامی مەسـیحی، یەك ئەنـدامی جـوو، یەك ئەنـدامی عەرەبـی، سـێ ئەنـدامی توركمـانی و شـەش ئەنـدامی كـوردی پێكهێنـرا (احمد، د.ت، ص١٠٥). هەر یەكەیان بە قەبارەی پێكهاتە نەتەوەییەكەی خۆی لەناو لیواكەدا.

دەسـەڵاتداری نوێ، لە ڕێگەی جێبەجێكردنـی سیاسـەت و مەرامە ئـابووری و سـەربازییەكانی لە نـاوچەكە، ڕووبەڕووی ئاسـتەنگی زۆر هات. بۆیە بەناچاری، بۆ ڕاییكردنی كاروبارەكانی دانیشتوان، ڕووی لە هەمـان ئەو تـوێژە ئیـدارییە كـۆنەی ڕۆژگـاری عوسـمانی كـردەوە. بە هەمـــان شـــێوەش بـــۆ ئاســـانبوونی بەڕێـــوەبردنی نـــاوچەكە، كەوتە پەیڕەوكردنی سیاسـەتی كۆمەڵایەتیی كۆنی عوسمانی، كە بریتیبوو لە بەهێزكردن و پشتگیریكردنی بەرژەوەندیی سـەرۆك خێڵەكان. سـەرۆك خێڵەكان وەك فەرمانبەری فەرمی بۆ ڕاپەڕاندنی كاروبـاری خێڵەكانیـان، بەو مەرجەی لە كارەكانیانـدا پـرس و رایـان بە حـاكمە سیاسـییەكانی بریتانیا بێت، مامەڵەیـان لەگەڵ كـرا (هی، ١٩٧٣، ص١٤٣-١٤٤). ئەم سیاسـەتە لە هەردوو سـەردەمی داگیركـاری و ئینتیـدابی بریتـانی پەیـڕەوی لێكـرا (عبدالرضا، ١٩٦٩، ص٣٥).

لە ئاكـامی زەقبـوونەوەی دەسـەڵاتی سـەرۆك خێڵەكـان و گەورە موڵكـــدارەكان، كە بەر لەو مێـــژووە لە نـــاو شـــار نیشـــتەجێببوون،

چەوسانەوەی دەرەبەگی لە گوندەکان و هەروەها بەرزبوونەوەی ڕێژە و ژمارەی ئەو جووتیار و وەرزێرانەی، کە هەموو سەرچاوەیەکی بژێویان لەدەستدابوو، هاتە ئارا (أحمد، ١٩٨١، ص٦٥). ئەوەش وایکرد ڕەوتی کۆچکردنی نێوخۆیی دانیشتوان لە گوندەکانەوە بەرەو شار زیاتر بێت.

دەسەڵاتدارانی بریتانیا بۆ توونەوتۆڵکردنی جێی پێی خۆیان و ڕەگداکوتانی دەسەڵاتیان لە کەرکووک و ناوچەکە، کە سەرچاوەیەکی لەبن نەهاتووی نەوت بوو، دەستیانکرد بە دروستکردنی ململانێ و ناکۆکی نەتەوەیی و چاندنی تۆوی دووبەرەکی لەنێو پێکهاتەکانی دانیشتوانی شاری کەرکووک. ئەو سیاسەتەی کە زۆربەی دەسەڵاتدارێتییە داگیرکارییەکانی شارەکە پەنایان بۆ بردووە و جێبەجێیان کردووە (بندر أوغلو، ١٩٧٣، ص٥٤). سەرەتاش کەوتنە پشتگیریکردنی تورکمانەکان و بەرژەوەندییەکانیان لەسەر حسێبی پێکهاتەکانی دیکە (لوکیتز، ٢٠٠٤، ص٦٢).

لۆنگریک، کە ئەو ڕۆژگارە خۆی بریکاری حاکمی سیاسیی ناوچەکە بوو، ڕاشکاوانە نووسیویەتی: "تورکمانەکانی کەرکووک و کفری... قەبووڵکردنیان لە پلە و پایەکان... زۆر زیاتر بوو لەچاو ڕێژەیان" (Longrigg, 1953, p.192). پەیڕەوکردنی ئەم سیاسەتە لە کاتێکدا بوو، کە پێشتر لەنێو کۆمەڵە پێکهاتەی دانیشتوانی (کورد و تورکمان)ی شاری کەرکووک، کێشەیەکی نەتەوەیی و ناکۆکییەکی ئەوتۆ لە سەردەمەکانی ڕابردوودا نەبوو. بەڵکو بە پێچەوانەوە باشترین و بەهێزترین پەیوەندیی کۆمەڵایەتیی نێوان پێکهاتەکانی شاری کەرکووک لەنێوان ئەم دوو پێکهاتەیەدا هەبوو (أحمد، د.ت، ص٩٣-٩٤).

دەسەڵاتدارانی بریتانی بۆ کەمکردنەوەی مەترسی و هەڕەشەکانی پێکهاتەی کورد لەسەر پلان و نەخشە داڕێژراوەکانیان لە ناوچەکە، لە هەنگاوێکی گەورەدا، دەستیان برد بۆ گۆڕینی هەیکلی کارگێڕیی لیوای کەرکووک، ئەویش بە دابڕینی قووڵایی نەتەوەیی پێکهاتەی کورد لە

لیواکەدا. سەرەتا قەزای (ئەربیل و رواندز)یان لە کەرکووک کردەوە، دواتریش (کۆیسنجەق)یان لە کەرکووک دابڕی و خستیانە سەر لیوای تازە داهێنراوی (ئەربیل). بەڵام سلێمانی و پاشکۆکانی تا ناوەڕاستی ساڵی (١٩٢٥) سەر بە ئیدارەی کەرکووک مابوونەوە، بەو پێیەی شاری سلێمانی ئەو رۆژگارە، لە رووی ئیدارییەوە کەرتێک (Division) بوو سەر بە ناوچەی (District) کەرکووک (Edmonds, 1957, pp.413,435).

لە سایەی زاڵیی دەسەڵاتی بریتانییەکان بەسەر ناوچەکەدا، گۆڕانێکی رووکەشانە بەسەر پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی مەسیحییەکان و موسڵمانەکانی کەرکووکدا هات،. چونکە مەسیحییەکان هەستێکی جیاوازیان بەرانبەر بە دەسەڵاتی بریتانییەکان هەبوو، ئەوان وەک زۆربەی موسڵمانەکانی شار ناحەزییان بەرانبەر بە ئینگلیزەکان نەبوو. بەڵکو بە پێچەوانەوە، داخ لە دڵ بوون بەرانبەر بە رەفتار و دەسەڵاتی تورکە عوسمانییەکان و ئەوانەشی عەوداڵی گێڕانەوە و هاتنەوەی دەسەڵاتیان بوون بۆ شاری کەرکووک (خدریزادە، ٢٠٠٧، ص١٣)، کە خەڵکێکی زۆری کەرکووکی دەکەوتنە ئەو چوارچێوەیە. چونکە عوسمانییەکان لە ساڵانی جەنگی یەکەمی جیهانیدا شوێنی پیرۆز و دێرینی مەسیحییەکانیان بەناوی (بەیعەتی شەهیدان)، ئەوەی بە کڵێسای سوور ناسراوە، کردبووە کۆگای چەک و تەقەمەنیی سوپای مۆڵدراوی ناوچەکە و لە سەروەختی پاشەکشێیدا، ساڵی (١٩١٨) تەقاندبوویانەوە. ئەوە سەرباری هەستکردنیان بە چەوساندنەوەییان لە لایەن دەسەڵاتداریێتی پێشوو. ئەمەش گرژی لە پەیوەندییەکانیان لەگەڵ موسڵمانەکان هێنایە کایە. بە تایبەت کاتێک هێزی لیڤیی ئاسووری هاوئایینی کلدانی لە نزیک شار نیشتەجێکران، بارودۆخەکە گرژتربوو.

دەسەڵاتدارانی بریتانی (ئینتیداب)، لە چوارچێوەی نانەوەی پشێوی و دروستکردنی گێرەوکێشە و تێکدانی دیاردەکانی پێکەوەژیانی ئاشتییانەی پێکهاتە کۆمەڵایەتییەکانی شاری کەرکووک، کۆمەڵێک خەڵکی ئاسووری، کە لە دەستی تووندوتیژییەکانی تورکە کەمالییەکان

پەنایـان بـۆ عیـراق هێنـا بـوو، لە كۆتاییەكـانی سـاڵی (١٩٢٣)، لە نزیـك شاری كەركووك نیشتەجێ كرد. ئەوانە لە لایەن ئینگلیزەكانەوە هێزێكی سەربازییان لێ پێكهێنرا بوو بە ناوی هێزی لیڤی (ئاغجەلەری، ٢٠٠٧، ل٢٩٤-٢٩٥). بە گـوتەی نووسـەری كتێبـی (تراجیـدیای ئاسـوورییەكان)، ئەوەی هەسـتی دوژمنـانەی ئاسـوورییەكان بەرانـبەر بە دانیشـتوانی شـاری كەركـووكی زۆرتـر كـرد، ئەوەبـوو كە (ئاسـوورییەكان)، روانگەیەكـی نێگەتیڤانەیـان بەرانبەر بە دانیشـتوانی شـاری كەركووك هەبوو. گوایە زۆربەی خەڵكـی كەركـووك بنەچەیـان دەگەڕێـتەوە سـەر توركەكـان (Stafford, 1935, p.67). بـۆیە ئەمە زەمینەسـازی كـرد بـۆ بەرپـابوونی رووداوێكی خوێناوی لە شارەكەدا.

رووداوە خوێنـاوییەكە[٥]، كە لە (٤ی مایسـی ١٩٢٤)دا بەرپـابوو، بـووە هـۆی ئـاڵۆزبوونی پەیوەنـدییە ئیتنـی-ئایینییەكـانی موسـڵمانان بە مەسـیحییەكانی شـارەوە (الحیـدري، ١٩٧٧، ص ص١٩٤-٢١١). چـونكە چەكـدارەكانی ئاسـووری مـاڵی (مینـاس غەریـب ئەفەنـدی) كەسـایەتی ناسـراوی كلـدانییان لە گەڕەكـی (حەمـام مەسـیحی) و مـاڵی دیـكەی مەسـیحییان هەر لە هەمـان گەڕەك بەكارهێنـا بـۆ گـورز وەشـاندن لە خەڵكـی شـار (Lyon, 2002, P.148). چەكـداره ئاسـوورییەكان سـەرەڕای ئەوەی دوكـان و مـاڵە موسـڵمانەكانیان تـاڵانكردبوو، هەر كەسـێكیان بكەوتایەتە بەرچاو تەقەیان لێ دەكرد (منتشاشفیلي، ١٩٧٨، ص١٩٨).

رۆژی دوای رووداوەكە بەشێك لە دانیشتوانی خرۆشـاوی شـاری كەركـووك، بە كـردار هەڵوێسـتێكی توونـد و دوژمنانەیـان بەرانـبەر بە مەسـیحییەكانی شـار (كلـدان و ئەرمەن) نوانـد، هەنـدێك لە مـاڵە مەسیحییەكان كەوتنە بەر شاڵاوی تاڵانكردنیان و چەندیشیان لێكوشـتن (فتح الله، ١٩٨٩، ص٧٣٦).

ئەم ناتەبـایی و گـرژییەی لە پەیوەنـدییەكانی نێـوان موسـڵمان و مەسیحییەكانی شار، كە لە ساڵی (١٩٢٤)دا هاتە ئارا، بە روونی دەستی دەرەكی و مەبەسـتی سیاسـی لەپشـتەوە بـوو (قادر، ٢٠٠٢، ص١٦٠-١٦١). بە

هەمان شێوە، ماتڤێیڤ (مارمەتی) پێی وایە ئەم رووداوە بۆ تێكدانی پەیوەندییە كۆمەڵایەتییەكانی دانیشتوانی شارەكە بووە. بۆیە دەنووسێت: "دەسەڵاتدارانی عیراق... بەردەوام لە هەوڵی نانەوەی ئاگری ئاشووب بوون لە نێوان نەتەوەكاندا" (ماتفييف، ١٩٨٩، ص١٣٠).

## ٢- سیاسەتەكانی حكومەتە یەك لەدوای یەكەكانی عیراق و كاریگەری لەسەر بارودۆخی كۆمەڵایەتیی شاری كەركووك:

دوای دروستبوونی دەوڵەتی عیراقی عەرەبی (١٩٢١)، حكومەتی تازە دروستبوو، هەرگیز مۆركی فرەنەتەوەیی شاری كەركووكی بە ستراتیژیەتێكی قبوڵكراو نەدەبینی. چونكە بە هۆی ئەو رێژە سەدییە كەمەی عەرەب لە شارەكەدا هەیبوو، لەسەریانی قورس كردبوو كەركووك بە شارێكی عیراقی عەرەبی هەژمار بكەن (استارجيان، ٢٠١٨، ص٣٥). ئەو شارەی خاوەن زێڕی رەش و سەروەت و سامانێكی لەبن نەهاتووی ژێر زەوی بوو. بە گرنگ و پڕ لە بایەخەوە لە پلانە ئابووری و سیاسییەكانی دەوڵەتی عیراق حسێبی بۆ دەكرا.

شاری كەركووك تا ساڵی (١٩٢٤)، بە كردارەكی نەچووبووە سەر قەڵەمڕەوی دەوڵەتی عیراق. لە سەرەتای ئەو ساڵەدا، كاتێك مەلیك فەیسەڵی یەكەم (١٨٨٣-١٩٣٣) سەردانی شارەكەی كرد، ئاڵای عیراقی لەسەر بینایەی دامەزراوەكانی شارەكە هەڵكرا (تالەبانی، ٢٠٠٣، ل٣١)، چونكە كەركووكییەكان لە سەروبەندی دامەزراندنی دەوڵەتی عیراق و لە كاتی ئەنجامدانی راپرسی بە مەبەستی كاندیدكرنی میر فەیسەڵی كوڕی حوسێن بۆ تەختی پاشایەتیی عیراق، بە زۆرینەی دەنگ لە دژی كاندیدكردنی ناوبراو وەستان. توركمانەكانی شاری كەركووك خوازیاری دانانی كەسێكی تورك بوون، كە كەمالییەكانیش هەمان نیازیان هەبوو (Sonyel, 1975, p.150). ئەو هەڵوێستەی توركمانەكان بەو مانایە دەهات كە ئەم شارە ئەوە رەتدەكاتەوەی بخرێتە ژێر كۆنترۆڵی عەرەب.

لە راستییدا، بەشێکی دیار لە توێژی سەرووی پێکهاتە کوردییەکەی شاری کەرکووک، خوازیاربوون دەسەڵاتی تورکەکان بگەڕێتەوە بۆ شارەکەیان. بۆیە لەو پێناوەدا شانبەشانی دەستڕۆیشتووەکانی تورکمان، لە هەوڵی هێنانەدی نیازەکەیاندا بوون. لەنێو ئەوانەشدا، بەرزەنجەییەکانی شار، بە تایبەت سەیید ئەحمەدی خانەقا (١٨٦٨-١٩٥٢)، کە خاوەن دەسەڵات و پێگەی ئایینیی گەورە بوون و موڵکداری گەورەی زەویش بوون لە ناوچەکەدا، لە نموونە و بەڵگەی ئەم راستییەن. دەسەڵاتدارانی بریتانی و حکومەتی عیراقی، لەبەر ئەم هەڵوێستانە و بۆ کپکردنەوەی دەنگی نارەزایی لە شاری کەرکووک، هەوڵیاندا دەست بەسەر موڵکەکانیدا بگرن و دواتریش دووریانخستەوە بۆ ناوچەکانی باشووری عیراق (البوتاني، ٢٠٠٤، ص٦٠).

هەرچی بنەماڵەی تاڵەبانی بوو، ئەوا ئەوان خوازیاربوون پارێزگاری لە پەیوەندیی راستەوخۆیان بە بریتانییەکانەوە بکەن، چونکە بریتانییەکان سەرچاوەی جیاووگ و شکۆمەندی ئەوان بوو (لوکیتز، ٢٠٠٤، ص٦١-٦٢؛ McDowall, 1996, p.161). بۆیە رەتیان دەکردەوە بکەونە ژێر سایە و نفووزی تورکمانەکان، کە تورکمانەکان ئاراستەکانیان رووەو تورکیا بوو (لوکیتز، ٢٠٠٤، ص٦١-٦٢؛ نبز، ١٩٩٧، ص١١١).

ئەم جیاوازی و ململانێیانە لە کۆتاییدا کاریگەری دوو لایەنەی هەبوو، حکومەتەکانی عیراق لە سەرەتادا بە پاڵپشتیی بریتانیا، هەمیشە ئاگاداری سروشتی ئاڵۆزکاوی ئەم پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەی نێو شاری کەرکووک بوون، بۆیە لەپێناو دروست نەبوونی یەکێتییەکی جوگرافی لە ناوچەکەدا، کەوتنە نانەوەی دووبەرەکی و گەورەکردنی دەللاقەکانی جیاوازیی ئیتنی-ئایینی لەنێوان کوردەکان و تورکمانەکان لە لایەک و لە لایەکی دیکەش لەنێوان کوردەکان خۆیاندا (لوکیتز، ٢٠٠٤، ص٦٢).

حکومەتە یەک لە دوای یەکەکانی عیراق، لە دوای کۆتایهاتنی کێشەی ویلایەتی مووسڵ (١٩٢٦) و یەکلاییبوونەوەی لە بەرژەوەندی

عیـراق، هەروەهـا دوای دەسـتبەکاربوونی کۆمپانیـای نەوت (١٩٢٧) و هەڵقوڵینی نەوت لە کێڵگەی نەوتی بابەگوڕگوڕ، کردار و گوفتاریان یەک شـێوە نەبـووە. لە ئاکامی بەردەوامبـوون و مکوڕبـوونی کـورد لەسـەر دژایەتیکردنـی دەسـەڵاتی حکـومەتی عیراقـی عەرەبـی، ئینگلیزەکـان و دەسەڵاتدارانی حکومەتی عیراق لەپێناو لاوازکردنی وجوودی کورد لە کەرکووک، کەوتنە جووڵە بۆ گۆڕینی پێکهاتەی کۆمەڵایەتیی شـارەکە. ئەم ئەرک و کـارەش بە شـێوەیەکی تـایبەت بـۆ ئەوان قـورس نەبـوو. چونکە پیشەسـازیی تازەپێگەیشـتووی نەوت لە کەرکووک پێویسـتی بە کـادیرێکی زۆری راهێنـراوی شـارەزا هەبـوو، بـۆ ئەوەی لە کـێڵگە نەوتییەکان و وێستگەکانی کۆمپانیای نەوت کار بکات. بە هەمـان شـێوە ئیـدارەی شـار و لیـواکە، پێویسـتی بە کەسـانی بیرۆکراتـی لە ئاسـتی داواکـارییە سـەپێنراوەکانی دەوڵەتە تازەدروسـتبووەکە هەبـوو، کە لە هەوڵـی سـەپاندنی سـایە و دەسـەڵاتیدا بـوو بەسـەر نـاوچەکەدا. ئەم خەسـڵەتە داواکـراوانەش بە دەگـمەن لەنێـو کوردەکـان هەبـوو. بـۆیە حکومەتی عیراقی درەفەت و بیانووی کەوتە دەست بۆ هێنانی خەڵکی ناوچەکانی دیکە بۆ نێو شارەکە (أندرسن و ستانسفيلد، ٢٠٠٩، ص٥٩).

سەرەتاکانی پرۆسەی بە عەرەبکردنی شاری کەرکووک و گۆڕینی پێکهـاتە کۆمەڵایەتییەکـانی شـارەکە لێـرەوە دەسـتی پێکـرد. حکـومەتی عیراقی شێلگیرانە کەوتە تەقەللا بۆ دوورخستنەوەی شـاری کەرکووک لە خواسـتی جـووڵانەوە نەتەوەیـی کـورد. رۆڵ و پـێگەی کـۆمەڵایەتی و سیاسـی و ئـابووریی تورکمـانی لە شـارەکە پاراسـت و بـازاڕ هەر لە دەستی ئەواندا مـایەوە، لە بەرانبەریشـدا کەوتنە پەراوێزخسـتنی پـێگە و قورسایی کوردەکان لە کەرکووک (قادر، ٢٠٠٢، ص١٦٦).

لە لایەکـی دیـکەش شـەپۆلی هـاتنی خەڵکـی شـارەکانی دیـکە، لە رەگەزەکـانی ئاسـووری و ئەرمەن و بە تـایبەت عەرەب، بە هـۆی کۆمپانیـای نەوت و بە بیانووی بەڕێوەبردنی دامودەزگاکـانی حکـومەت لە شارەکە بەردەوامی هەبوو، بە تێپەڕینـی کـات گۆڕانێکی کۆمەڵایەتی

چەندێتی بەرفراوان لەناو دڵی شارەكە هاتە ئارا (أندرسن و ستانسفيلد، ٢٠٠٩، ص٥٩؛ لۆمبۆرن، ١٩٩٤، ل٣٩).

دەسەڵاتدارانی عیراقی بۆ گرێدانی شار و ناوچەكە بە شێوەیەكی تووند بە بەرژەوەندییەكانی خۆیان دەستیانكرد بە ناولێنانی شوێن و خیابانەكانی شارەكە بە ناوی عەرەبی. ساڵی (١٩٢٩) كاتێك لە سەروبەندی گۆڕینی ناوی كۆمپانیای نەوتی توركی بوون بۆ ناوێكی دیكە، بە رەزامەندی هەردوو لا، لایەنی بریتانی و حكومەتی عیراق، ناوەكەی گۆڕدرا بۆ كۆمپانیای نەوتی (عیراقی)ی سنووردار، نەوەك (كەركووك)، وەك جۆرە خۆماڵیكردنێك. كەچی كۆمپانیا نەوتییەكانی دیكەی عیراق لە رۆژگاری پاشایەتی بە ناوی ئەو شارانە كراون كە كۆمپانیای نەوتەكە كاری تێدا كردووە، وەك: (كۆمپانیای نەوتی خانەقین، كۆمپانیای نەوتی بەسرە، كۆمپانیای نەوتی مووسڵ). تەنیا كەركووك نەبێت، كە ناوێكی گشتگیر و مەبەستداری بۆ بەكارهێنراوە. بە هەمان شێوە، ناوی شەقامی (سەرای) كرایە (غازی) (كوثر اوغلو، ٢٠٠٦، ص٢٦٨).

دەسەڵاتدارانی عیراقی وەك لە پێشەوەدا ئاماژەمان پێدا، كردار و گوفتاریان یەك شت نەبوو. لە كاتێكدا پەیتا پەیتا وادە و بەڵێنی دابینكردنی خواست و مافەكانی كورد و سەرجەم نەتەوەكانی دیكەی ناعەرەبیان دووپات دەكردەوە، لە هەمان كاتدا، هەنگاوی پێچەوانەی ئەمەیان هەڵدەنا. بۆ نموونە رێژە و ژمارەی دامەزراندنی فەرمانبەران لە ناوچەكەدا بەڵگەیەكی روونی ئەم بابەتەیە. حكومەتە یەك لەدوای یەكەكانی عیراق بە بەرنامە و پلان كاریان كرد بۆ پەراوێزخستنی پێكهاتەی كوردی لە لیوای كەركووك و هێنانە پێشەوەی پێكهاتەی عەرەب، كە رێژەیان بە بەراورد بە پێكهاتەی كورد لە ناوچەكە زۆر كەم بوو. بە گوێرەی یادداشتی راوێژكاری وەزارەتی ناوخۆی حكومەتی عیراق لە بارەی بارودۆخی كوردستان، لە شووباتی ساڵی (١٩٣٠)دا، ئەم بابەتەی لە رێگەی تۆماركردنی داتا و رێژەی فەرمانبەرە

دامەزراوەکـان، لە لیـوا کوردییەکانـدا روونکـردۆتەوە. بە گـوێرەی ئەو یادداشتە، ژمارەی فەرمانبەرانی کورد لە لیوای کەرکووکدا بریتیبووە لە (٤٥) فەرمانبەر. لە کاتێکدا هەر یەک لە فەرمانبەرانی پێکهاتەی تورکمان (١١٨) فەرمانبەر و پێکهاتەی عەرەب (٥٨) فەرمانبەر بووە. (د.ک.و.ع، شباط ١٩٣٠، ص١٠). کەچی قەبارە و ژمـارەی راستەقینەی پێکهـاتەی کـوردی لە لیـواکەدا چەنـد بەرابەری پێکهـاتەی عەرەبـی بـووە لەو سـاڵەدا. ئەمەش بەڵگەیەکی روونە لەسەر هەوڵی پەراوێزخستنی پێکهاتەی کورد لە شـار و لیوای کەرکووکدا.

حکومەتەکانی عیراق هەر بەو هەنگاوانە نەوەستان، بەڵکو هاوکات لەگەڵ رێگەخۆشـــکردن بـــۆ نیشـــتەجێبوونی کارمەنـــدانی عەرەب لە ناوچەکە، زمانی کوردییان خستە ژێر گوشار و تەنگپێهەڵچنینەوە، کێشە و گیروگرفتایان ساز کرد (لۆمبۆرن، ١٩٩٤، ل٣٩). بە هەمان ئاست و زیـاتر، هەنگاوەکـانی سیاسـەتی پەراوێزخسـتنی پێکهـاتەی کوردیـان لە شـار و ناوچەکە توندتر کرد. ئەویش لە رێگەی فەرامۆشکردن و بێبەشکردنی دەرچوواندنی چـاپەمەنی و خوێنـدن و فێرکردنـی پێکهـاتەی کـوردی بە زمـانی خۆیـان لەنـاو شـاری کەرکـووک و دەوروبەری. سـاڵی (١٩٣٠) بارودۆخەکە زیاتر پەرێشانتر بوو، کاتێک هەندێک لە کەمینە ئایینییەکان مافی زۆرتریان لە پێکهاتەی گەورەی دانیشـتوانی وەک کـورد هەبـوو لە بواری خوێندن. لەو ساڵەدا لە سەرتانسەری عیراقدا کوردەکان خـاوەنی (٤١) قوتابخـانە بـوون، کەچـی لە هەمـان سـاڵدا مەسـیحییەکان (٤٧) قوتابخانە و جووەکانیش (١٩) قوتابخانەیان هەبووە (زەکی، ١٩٨٤، ٦٥).

لە هەنگاوێکی  چەوتی دیکەدا، حکومەتی عیراق و دەسـەڵاتدارانی ئینگلیز قانوونی زمانە خۆجێییەکان (قانون اللغات المحلية)یان دەرکرد. بە گـوێرەی ئەم قـانوونە مـاف بە تورکمانەکـان درا لەنـاو کەرکـووک بە زمانی دایکی خۆیان بخوێنن و رێگری لە منداڵانی کورد کرا بە زمـانی دایکی خۆیان بخوێنن. قانوونی زمانە خۆجێییەکان هەر تایبەت نەبوو بە خوێنـدن، بەڵکو لە قـانوونەکەدا ئامـاژە بۆ دادگاکـانیش کرابـوو. هەمـوو

ئەم هەنگـاوانە لە چوارچێـوەی گرنگیـدان بە پێکهـاتەیەکی دیـاریکراو (تورکمـان) و فەرامۆشـکردنی پێکهـاتەیەکی دیـکە (کـورد) دەهـات لە کەرکووکدا. لە کۆتاییشدا لە بەرژەوەندی ناوەندی دەسـەڵاتی عەرەبی دەشکایەوە (الاتروشي، ٢٠٠٥، ص ص٢٨٨-٢٩٣).

خراپتـرین هەنگاوەکـانی حکومەتەکـانی عیـراق لە سـەردەمی پاشایەتی بەرانبەر بە پێکهاتە کۆمەڵایەتییەکانی شار و لیوای کەرکووک بریتیبـوو لە هەوڵـی گـۆڕینی بـاری دیمـۆگرافیی نـاوچەکە، لە ڕێـگەی پـرۆژەی حەویـجەوە[٦]. بەو هەنگـاوە لە رووکەشـدا دەسـەڵاتدارانی عیراقـی دەیانویسـت هـۆزە کۆچەرییەکـان نیشـتەجێ بـکەن، بەڵام سـەرەنجامەکەی شـتێکی دیـکەی لێـدەکەوتەوە، کە بریتیبـوو لە دروستبوونی قـووڵایی نەتەوەیـی عەرەب لە شـار و لیـواکەدا. بە هـۆی ئەو پـرۆژەیە چەنـد عەشـیرەتێکی گەورەی عەرەبـی لە ناوچەکـانی رۆژئـاوای کەرکـووک و سـەر بە قەزای ناوەنـدیی کەرکـووک نیشتەجێکران (اسماعیل، ٢٠٠٢، ص٢٠٧).

هەمـوو ئەو هەنگـاوانەی دەسـەڵاتدارانی عیراقـی، لە کۆتاییـدا کاریگەرییـان هەبوو لەسـەر تێکچوونی پێکهاتە کۆمەڵایەتییە کۆنەکەی شـاری کەرکـووک. پێکهـاتەی دانیشـتوانی شـاری کەرکـووک، گەشـە و گەورەبوونێکی بێ ئەندازە لە ساڵانی سییەکان بەدواوە بەخۆوە بینیوە.

ئەوەی لە هەنگاوەکـانی گـۆڕانی پێکهـاتەی دانیشـتوانی خێراتـر دەکرد، کۆمەڵێک قانوون و دیاردەی شارستانی بوون، کە لە نـاوچەی کەرکووک و دەوروبەری لەو رۆژگارەدا هاتنە کایە. بۆ نموونەی سـاڵی (١٩٣٣) حکومەتی عیراقی قانوونی ماف و ئەرکەکانی جووتیاران (قانون حقـوق وواجبـات الـزراع)ی ژمـارە (٢٨) دەرکـرد (الخالـد والازري، ١٩٨٠، ص١١٩). ئەم قـانوونە جەختـی لەسـەر جیاکـاری چینـایەتی لەنێـوان موڵکـدارەکانی زەوی و جووتیـاران دەکـردەوە. جووتیـاری کردبـووە کۆیلەی زەوی و بەبێ رەزامەندی موڵکدارەکە نەیدەتوانی زەوییەکە جێ بهێڵێـت. هەرچەنـدە ئەم قـانوونە لە سـییەکاندا سـەرکەوتوو بـوو لە

گەمارۆدانی جووتیاران و ناچاركردنیان بۆ كاركردن لە كێڵگەكانیان، بەڵام بە هۆی ئەو پەرەسەندنانەی لە ساڵانی دواتردا هاتنە ئارا، ژمارەیەكی زۆری جووتیارانی هاندا بۆ كۆچكردن لە گوندەكانەوە بەرەو شار (الجواهري، ١٩٨٢، ص٦٥). ئەم بابەتە هەرچەندە، بە وردی و بە شێوەیەكی راستەوخۆ، تایبەت نەبوو بە شاری كەركووك، بەڵام شاری كەركووكیش بەدەر نەبوو لەو شەپۆلە كۆچە.

### ٣- كاریگەری تیپی دووەمی سوپای عیراقی لەسەر بارودۆخی كۆمەڵایەتیی شاری كەركووك:

هەڵبژاردنی شاری كەركووك بە بنكەی فەرمانداریێتیی سەربازیی رۆژهەڵاتی وڵات، لە سەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی عیراقەوە، دواتریش لە سییەكاندا، كردنی بە مۆڵگە و بنكەی سەرەكیی تیپی دووەمی سوپای عیراقی لە سۆنگەی فراوانخوازییەكانی سوپا (الخطاب، ١٩٨٢، ص٦٣)، شاری كەركووكی كردە بنكەیەك بۆ كۆبوونەوەی زیاتری خەڵكانی لیواكانی دیكەی عیراق، بە تایبەت خێزانی ئەفسەر و سەربازانی عەرەب و نیشتەجێبوون تیایدا، بە هۆی ئەوەی ماوەی خزمەتی سەربازی هەندێك لە كەسایەتییە سەربازییەكانی ئەو تیپە زۆری دەخایاند. سەرباری ئەوە، كارئاسانیان بۆ دەكرا تاوەكو بە شێوەیەكی هەمیشەیی لە شارەكە بمێننەوە، وەك پێدانی پارچە زەوی و یەكەی نیشتەجێبوون و پلەی سەربازی و ئیداریی بەرز (خورشید، ٢٠٠٥، ص١٠٢).

تیپی دووەمی سوپا و دامەزراوە حكومییەكان لە بەشی قۆریە، بوونە بیانوویەكی باش بە دەستی دەسەڵاتدارانی عیراقی عەرەبییەوە بۆ هەوڵدان و تێكۆشان لەپێناو پارسەنگ راگرتنی باری نەتەوەیی لە شارەكەدا، بۆ ئەوەی كۆنترۆلی بارودۆخ بكەن (استارجیان، ٢٠١٨، ص٣٩). بوونی بنكە و بارەگاكانی تیپی دووەمی سوپای عیراق لە شاری كەركووك سەرباری ئەوەی ئامرازێكی چاك بوو بۆ كۆنترۆلكردنی

بارودۆخی ئاسایش و سیاسیی ناوچەکە، هۆیەکیش بوو بۆ راکێشانی خەڵکی شارەکانی دیکە، کە کارمەند و ئەندامی تیپی دووەمی سوپا بوون، بۆمانەوە و نیشتەجێبوون لە شارەکەدا (الصمانجي، ميزوبوتاميا، تموز ٢٠٠٥، ص٤٣٠).

لە هەموو ئەو هەنگاو و هۆییانەی لە پێشەوە باسکران، شاری کەرکووک گەشە و گەورەبوونێکی زۆری بەخۆوە بینی. بۆ تێگەیشتن لە قەبارەی گۆڕانەکە، بە نموونە باری ئاوەدانی بەشی قۆریە دەکەینە بە لێکۆڵینەوە، کە زۆربەی هەنگاوەکانی حکومەت (دامودەزگاکانی حکومەت، بارەگای تیپی دووەمی سوپا و ..هتد)، لەم بەشەی شار بوو. بەپێی سەرژمێریی ساڵی (١٩٥٧)، ژمارەی گەڕەکانی بەشی قۆریە، بووەتە (١٠) گەڕەک پاش ئەوەی لە سەرژمێریی ساڵی (١٩٤٧)، تەنیا (٣) گەڕەک بوو. دانیشتوانی بەشی قۆریە لە سەرژمێریی ساڵی (١٩٤٧)دا تەنیا بریتیبووە لە (٣٤٤٣٨) کەس. کەچی ئەم ژمارەیە لە سەرژمێریی ساڵی (١٩٥٧) جەمبی کردووە بۆ (٧٠٧٣٨) کەس (الاحصاء السكان لسنة ١٩٤٧، الجزء الثاني، ص ص١٠٨-١٠٩؛ المجموعة الاحصائية لتسجيل عام ١٩٥٧، لوائي السليمانية وكركوك، ص ص١٥٢-١٥٤). واتە بە زێدەبوونی (٣٦٣٠٠) کەس، کە ئەوەش زێدەبوونێکی زۆر ناسروشتییە لە ژمارەی دانیشتوانی ئەم بەشەی شاری کەرکووک لە ساڵانی پاشایەتی لە عیراق.

### ٤- فیکر و مەیلی سیاسیی دانیشتوان و رەنگدانەوەی بەسەر بارودۆخی کۆمەڵایەتیی شار:

فیکری سیاسی و پاشخانی نەتەوەیی، لایەنێکی دیکە بوو لە هۆیە کاریگەرەکان لەسەر بارودۆخی کۆمەڵایەتیی شاری کەرکووک لە سەردەمی پاشایەتیدا (١٩٢١-١٩٥٨). بۆ روونکردنەوەی ئەم باسە چەند نموونەیەک دەخەینە روو. لەوانە:

پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی جووەکان بە کۆمەڵە جیاوازەکانی دانیشتوانەوە تاسەر هەر ئاسایی و لەبارنەبووە. بەڵکو بە هۆی سیاسی و دەمارگیریی ئیتنی - ئایینییەوە گۆڕانی بەسەردا هاتووە (شەریف، ٢٠٠٥، ل٣٣). بە تایبەت لە سەروبەندی دامەزرانی دەوڵەتی ئیسرائیل (١٩٤٨)، ئەم پەیوەندییە ئاڵۆز بووە. موسڵمانەکان هەڵوێستی نەشیاوی کۆمەڵایەتییان بەرانبەر بە جووەکانی شار نواندووە (شریف، الاتحاد، ١٥ شباط ١٩٩٧).

بە شێوەیەکی گشتی، پەیوەندییەکانی نێوان تورکمانە سوونەکان و شیعەکانی ناوشاری کەرکووک تاکو کۆتایی رۆژگاری پاشایەتی بە ساردی ماوەتەوە. ئەوەش کۆمەڵێک هۆی لە پشت بوو، لەوانە: مەیلی سیاسی و پاشخانی ئایدیۆلۆجی هەر یەکەیان جیاواز بوو. تورکمانە شیعەکان لە پلەی یەکەمدا روو لە مەرجەعی شیعە و ئێران بوون، بە پێچەوانەوە، تورکمانە سوونەکان روو لە تورکیا بوون. لە لایەکی دیکەش، جیاوازی لە دابونەریتی تایبەت بە هەر گرووپێکیان، هەروەها جیاوازی لە شێوەزاری هەر یەکەیان. لە هەمووشیان کاریگەرتر بریتیبوو لە جیاوازی مەزهەبیی نێوانیان. هەر ئەم هۆییەی دواتریان بوو، ماوەی نەدابوو ژن و ژنخوازی لە نێوانیاندا بێتە ئاراوە (تاڵەبانی، ٢٠٠٣، ل٢٤).

تورکمانەکانی کەرکووک مستەفا کەمال ئەتاتورک (١٨٨١-١٩٣٨)یان خۆش دەویست، بەردەوام بەسەر شارەکانی تورکیایان هەڵدەدا، ئەوەش بووەتە هۆیەک بۆ دروستبوونی هەستیارییەک لە لای بەشێک لە پێکهاتەکانی دیکەی دانیشتوان بەرانبەر بە مەیلی سیاسیی تورکمانەکان لەو رۆژگارەدا (بۆتانی، پەیڤین، تەمووزی ٢٠٠٠، ل١٢). چونکە تورکمانەکان پاڵپشتییان لە ئایدیۆلۆجیەتی تورکیای کەمالی (رەگەزپەرستی) کردووە و کەوتوونەتە پشتگیری و بەرزنرخاندنی رەفتار و هەڵوێستەکانی تورکیا. لە بەرانبەردا، کوردەکان، بە تایبەت ئەوانەی هەڵگری فیکری نەتەوەیی و مەیلی سیاسییان هەبووە، دژی

کار و کردەوەکانی مستەفا کەمال و تورکیا بوونە. چونکە کوردەکانی ئەو پارچەیەی لەژێر دەستی تورکیادا بوو، لە لایەن کەمالییەکانەوە زوڵم و ستەمێکی زۆریان دەرحەق کرابوو و لە هەموو مافێکی سادەی نەتەوەیی بێبەشکرابوون.

ئەوەی جێی سەرنج و لێوردبوونەوەیە، پارتە سیاسییە چەپڕەوەکانی عیراق، کە هەڵگری بیروباوەڕی کۆمۆنیستی بوون، لە ئەنجامی پەراوێزخستنی کوردەکان لە لایەن حکومەتەوە، لە شاری کەرکووک و ناوچە کوردییەکان، ژینگەیەکی گونجاویان بۆ خۆیان دۆزیوەتەوە و کەوتوونەتە کۆشش بۆ پەلکێشکردنی پێکهاتە کوردییەکە بۆ ریزەکانی خۆیان. کوردەکانیش لە ئاکامی ئەو نادادی و سەرکوتکردنەی دووچاری هاتوون روویان لە ریزەکانی پارتە کۆمۆنیستەکان کردووە (أندرسن و ستانسفیلد، ٢٠٠٩، ص٥٩). لە کۆتاییدا، پێکهاتەکانی کەرکووک دووچاری دابەشبوون دەبن بەسەر سەربازگەکانی ململانێدا، لە نێوان دەسەڵاتی ناوەند (پایتەخت) و پارتە بەرهەڵستکار و قەدەغەکراوەکاندا.

**ئەنجام:**

لێکۆڵینەوەکە لە دوای بەراوردکردنی سەرچاوە مێژووییەکان و لێوردبوونەوە لە بەڵگەنامەکانی بەردەست، بەم ئەنجامانەی خوارەوە گەیشت:

- کۆمپانیای نەوتی عیراقی سنووردار (I.P.C.)، دوای دەستبەکاربوونی لە کێڵگەی نەوتی بابەگوڕگوڕ و هەڵقوڵانی نەوت لە ساڵی (١٩٢٧)دا، کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر بارودۆخی کۆمەلایەتیی شاری کەرکووک لە سەردەمی پاشایەتی داناوە. بەوەی خەڵکێکی زۆر لە شار و لیواکانی دیکەی عیراقەوە بە مەبەستی کارکردن روویان لە شاری کەرکووک کردووە و بە خاووخێزانەوە تیایدا ماونەتەوە و نیشتەجێبوونە.

- گواستنەوەی ئۆفیسی سەرەکیی کۆمپانیا ساڵی (١٩٣١) لە شارۆچکەی دوزەوە بۆ ناو شاری کەرکووک و هەناردەکردنی نەوت لە ساڵی (١٩٣٤)دا، بە خاڵێکی وەرچەرخان دادەنرێت لە مێژووی ئابووری و کۆمەڵایەتیی شاری کەرکووک. لەو ساڵە بەدواوە، قورساییەکی ئابووری و کۆمەڵایەتیی دیار بۆ شاری کەرکووک دروست بووە. دەستپێکی پیشەسازی نەوت و دەرهێنانێتی بە بڕێکی زۆر بە مەبەستی بازرگانی.

- کاریگەرییەکانی کۆمپانیای نەوتی عیراق لەسەر بارودۆخی کۆمەڵایەتیی شاری کەرکووک چەند لایەنە بوو، وێڕای رۆڵی گەورەی لە گەشەکردنی بەرچاوی پێکهاتەی دانیشتوانی شاری کەرکووک، لە ماوەی دیاریکراوی لێکۆڵینەوەکەدا، شوێن پەنجەی دیارییشی بەسەر دابەشبوونی جوگرافیی دانیشتوانەوە داناوە. بە هۆی چەند بارودۆخێکی تایبەتی پێکهاتەی دانیشتوانی مەسیحی قورسایی خۆیان لە بەشی سەرقەڵا گواستۆتەوە بۆ بەشی قۆریە.

- کۆمپانیای نەوت کاریگەرییەکی باشی لەسەر رەوشی خوێندن و فێرکردن لە شاری کەرکووکدا هەبووە و هاوکاری دەسەڵاتدارانی لەو

رووەوە کردووە. سەرباری ئەوەش بۆ خۆی رۆڵی بەرچاوی هەبووە لە دروستکردنی قوتابخانەکان لە کەرکووکدا.

- لە رووی تەندروستییەوە بوونی کۆمپانیای نەوت لە شارەکەدا، کاریگەرییەکی باشی هەبووە لە چارەسەرکردنی نەخۆشەکان و هاوکاریکردنی تەندروستیی کارمەندەکانی کۆمپانیا و ماڵ و منداڵیان، لە ریگەی پشکنینی سالآنە و ئەنجامدانی هەڵمەتی کوتان دژی نەخۆشییە باو و درمەکان. نەخۆشخانەی کەیوان لەو رۆژگارەدا بە باشترین نەخۆشخانەکانی نەک عیراق، بەڵکو رۆژهەلاتی ناوەڕاست هەژمار کراوە، کە خاوەنی ئامێر و تاقیگەی پێشکەوتوو و ستافی تەندروستی بریتانی بووە.

- کۆمپانیای نەوتی عیراق خزمەتگوزارییەکی زۆری پێشکەش بە شارەکە کردووە، لە رووی راکێشانی ئاوی خواردنەوە بۆ ناو شار بە رێگەی بۆڕی و هەروەها دانانی وێستگەی کارەبا و دابینکردنی تەزووی کارەبا بۆ شارەکە. سەرباری ئەوانەش رۆڵی بەرچاوی هەبووە لە کەمبوونەوەی کێشەی نیشتەجێبوون، لە سۆنگەی دروستکردنی سەدان یەکەی نیشتەجێبوون بۆ کارمەندەکانی، لە ناوچەکانی عەرەفە و بابەگوڕگوڕ. دوای جەنگی دووەمی جیهانییش، بە هۆی تێکەلاوبوون بە بازاڕە خۆجێییەکانی شارەکە، کۆمپانیای نەوت رۆڵێکی پۆزەتیڤی لە بووژانەوە و بەرەوپێشبردنی پیشەوەری لە شاری کەرکووکدا هەبووە، لە ئاکامدا کەرکووکییەکان بە هەندێک لەو پیشەوەرییانە دەناسرێنەوە، وەک: پیشەی بەرگدرووی، دارتاشی، ئاسنگەری و.. هتد.

- داهاتی تاکی کەرکووکی لە ئاکامی وەبەرهێنانە نەوتییەکانی کۆمپانیای نەوتەوە ئاستێکی بەرزی تۆمار کردووە و باری دارایی خێزانەکانی کەرکووک گەشاوەتەوە، لەو ئاکامەشدا خەڵکی کەرکووک خوولیای بنیاتنانی خانوو بە جوانترین نەخشەسازی و هەبوونی

ئۆتۆمــۆبێلی بــۆ دروســتبووە و بە هاوكــاری كۆمپانیــای نەوت و پرۆژەكانی لە شارەكەدا، بەشێكی دیاریان خەونەكانیان هاتۆتە دی.

- لەگەڵ هەمـوو ئەوانەشـدا كۆمپانیـای نەوت رۆڵـی كـاریگەری لە گۆڕانی رووخسارە كۆمەڵایەتییەكانی دانیشـتوانی كەركووك لە مـاوەی لێكـۆڵینەوەكەدا هەبـووە، بەوەی كۆمەڵێـك وەرزشــی نـوێی هێنـاوەتە شـارەكە و جەمـاوەری باشـیان هەبـووە، وەك یـاری سـەبەتە و یـاری تێنس و یاری گۆلف و یاری هـۆكی و..هتد. هەروەهـا هـانی دانیشـتوانی داوە بۆ بەكارهێنانی دووچەرخە (بایسكل) و رۆڵێكی باشی هەبـووە لەو رووەوە.

- دەسـەڵاتدارانی بریتـانی و حكـومەتی عیراقـی بە هـۆی گرنگـی و ستراتیجیبوونی شاری كەركوك، لە رووی ئابووری و سیاسـییەوە، لە هەوڵـی پەراوێزخسـتنی كـورد و گـۆڕینی بـاری پێكهـاتەی دانیشـتواندا بوونە. دەسەڵاتدارانی بریتانیا بۆ توونـدوتۆڵكردنی جێی پێـی خۆیـان و رەگداكوتانی دەسـەڵاتیان لە كەركـووك و نـاوچەكە، كە سـەرچاوەیەكی لەبـن نەهـاتووی نەوت بـوو، دەسـتیانكرد بە دروسـتكردنی ململانـێ و نـاكۆكی نەتەوەیـی و چانـدنی تـۆوی دووبەرەكـی لەنێـو پێكهاتەكـانی دانیشتوانی شاری كەركووك.

- دوای دروسـتبوونی دەوڵەتـی عیـراق (١٩٢١)، حكـومەتی عیراقـی مـۆركی فرەنەتەوەیـی شـاری كەركـووكی بە سـتراتیژیەتێكی قبـوڵكراو نەبینیوە. چونكە بە هۆی ئەو رێژە سەدییە كەمەی عەرەب لە شارەكەدا هەیبـووە، لەسـەریانی قـورس كردبـوو كەركـووك بە شـارێكی عیراقـی عەرەبی هەژمـار بكەن. چـونكە شـاری كەركووك لە پـلانە ئـابووری و سیاسـییەكانی دەسـەڵاتدارانی بریتانیـا و عیـراق بـایەخێكی تـایبەتی و گەورەی هەبووە.

- حكـومەتە یەك لە دوای یەكەكـانی عیـراق، لە دوای كۆتایهـاتنی كێشـەی ویلایەتـی مووسـڵ (١٩٢٦) و یەكلاییـبوونەوەی لە بەرژەوەنـدی عیـراق، هەروەهــا دوای دەسـتبەكاربوونی كۆمپانیــای نەوتــی تـوركی

(١٩٢٧) و هەڵقوڵینی نەوت لە كێڵگەی نەوتی بابەگوڕگوڕ، كردار و گوفتاریان یەک شێوە نەبووە. لە ئاكامی بەردەوامبوون و مكوڕبوونی كورد لەسەر دژایەتیكردنی دەسەڵاتی حكومەتی عیراقی عەرەبی، ئینگلیزەكان و دەسەڵاتدارانی حكومەتی عیراق لەپێناو لاوازكردنی وجوودی كورد لە كەركووک، كەوتنە جووڵە بۆ پەراوێزخستنی كورد و گۆڕینی باری پێكهاتەی كۆمەڵایەتیی شارەكە.

- دامەزراوە حكومییەكان و هەڵبژاردنی شاری كەركووک بۆ دانانی بنكەی تیپی دووەمی سوپا، بوونە بیانوویەكی باش بە دەستی دەسەڵاتدارانی عیراقی عەرەبیەوە بۆ هەوڵدان و تێكۆشان لەپێناو پارسەنگ راگرتنی باری نەتەوەیی لە شارەكە، بۆ ئەوەی كۆنترۆڵی بارودۆخەكەی پێ بكەن.

- خراپترین هەنگاوەكانی حكومەتەكانی عیراق لە سەردەمی پاشایەتیدا، بەرانبەر بە پێكهاتە كۆمەڵایەتییەكانی شار و لیوای كەركووک، بریتیبوو لە هەوڵی گۆڕینی باری دیمۆگرافیی ناوچەكە، لە رێگەی پرۆژەی ئاودێریی حەویجەوە (١٩٣٥)، كە بریتیبوو لە دروست كردنی قووڵایی نەتەوەیی عەرەب لە شار و لیواكەدا، بەوەی چەند عەشیرەتێكی گەورەی عەرەب لە قەزای ناوەندیی كەركووک نیشتەجێكران.

**پەراوێزەکان:**

(١) لە (٨ی حوزەیرانی ١٩٢٩) ناوەکەی بۆ کۆمپانیای نەوتی عیراقی سنووردار (I.P.C) گۆڕدرا.

(٢) یەک رووپیە بەرانبەر بە (٧٥) فلس بوو. واتە مانگانەی کرێکارانی ناکارامەی کۆمپانیای نەوت بریتیبووە لە (٦٠٠) فلس.

(٣) بەشێک لە دانیشتوانی کەرکووک و ئەوانەی لە کۆمپانیای نەوت کاریان کردووە، بە تایبەت کوردەکان، لەبەر سەرسامبوونیان بە کارەکانی کۆمپانیا لە کەرکووک، لە بابەتی ئاوەدانکردنەوەی شار و سەرکەوتنە گەورەکانی کۆمپانیا لە بڵاوکردنەوە و خستنەوەی رووخسارەکانی شارستانی و سیما سەردەمییەکان، جگەرگۆشەکانیان بەناوی پالاوگە و وێستگە نەوتییەکە کردووە، (کەیوان). ئەم ناوە، هەرچەندە رەگوڕیشەیەکی فارسی هەیە و لە بنەچەدا مانای دیکە دەبەخشێت، بەڵام لە لای کوردەکانی کەرکووک مەبەست لێی (k1) بووە. لە نموونەی ئەوانەی ناوی کوڕەکەیان بەم ناوە کردووە، نەوەی (حەمە رەشیدخانی بانە)یە، کە ئێستا بە (د.کەیوان ئازاد) ناسراوە. لە وەڵامی پرسیارێکدا، ناوبراو بەمشێوەیە وەڵامی دایەوە: "ناوی منیش ڕاستییەکەی لەم (k1) یان (کەی وەن) وەرگیراوە و ناونراوە، چونکە باوکی کۆچکردووم لەنێوان ساڵانی (١٩٥٨-١٩٥٠) لەگەڵ باپیری (حەمەڕەشیدخانی بانە) لە شاری کەرکوک دەژیاو نرایە بەر خوێندن و زۆر بەو شارە و خەڵکەی سەرسام بوو..." (دیمانەیەک لەگەڵ د.کەیوان ئازاد ئەنوەر، هەولێر، ٤ی نیسانی ٢٠١٩). وێستگە نەوتییەکانی کۆمپانیای نەوتی عیراقی سنووردار لەناو خاکی عیراق بریتیبوون لەمانە: (k1) کەرکووک، (k2) بێجی، (k3) حەدیسە، (T1) قائیم.

(٤) قیرتاوەکە لە جۆری قیرتاوەکانی ئەمڕۆژگارەی خۆمان نەبووە. بەڵکو بریتیبووە لە داپۆشینی شەقامەکە بە نەوتی رەش (جەفت).

(٥) لەنێو سەرچاوە مێژووییەکاندا بە شێوەی جیا جیا ناوی ئەم رووداوە براوە، لەوانە: شەڕی ئەرمەن، کوشتاری کەرکووک، یاخیبوونی کەرکووک، کارەساتی (١٩٢٤) و..هتد. بەڵام زۆرتر بە (شەڕی ئەرمەن) ناوی رۆیشتووە، ئەوەش لە ئاکامی جیانەکردنەوەی ئەرمەن لە ئاسوورییەکان لە لایەن دانیشتوانی شاری کەرکووک، کە هەردووکیان (ئەرمەن و ئاسوورییەکان) مەسیحیین و مێژووی پەیدابوون و هاتنیان بۆ ناوچەکە هاوسەردەمە بووە.

(٦) پرۆژەی ئاودێریی حەویجە بریتیبوو لە هەڵکەندی کەناڵێکی گەورە بە درێژایی (٥٥)کم، لە زێی بچووکەوە بۆ حەویجە، بە مەبەستی ئاودێری ئەو دەشتانەی لە حەویجە و دەوروبەریدا هەبوون. بڕوانە: د.خليل اسماعيل، البعد القومي للاستيطان العربي في محافظة كركوك، في: بحوث المؤتمر العلمي حول كركوك (٣-٥ نيسان ٢٠٠١، اربيل)، الطبعة الثانية، اربيل، ٢٠٠٢، ص٢٠٧.


**لیستی سەرچاوەکان:**

**بەڵگەنامە:**

١- بە زمانی عەرەبی:

- د.ك.و.ع، الوحدة الوثائقية، ديوان وزارة الداخلية، رقم الملفة: ٣١١/١١٣٩، الموضوع: مذكرة مستشار وزارة الداخلية حول الاوضاع في كردستان، شباط ١٩٣٠.
- د.ك.و.ع، الوحدة الوثائقية، ديوان وزارة الداخلية، رقم الملفة: ٣٢٠٥٠/٨٣١، العنوان: ميزانية لواء كركوك، (١٩٣٢-١٩٣٨).

١- بە زمانی ئینگلیزی:

- Iraq Administration Reports (1914-1932), Vol: (8), 1925-1927, Report by: His Britannic Majesty's Government on the Administration of Iraq.

**بڵاوکراوە حکومییەکان:**

١- بە زمانی عەرەبی:

- المملكة العراقية، وزارة الشؤون الاجتماعية (مديرية النفوس العامة)، إحصاء السكان لسنة ١٩٤٧، الجزء الثاني (لواء الموصل-لواء كركوك-لواء السليمانية-لواء اربيل)، بغداد، ١٩٥٤.
- الحكومة العراقية، وزارة الاقتصاد، الدائرة الرئيسية للاحصاء، المجموعة الاحصائية السنوية العامة لسنة ١٩٥٠، مطبعة الحكومة، بغداد، ١٩٥٢.
- الحكومة العراقية، وزارة الاقتصاد، الدائرة الرئيسية للاحصاء، المجموعة الاحصائية السنوية العامة لسنة ١٩٥٢، مطبعة الحكومة، بغداد، ١٩٥٤.
- الحكومة العراقية، وزارة الاقتصاد، الدائرة الرئيسية للاحصاء، المجموعة الاحصائية السنوية العامة لسنة ١٩٥٦، مطبعة الحكومة، بغداد، ١٩٥٧.
- الجمهورية العراقية، وزارة الاقتصاد، الدائرة الرئيسية للاحصاء، المجموعة الاحصائية السنوية العامة لسنة ١٩٥٧، مطبعة الزهراء، بغداد، ١٩٥٨.
- الجمهورية العراقية، وزارة الداخلية (مديرية النفوس العامة)، المجموعة الإحصائية لتسجيل عام ١٩٥٧، لوائي السليمانية و كركوك، مطبعة العاني، بغداد، دون سنة الطبع.

٢- بە زمانی تورکیی عوسمانی:

- موصل ولايتى سالنامەسى، ترتيب ايدن، مكتوبي ولايت صادق افندي، موصل ولايتى مطبعە سى – (١٣١٢هجرى/ ١٨٩٤ميلادى).

**دیمانە:**

- دیمانە لەگەڵ نووری فەقێ، کەرکووک ، ٢٦ی مایسی ٢٠٠٥.
- دیمانەیەک لەگەڵ د.کەیوان ئازاد ئەنوەر، هەولێر، ٤ی نیسانی ٢٠١٩.

**نامە و تێزە زانکۆییەکان:**

١- بە زمانی کوردی:

- عبدالرحمن، دڵشاد محمود، بارودۆخی کۆمەڵایەتیی شاری کەرکوک لە سەردەمی پاشایەتیدا (١٩٢١-١٩٥٨) لێکۆڵینەوەیەکی مێژووییە، تێزی دکتۆرا، پێشکەش بە ئەنجوومەنی کۆلێژی ئەدەبیات لە زانکۆی سەلاحەددین/ هەولێر کراوە، ٢٠١٢.
- عبدالرحمن، دڵشاد محمود، کەرکووک (لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی دەربارەی رۆڵی سیاسی و رۆشنبیری ١٩٣٢-١٩٥٨)، نامەی ماستەر، پێشکەش بە ئەنجوومەنی کۆلێژی ئەدەبیات لە زانکۆی سەلاحەددین/ هەولێر کراوە، ٢٠٠٦.

٢- بە زمانی عەرەبی:

- الاتروشي، خليل مصطفى عثمان، كوردستان الجنوبية (العراق)، في سنوات الاحتلال والانتداب البريطانيين (١٩١٨-١٩٣٢)، رسالة ماجستير، مقدمة الى مجلس كلية الاداب بجامعة دهوك، ٢٠٠٥.
- عبدالعزيز، دلشاد عمر، شركة نفط العراق المحدودة (دراسة تاريخية في نشاطها الاقتصادي والخدمي في كركوك ١٩٢٧-١٩٧٢)، أطروحة دكتوراه، مقدمة الى مجلس كلية الاداب في جامعة الموصل، الموصل، ٢٠١٤.

**کتێب:**

**أ- بە زمانی کوردی:**

- ئاغجەلەری، پشکۆ حەمەتاهیر، شاری کەرکوک لە نێوان ساڵانی (١٩١٧-١٩٢٦) توێژینەوەیەکی مێژوویی-سیاسییە، چاپی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠٧.
- تاڵەبانی، د.نوری، سیاسەتی بە عەرەب کردنی کەرکوک، وەرگێڕانی: مەریوان حوسێن چیمەنی، سلێمانی، ٢٠٠٣.
- تاڵەبانی، نوری، ناوچەی کەرکووک و هەوڵی گۆڕینی باری نەتەوەیی ئەم ناوچەیە، وەرگێران: محەمەدی مەلا کەریم، چاپی دووەم، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر. ٢٠٠٤.

- زەكی، محەمەد ئەمین، دوو تەقەلـلای بێ سوود، تـوێژینەوە: سـەباحی غالـب، چاپخانەی هەڵوێست، لەندەن، ١٩٨٤.
- سجادی، علاءالین، گەشتێک لە كوردستانا، چاپخانەی معارف، بەغدا، ١٩٥٦.
- شەریف، عبدالستار تاهر، ململانێ لەگەڵ ژیاندا (یادداشت) (١٩٣٥-١٩٧١)، بەرگی یەكەم، چاپخانەی ئارابخا، كەركووک، ٢٠٠٥.
- لۆمبۆرن، رونیە، كورد گەلێكی بێ وڵات، وەرگێرانی: ئەمجەد شاكەلی، چاپی یەكەم، ستۆكهۆڵم، ١٩٩٤.
- مینتیشاشڤیلی، أ.م، كورد (كورتەی پێوەندیی كۆمەڵایەتی- ئابووری- رۆشنبیری و گوزەران)، وەرگێرانی: د.عیزەدین مستەفا رەسووڵ، سلێمانی، ١٩٩٩.
- میران، رەشاد، رەوشی ئایینی و نەتەوەیی لە كوردستاندا، چاپی دووەم، سەنتەری برایەتی، هەولێر، ٢٠٠٠.

ب- بە زمانی عەرەبی:

- احمد، د.كمال مظهر، الطبقة العاملة العراقية (التكون وبدايات التحرك)، دار الرشيد للنشر، بغداد، ١٩٨١.
- احمد، د.كمال مظهر، كركوك وتوابعها حكم التاريخ والضمير (دراسة وثائقية عن القضية الكردية في العراق)، الجزء الاول، مطبعة رينوين، د.م، د.ت.
- اسماعيل، د.خليل ، البعد القومي للاستيطان العربي في محافظة كركوك، في: بحوث المؤتمر العلمي حول كركوك (٣-٥ نيسان ٢٠٠١، اربيل)، الطبعة الثانية، اربيل، ٢٠٠٢.
- آستارجيان، هنري، صراع على كركوك (افول الليبرالية العربية في نزاع السلطة والنفط)، ترجمه: ارا دمبكجيان، الطبعة الاولى، دار سائر المشرق، دون مكان الطبع، ٢٠١٨.
- ألبرت م. منتشاشفيلي، العراق في سنوات الانتداب البريطاني، ترجمة: د.هاشم صالح التكريتي، مطبعة جامعة، بغداد، ١٩٧٨.
- البرازي، نوري خليل، البداوة و الاستقرار في العراق، القاهرة، ١٩٦٩.
- البرازي والعاني، د.نوري خليل و د.خطاب صكار، جغرافية العراق، مطبعة الجامعة، بغداد، ١٩٧٩.
- حسن، عبدالمجيد فهمي، دليل مشاهير الالوية العراقية، الجزء الثاني (لواء كركوك)، مطبعة دجلة، بغداد، ١٩٤٧.
- الحسني، عبدالرزاق، رحلة في العراق أو خاطرات الحسني، الطبعة الثالثة، المطبعة العصرية، بغداد، ١٩٢٥.
- حسيب، خيرالدين، تقرير الدخل القومي في العراق (١٩٥٩-١٩٦١)، بيروت، ١٩٦٤.
- حسين، عبدالرزاق عباس، نشأة مدن العراق وتطورها، دون مكان الطبع، ١٩٧٣.

- الحيدري، رياض رشيد ناجي ، الاثوريون في العراق (١٩١٨–١٩٣٦)، مطبعة الجبلاوي، القاهرة، ١٩٧٧.
- الخالد والازري، خليل ابراهيم ومهدي محمد، تاريخ احكام الاراضي في العراق، دار الرشيد، بغداد، ١٩٨٠.
- خدريزادة، عبدالله، كركوك و رد الضجيج المنحرف، دار آراس للطباعة والنشر، اربيل، ٢٠٠٧.
- الخطاب، رجاء حسين حسن، تأسيس الجيش العراقي وتطور دوره السياسي من (١٩٢١–١٩٤١)، الطبعة الثانية، دار العربية، بغداد، ١٩٨٢.
- خورشيد، د.فؤاد حمه، كركوك قلب كردستان، من مطبوعات وزارة الثقافة، سليمانية، ٢٠٠٥.
- الدفتر و حسن، محمد هادي وعبدالله، العراق الشمالي، بغداد، ١٩٥٨.
- السماك، محمد أزهر، دور البترول في تغيير المجتمع العراقي، د.م، د.ت.
- شواني، محمد حسين محمد، التنوع الاثني والديني في كركوك، مؤسسة موكرياني للبحوث والنشر، أربيل، ٢٠٠٦.
- الطالباني، دلشاد محمد نجيب، دور سكان كركوك في بناء التجربة الديمقراطية في عراق المستقبل، في: كركوك مدينة القوميات المتآخية، وقائع الندوة العلمية التي عقدها مركز كربلاء للبحوث والدراسات، الطبعة الاولى، لندن، ٢٠٠٢.
- عبدالرضا، ماجد، المسألة الكردية في العراق حتى عام ١٩٦١، منشورات مكتبة بغداد، بغداد، ١٩٦٩.
- عبداللطيف بندر أوغلو، التركمان في عراق الثورة (تاريخيهم، لغتهم، آدابهم، تراثهم)، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٧٣.
- عرب آغا و ملا مصطفى، فهمي و فاضل محمد، ماذا؟ في: كركوك، كركوك، ١٩٥٧.
- العزاوي، فاضل، الروح الحية (جيل الستينات في العراق)، الطبعة الثانية، دار المدى للثقافة والنشر، دمشق، ٢٠٠٣.
- فتح الله، جرجيس، العراق في عهد قاسم (اراء وخواطر ١٩٥٨–١٩٨٨)، الجزء الثاني، ستكهولم، ١٩٨٩.
- قادر، د.جبار، السياسات الحكومية في كركوك خلال العهد الملكي (١٩٢١–١٩٥٨)، في: كركوك مدينة القوميات المتآخية، وقائع الندوة العلمية التي عقدها مركز كربلاء للبحوث والدراسات، الطبعة الاولى، لندن، ٢٠٠٢.
- ماتفييف، ق.ب. (مارمتي)، الآشوريون والمسألة الآشورية في العراق الحديث، ترجمة: ج.د.أ، الاهالي للطباعة والنشر، دمشق، ١٩٨٩.
- كوثر اوغلو، نجاة ، من حوادث كركوك (١١١٢–١٣٧٧هـ/ ١٧٠٠–١٩٥٨م)، الجزء الاول، الطبعة الاولى، كركوك، ٢٠٠٦.

- لانكلي، كاثلين ام.، تصنيع العراق، (ترجمة: د.محمد حامد الطائي و د.خطاب صكار العلي)، بغداد، ١٩٦٣.
- لوكيتز، ليورا، العراق والبحث عن الهوية الوطنية، (ترجمة: دلشاد ميران)، الطبعة الاولى، دار اراس للطباعة والنشر، أربيل، ٢٠٠٤.
- لونكريك وستوكس، ستيفن همسلي وفرانك، العراق منذ فجر التاريخ حتى ثورة تموز ١٩٥٨، ترجمة: مصطفى نعمان احمد، مؤسسة مصر مرتضى للكتاب العراقي، بغداد، ٢٠٠٩.
- نبز، جمال، المستضعفون الكرد واخوانهم المسلمون، الطبعة الاولى، من منشورات كوردنامة، لندن، ١٩٩٧.
- نجم الدىن، احمد، أحوال السكان فى العراق، القاهره، ١٩٧٠.
- النصري، د.عقيل، الجيش و السلطة في العراق الملكي (١٩٢١–١٩٥٨)، دار الحصاد، دمشق، د.ت.


### ج- بە زمانی ئینگلیزی:


- Edmonds, C.J., Kurds, Turks, And Arabs: Politics, Travel and Research in North- Eastern Iraq (1919-1925), Oxford University Press, London, 1957.
- Longrigg, S.H., Iraq: 1900 To 1950 (A Political, Social, And Economic History), Oxford University Press, Great Britain, 1953.
- Longrigg, S.H., Oil in the Middle East: Its Discovery and Development, Oxford University Press, London, 1968.
- Lyon, W. A., Kurds, Arabs, and Britons, the Memoir of Wallace Lyon in Iraq 1918-1944, (Edited and with an introduction by: D. K. Fieldhouse), Tauris Publishers, London, 2002.
- McDowall, David, a Modern History of the Kurds, I.B. Tauris & Co Ltd., London, 1996.
- Moore, Wilbert E., Social change, London, 1961.
- Stafford, R. S., The Tragedy of the Assyrians, George Allen & Unwin Ltd, London, 1935.
- Sonyel, S. R., Turkish Diplomasy (1918-1923), Mustafa Kemal and the Turkish National Movement, Sage Publications Ltd., London, 1975.


### د- بە زمانی تورکیی عوسمانی:


- ضابط، شاكر صابر، كركوكده اجتماعي حيات (فولكلور)، زمان باصم ئەوى، بغداد، ١٩٦١.


### وتار و توێژینەوە:

### أ- بە زمانی کوردی:

- بۆتـانی، كـاكه مەم، لە ئـامێزی كەركووكـدا (لە كـانوونی دووەمـی ١٩٥٤وه تـا ئەیلوولی ١٩٥٩)، "پەیڤین" (گۆڤار)، ژماره (٩)، سلێمانی، تەمووزی ٢٠٠٠.

**ب- به زمانی عەرەبی:**

- (أهل النفط) مجلة، العدد (٣٣)، لندن، نيسان ١٩٥٣.
- المراسل، اعداد جیل مهني في مركز التدريب الصناعي في كركوك، (أهـل الـنفط) مجلـة، العـدد (٥٩)، لندن، حزيران ١٩٥٦.
- المراسل، مشروع تملیك المساكن، (أهل النفط) مجلة، العدد (٥٦)، لندن، آذار ١٩٥٦.
- المراسل، مع ملائكة الرحمة في ك١، (أهل النفط) مجلة، العدد (٣)، لندن، تشرين الاول ١٩٥١.
- المراسل، صورة من الحركـة الرياضـية في كركـوك، (أهـل الـنفط) مجلـة، العـدد (٥٧)، لنـدن، نيسـان ١٩٥٦.
- الصمانجي، عزيـز قـادر، تغـيير الطبيعـة السـكانية لكركـوك، (ميزوبوتاميـا) مجلـة، العـددان (٥-٦)، جنيف-بغداد، تموز٢٠٠٥.
- شريف، جليل محمد، العـادات والتقاليـد القديمـة في كركـوك، "كركـوك" (مجلـة)، العـددان (٢٢-٢٣)، كركوك، خريف ٢٠٠٤/ شتاء ٢٠٠٥.
- شـريف، عبدالسـتار طـاهر، كركـوك مدينــة التـآخي بـين الكـرد والتركمـان خـلال نصـف قـرن، "الاتحاد"(جريدة)، الحلقة الثانیة، العدد (٢٠٥)، السليمانية، ١٥ شباط ١٩٩٧.

**ج- به زمانی ئینگلیزی:**

- Galletti, Mirella, Kirkuk: The Pivot of Balance in Iraq Past and Present, Journal of Assyrian Academic Studies, Vol. 19, no. 2, 2005.

## ملخص البحث

## (العوامل المؤثرة على الأوضاع الاجتماعية في كركوك ١٩٢١ ـ ١٩٥٨)

**د. دلشاد محمود عبدالرحمن**
قسم التاريخ –كليه الاداب
جامعه صلاح الدين– أربيل

تُعد كركوك أهم مدن جنوب كوردستان، وهي مدينة معروفة جيداً لعدة أسباب من بينها تاريخها العريق، وكونها أول مركز للصناعة النفطية الحديثة في العراق المعاصر بعد اكتشاف النفط واستخراجه بكميات تجارية من حقل (بابا كركر) النفطي منذ سنة ١٩٢٧، فضلاً عن كونها موضع خلاف بين قيادة الحركة الكوردية في جنوب كوردستان والحكومات العراقية.

إن تاريخ كركوك الاجتماعي بحاجة إلى مزيد من الاهتمام من قبل المؤرخين والباحثين، وهذا البحث مساهمة متواضعة في هذا الاتجاه. والغرض منه تسليط الضوء على أبرز العوامل المؤثرة على الأوضاع الاجتماعية في المدينة خلال العهد الملكي (١٩٢١ ــ ١٩٥٨)، وخاصة من الناحية الديموغرافية لهذه المدينة ذات القوميات المتعددة.

يتألف البحث من محورين، تناول الأول تأثير شركة نفط العراق (I.P.C) العاملة في حقول نفط كركوك على الأوضاع الاجتماعية في المدينة من خلال اجتذاب الأيدي العاملة غير الماهرة من مدن عراقية أخرى، وكذلك مساهمة الشركة في الخدمات والأنشطة التعليمية، الصحية، العمرانية، الثقافية والرياضية. أما المحور الثاني فقد خصص لتأثير العامل السياسي على تلك الأوضاع من خلال الإجراءات التي اتخذتها سلطات الانتداب البريطاني، والحكومات العراقية المتعاقبة. ومن أبرز تلك الإجراءات بدء سياسات التعريب في لواء كركوك، وإهمال شأن المكون الكوردي فيه، وكذلك جعل المدينة مقراً للفرقة الثانية في الجيش العراقي مع ما ترتب على ذلك من استقرار الكثير من جنود ومراتب تلك الفرقة المنحدرين من مدن عراقية أخرى في كركوك بعد جلب أُسرهم إليها، وبقوا فيها حتى بعد انتهاء خدمتهم العسكرية. وينتهي البحث بخاتمة تتضمن أهم النتائج التي توصل إليها الباحث.

# Abstract
# (Factors Affecting Social Conditions in Kirkuk City 1921 -1958)

***Dilshad Mahmoud Abdulrahman***
*History Department- College of Arts- Salahadin University -Erbil*

*Kirkuk is the most important city in south Kurdistan, it is a well known city for many reasons, among them her ancient history, economic importance as the first center of oil industry in contemporary Iraq since (1927) when oil discovered and production began in commercial quantities and being controversial between the leadership of Kurdish national movement and successive Iraqi governments.*

*The social history of Kirkuk needs more interest from researchers and historians, this paper is an attempt in this direction. The aim of this paper is to shed light on the main factors affecting the social conditions of the city during the monarchic age (1921 – 1958), especially on the demography of this multi- national city.*

*The paper consists of two topics, the first one deals with the effect of Iraqi Petroleum Company (I.P.C), Which was working in Kirkuk oilfields, on the social conditions of Kirkuk. This effect was achieved by attracting manpower from other Iraqi cities to Kirkuk and the (I.P.C) contribution to educational, health, urban, cultural and sport services and activities in the city. The second topic is devoted to the effects of political factor on social conditions in Kirkuk through political and military measures by British Mandate and Iraqi governments. This effect was evident at the level of changing the national composition of the city population through Arabization measures and policies.*

*The paper ends with a conclusion that includes the most important results reached by the researcher.*

# کورد لە ئەنترۆپۆلۆگیای سروشتیدا !

**پ. د. ڕەشاد میران**
بەشی کۆمەڵناسی/ کۆلێژی ئاداب
زانکۆی سەلاحەددین- هەولێر

**پێشەکی**

ئەنترۆپۆلۆگیا (مرۆڤناسی) زانستێکە دەربارەی مرۆڤ، تۆژینەوە لە سیما و تایبەتمەندییە جەستەییەکانی دەکات - وەکو : ڕەنگی پێست، باڵا، کەللەی سەر، قژ، چاو، لووت، ددان و لێو... ئەمانە هەمووی سیمای سروشتین کە بەسەر لایەنی دەرەکیی مرۆڤەوە دیار و بەرچاون. لە زۆربەی وڵاتانی ڕۆژئاوادا ناوی "ئەنترۆپۆلۆگیا " بۆ لایەنی کۆمەڵایەتی و کولتووریش بەکاردێت و، ئەم زانستە، دابەشکراوە بۆ هەرسێ بوارەکە: ئەنترۆپۆلۆگیای سروشتی، ئەنترۆپۆلۆگیای کۆمەڵایەتی و ئەنترۆپۆلۆگیای کولتووری ؛ بەڵام لە ڕووسیا و هەندێ وڵاتانی ئەورووپای ڕۆژهەڵات ئەنترۆپۆلۆگیا تەنیا سروشتییە، بۆ بوارەکانی نەتەوەیی و کولتووریش زانستی ئێتنۆگرافیا "ئێتنۆلۆگیا"و، هەروەها، زانستی "کولتوورۆلۆگیا 'شیان هەیە. هەرچی دەزگا ئەکادیمییەکانی خۆمانن، لە هەرێمی کوردستان، ئەوا بە هەمان شێوەی ڕۆژئاوا وشەی ئەنترۆپۆلۆگیا بۆ هەرسێ بوارەکە (سروشتی، کۆمەڵایەتی، کولتووری) بەکاردێنن.

جێگەی سەرنجە کە پسپۆرانی عەرەب بۆ ئەم زانستە دەنووسن "أنثروبولوجيا "، ئەوەش چونکە پیتی "گ"و "پ " لە ئەلفوبێی عەرەبیدا نیین... کەچی پسپۆر و نووسەرانی کورد، وەکو بڵێی ئەو دوو پیتە لە کوردیدا نەبن، بە هەمان شێوەی عەرەبی دەنووسن : ئەنترۆپۆلۆجیا یان ئەنترۆبۆلۆجی (هەروەهاش سۆسیۆلۆجیا، ئەتنۆلۆجیا و...)- کەچی وشە یۆنانی- لاتینییەکە بە G دەنووسرێ "Anthropology " و کوردیش ئەو پیتەی هەیە(گ) و کاتێکیش (ی) بەدوادا دێ دەنگەکەی قورستر

دەبێ، وەکو : گیان، گێ، گیا... ؛ ئەمە بێ ئاگا لەوەی کە دەنگی پیتی "ج" لای کورد سووک دێتە بەر گوێ (جەمیل، جوان، جیاواز، خەرجی، جەنجەڕ...)و جیایە لە عەرەبییەکەی. بۆیە گرنگە، بەڵکو پێویستە نووسینمان بە کوردی بێت.

**دەسپێک**

جیهانی بوونەوەران تژییە لە جۆر و لە چەشن : گیا و درەخت، ئاژەڵ و باڵندە، خشۆک و وردە زیندەوەر... و مرۆڤ – زیندەگی سیمای هاوبەشی هەموو ئەو بوونەوەرانەیە. مرۆڤیش بوونەوەرێکی زیندووە و لە سایەی یاساکانی سروشت، ئیکۆلۆگیا و بایۆلۆگیادا دەژی ؛ لەم ڕووەوە مرۆڤ دەچێتە ڕیز هەموو بوونەوەر و گیانلەبەرانی سەر ئەم زەمینە.

بەڵام مرۆڤ هەندێ تایبەتمەندیی هەن کە، وەکو جۆر (نوع)، جیای دەکەنەوە لە جۆرەکانی تری بوونەوەرانەوە ؛ ئەو تایبەتمەندییانەش، پێش هەموو شتێک، بایۆلۆگی و فسیۆلۆگین- وەکو توانای وەستان لەسەر دوو پێ (فسیۆلۆگی) و توانای قسەکردن (بایۆلۆگی) ؛ ئەم دوو تایبەتمەندییە هەر لە سەرەتای ژیانی زیندەگییەوە لەسەر زەمین لای مرۆڤ هەبووین و جیایانکردۆتەوە لە بوونەوەرانی ترەوە. زانا و پسپۆران توانیویانە ئاژەڵان، بەتایبەتیش مەیموونی شامپانزی کە نزیکترینە لە مرۆڤ، فێری گەلێ شت بکەن، بەڵام هەرگیز پێیان نەکراوە بیانهێننە گۆ یان بتوانن بە بەردەوامی، وەکو مرۆڤ، لەسەر دوو پێ بوەستن و بڕۆن / ترواداک،٢٠٠٩، ٤٥/. کەچی مرۆڤ، لەگەڵ ئەوەشدا، هەر لە سەرەتاوە بەم شێوەیەی ئێستاکەی نەبووە، بەڵکو لە ڕەوتی بوون و مانەوە و بەردەوامبوونیدا، وەکو چۆن لە لایەنی جەستەیی (ئەنترۆپۆلۆگی)یەوە، ئاواش لە بوارەکانی کۆمەڵایەتی و کولتوورییەوە چەندین گۆڕان و پێشکەوتنی بەخۆوە بینیوە- بەڵگەی ئەمەش دۆزینەوەی پاشماوە و ئاسەوارەکانی مرۆڤی کۆنن لەلایەن

ئاسەوارناس و ئەنترۆپۆلۆگیستانەوە کە، وەکو دواتر دەبینین، مرۆڤی کۆن لە گەلێ ڕووەوە جیاوازە لە مرۆڤی سەردەمی ئێستاکە.

ڕووبەری نشیمەنی کورد، کوردستان، کەوتۆتە ناوچەیەکی مێژوویی– کولتوورییەوە پێی دەگوترێ ئاسیای بەرایی، یان خوارووی ڕۆژئاوای ئاسیا کە هەر لە کۆنەوە جێگەی بەیەک گەیشتن و تێکەڵاوبوونی میللەت و نەتەوەی جۆراوجۆر بووە ؛ ڕەوش و کەشێکی کولتووری و ئێتنیی واش، بێگومان، جێپەنجە و ئاسەوارەکانی هەروەها بەسەر لایەنی جەستەیی دانیشتوانەکانی ئەم ناوچەیەشدا دەردەکەون– نموونەی هەرە دیاری ئەمەش گۆڕانی شکڵ و ڕوخساری تورکی ئەنادۆڵە کە بە ڕەچەڵەک سەربە ڕەگەزی مەنگۆلین. لەم ڕوانگەیەوە، کەواتە، کامانەن سیما جەستەییەکانی کورد، وەکو ئێتنۆس، لە ڕەوشێکی فرە ئێتنی و فرە کولتووریدا کە جیای بکەنەوە، یاخود نزیکی بکەنەوە لە ئاپۆرای خەڵکی تری ناوچەکەوە... ئەمە ئامانجی سەرەکیی ئەم تۆژینەوەیەیە.

**مرۆڤی کۆن و جۆرەکانی:**

تەمەنی بوونەوەری (Homo)،کە کاندید بوو بۆ وەرچەرخانی بەرەو مرۆڤبوون، لەسەر ئەم زەمینە، وەکو پسپۆران خەمڵاندوویانە، نزیکەی چوار ملیۆن ساڵە / تورا، فارنییە ٢٠٠٤، ٤٣/، بەڵام پرۆسەی وەرچەرخانەکەی تابڵێی درێژ و درەنگیش دەستی پێکرد.

زانا و پسپۆران لە ڕەوتی وەرچەرخان و گەشەکردنی Homo دا ئەم جۆر و قۆناغەکانیان دیاریکردوون :

**مرۆڤی شێوەی مەیموون Ape-man :**

ساڵی ١٩٠٢ لە ئوسترالیا ئاسەواری گیانلەبەرێک دۆزرایەوە کە زۆر لە مرۆڤ دەچوو و ناویاننا (Driopetic)بەیۆنانی واتە مەیموونی کۆن. ساڵی ١٩٢٤ لە ئەفریقیای باشوور ئاسەوارێکی نزیکتر لە مرۆڤ دۆزرایەوە و ئەم کرا بە ئاسەواری ڕاستەوخۆی مرۆڤی کۆن و بەناوی Australopticus ناسرا، ماناکەشی واتە مەیموونی باشوور

(ئۆسترالیکۆس- باشوور، خواروو) – ئەم گیانلەبەرە ٢,٣ ملیۆن ساڵ لەمەوبەر ژیاوە و لەلایەنی جەستەییەوە، لە هەموو ئەوانی تری پێش خۆی، لە مرۆڤ دەچوو و بۆیەش کرا بە باپیرەگەورەی ئادەمیزاد.

- ساڵی ١٩٥٩شێوەیەکی پێشکەوتووتری ئەم مرۆڤە لە تانزانیا، لە ئەفریقیا، دۆزرایەوە و ناوی- Zinjianthropus ی وەرگرت ؛ ئەمەیان ئەگەرچی هەندێ کەرەستەی ڕاوکردنیشی لەگەڵدا بوون، بەلاّم لەبەر ئەوەی جێگەی مێشکی لە کەللەی سەریدا تەنیا ٦٠٠-٧٠٠ سم$^3$بوو، بۆیە گومان خرایە سەر ئەوەی کە هەڵگری زمانێک بووبێت و کەواتە "کولتووری "شی نەبووە.

**مرۆڤی جاوە Pithecanthropus :**

هەروەها پێی دەڵێن Erect-Man واتە مرۆڤی قیت. شێوەیەکی پێشکەوتووترە لە دوورگەی جاوە لە ئەندونیسیا دۆزرایەوە لەلایەن یوجین دوبواری هۆلاّندی و تەمەنی بۆ نیو ملیۆن ساڵ دەگەڕێتەوە :

- ددانەکانی لە مرۆڤ نزیکن
- مێشکی 1000سم$^3$
- دوو قاچی درێژ و ڕاست

ئەم جۆرە مرۆڤە هەروەها لە (چین) یش دۆزرایەوە و ناوی Sinanthropusی وەرگرت ؛ ئەم مرۆڤە ئاگری بەکاربردووە و گۆشتخۆریش بووە، ئەمە لە ددانەکانی دەرکەوتووە. ئەم جۆرە لە ئەڵمانیاش(Heidelberg) دۆزراوەتەوە.

**نیاندرتاڵ Neandertal :**

ئاسەوارەکانی ئەم جۆرە مرۆڤە ساڵی ١٨٥٦ لە دۆڵی نیاندرتاڵ لە دوسلدۆرڤ (ئەڵمانیا) دۆزرایەوە.

- نیاندرتاڵی ئەورووپی / مێشکی ١٣٠٠-١٦٠٠ سم$^3$، درێژیی بالاّی پێنج پێ و لە دوا قۆناغەکانی چاخی بەستەڵەکدا ژیاوە، واتە سەربە کولتووری موستیرییە- بە ناوی ئەشکەوتی لێ موستیێ لە خوارووی

ڕۆژئاوای فەڕەنسا ؛ ئەو کولتووره ٥٥ – ٥٣ هەزار ساڵ بەرله ئێستا بووه..

- نیاندرتاڵی فەلەستین ؛ تەمەنی ٤٠ هەزار ساڵە، دەماغی نزیکە لەوەی مرۆڤ، باڵای زێتره له پێنج پێ...

- نیاندرتاڵی ئاسیایی ؛ لە کوردستانی عیراق لە ئەشکەوتی شانەدەر دۆزرایەوه. تەمەنی ئەم ئاسەواره ٤٥ هەزارساڵە، باڵای لە ئەوروپییەکە درێژتره، ڕاوکەر بووه –

- نیاندرتاڵی ئەفریقیا ؛ لە لیبیا و مەغریب دۆزرایەوه و شێوەی زۆر نزیکە لەوەی ئەوروپی، مێشکی ١٤٨٠سم$^3$...

لەوەدەچێ، چاخی موستیری چەندین شێوەی مرۆڤی تیا ژیاوه کە لە ئەنجامی بەیەکگەیشتن و تێکەڵبوون و زاوزێدا لەنێوانیان پرۆسەی تێکەڵاوبوونی بۆماوەیی (ألامتزاج الوراثي Hybridization) ڕوویداوه – هەر ئەوەش بووبە هۆکاری ونبوونی مرۆڤی نیاندرتاڵ لە کۆتاییەکانی چاخی بەردینیی ناوەڕاست و سەرهەڵدانی مرۆی هاوچەرخ / پێرشیتس، مۆنگایت، ئالیکسێیڤ. ١٩٨٢، ٥٦/.

کەواته، لێرەدا دەردەکەوێت کە نیاندرتال ئاڵقەیەکی گەشەکردن بوو لە پرۆسەی پێشکەوتنی بایۆلۆگیی مرۆڤدا ؛ ئەوەش، چونکە مرۆڤی سەردەم لە گەلێ ڕووەوه جیاوازه لە مرۆڤی نیاندرتال –




FIGURE 9–4
Comparison of the estimated cranial capacities of Australopithecus africanus, Homo erectus, and Homo sapiens, demonstrating the expansion of the brain in hominid evolution.
Source: Estimated cranial capacities from Tattersall et al. 2000. Reproduced by permission of Routledge, Inc., part of The Taylor & Francis Group.

Carol & Melvin Ember, Peter Peregrine,2011, p. 143

**ڕەگەزە ئەنترۆپۆلۆگییەکانی مرۆڤ:**

لەوکاتەوە کە مرۆڤی هۆشمەند Homo Sapiens لە دوا قۆناغەکانی چاخی پالیۆلیت (٤٠ هەزار ساڵ پێش ئێستا) لە چەند شوێنێک پەیدابووە و بە ناوچە و شوێنی دیکەی سەر گۆی زەوی بڵاوبۆتەوە، بەکاریگەریی هۆکاری جیۆگرافی، ئیکۆلۆگی، بایۆلۆگی و... چەندین ڕەگەز (Race)ی جۆراوجۆری بۆ دروستبوون؛ هەر ڕەگەزێکیش تایبەتمەندیی جەستەیی دیار و هەستپێکراوی بۆ مرۆڤەکانی لەگەڵدابوون و تاکو ئێستاش ئەو ڕەگەز و تایبەتمەندییەکانیان، یان هەر نەبێ پاشماوە و ئاسەوارەکانیان، هەر ماون... لەکاتی ئێستادا ڕەگەزە ئەنترۆپۆلۆگییەکان، بە ڕای زۆربەی پسپۆران، بەسەر سێ یان چوار جۆر دابەشکراون و هەر جۆرێکیش چەندین لق و بەشی هەیە.

دابەشکردنی مایێرس لە (Meyers Konversationslexikon) ساڵی ١٨٨٥ :

- ڕەگەزی قەفقاسی (ئاری، حامی، سامی)
- ڕەگەزی مەنگۆلی (مەنگۆلیی باکوور، چینی و هیندۆ-چینی، یابانی و کۆری، تیبێتی، مالایان، پۆلینێزی، ماوری، میکرۆنێزی، ئەسکیمۆ، هیندیی ئەمەریکایی)
- ڕەگەزی نیگرۆ (ئەفریقایی، هۆتینتۆ، میلانیزی/ پاپوا، "نیگریتۆ"، ئوستوراڵیی ڕەسەن، دراڤیدی، سینهالی)

کەچی Carleton S. Coon ساڵی 1962 ڕەگەزە مرۆییەکانی کردوون بە چوار جۆر :

- قەفقاسی / سپی
- مەنگۆلی / ئاسیایی
- نیگرۆ / ڕەش
- ئوستوراڵی

بە هەرحاڵ سەبارەت بە ڕەگەزە مرۆییەکان یەکڕایی نییە ؛ وە هەر لە ناوەندە سیاسی و زانستییەکاندا دژایەتیی زۆر و توندی خودی وشەی "ڕەگەز– Race " کرا و ئاکام ساڵی ١٩٥٠ لە نەتەوە یەکگرتووەکان قەدەغە کرا و پێشنیازکرا لەجیاتی "ڕەگەز " دەستەواژەی "گرووپەی ئێتنی " بەکاربێت... بەگوێرەی تۆژینەوەیەکی ساڵی ١٩٩٨ کە لە

the Scientific American بڵاو کراوەتەوە، زێتر لە ٥٠٠٠ گرووپی ئێتنی لە جیهاندا هەن /February 18, 2011 World-Mysteries Blog /

زۆربەی پسپۆڕانی ڕووسیش، بەهەمان جۆر، جەخت لەسەر چوار ڕەگەز دەکەن :

- ڕەگەزی سپی (ئەوروپی)
- ڕەگەزی ڕەش (زنجی)
- ڕەگەزی زەرد (مەنگۆلی)
- ڕەگەزی ئوستوڕالی

/ برۆملێی، ١٩٨٢، ١٥/ ؛/ چیبۆکسارۆڤ،١٩٨٥، ١١٦–١١٧/ ؛/ کوزمینا، ٢٠١٥، ١٢٣–١٢٧/.

پسپۆریش هەن شەش ڕەگەز، تەنانەت یازدەش دەژمێرن / المیر، ١٩٨٢، ١٠٣–١٠٤/.

لە ئەنجامی تێکەڵاوبوونی بەردەوامی ڕەگەزەکان بەهۆی کۆچکردن و ئاسانبوونی سەفەر و پەیوەندیکردنەوە، بێگومان گۆڕان لەلایەنی جەستەیی مرۆڤیش ڕوویداوە – لە لەش و جەستەی مرۆڤی ڕۆژگاری ئێستادا بەئاشکرا ئاسەوارەکانی چەند ڕەگەزێک دیارن: منداڵی دایک و باوکێکی ڕەش و سپی سیمای جەستەیی هەردووکیانی بەسەرەوە دیارن ؛ هەروەهاش وەچەی زەرد و سوورێک یان سپی و زەردێک.

زۆر گرنگە ئەوەش بزانین کە ئەمە تەنیا تێکەڵاوبوونێکی بایۆلۆگی و جەستەیی نییە، بەڵکو لەهەمان کات دروستبوونی کولتوورێکی

تێکەڵیشـە- ژن و مێردی سـەربە ڕەگـەزی جیـاواز، لەهـەمان کـات واتـە سـەربە دوو نەتـەوەی جیـاواز و،کەواتـە، سـەربە دوو کولتـووری جیاوازیش و وەچەکانیشیان ئەم تێکەڵاوییە ئـەنترۆپۆلۆگی- نەتـەوەیی- کولتوورییەیان پێوە دیاردەبێ. نە هەر ئەوە، بەڵکو، وەکو دواتر دەبینین، کولتوور جێپەنجە و کاریگەری بەسەر جەستەوە دەردەکەون.

**سیما ئەنترۆپۆلۆگییەکانی ئێتنۆسی کورد:**

ئەنترۆپۆلۆگیستانی سروشتی، وەکو لە سـەرەوە ئاماژەمـان پێدا، سـەرنج دەدەنە سـیما جەسـتەییەکانی مـرۆڤ و بەهـۆی ئەمەشـەوە ڕەگەزە مرۆییەکانیـان پـۆلینکردوون. جـا، هەر کۆمەڵبـوونێکی مرۆیـی، هەر کۆمەڵگا و هەر نەتەوەیەک، بەلای ئەوانەوە، دەکەوێتە نێو قەوارەی یەکێک لە ڕەگەزە ئەنترۆپۆلۆگییەکـانەوە. لەم ڕووەوە کـوردیش، وەکـو ئێتنۆسـێک، خـاوەن تایبەتمەنـدیی ئەنترۆپۆلـۆگیی خـۆیەتی و هەنـدێ لە پسـپۆر و شـارەزایان سـەرنجیان لەسـەر لایەنـی دەرەکـی و جەسـتەیی دەربڕیـون. زۆر لە سـەرنجەکان سـەرپێیی و هەنـدێ جـار نـاکۆک بە یەکـن، چـونکە تـاکو ئێسـتا دیراسـەیەکی ئەنترۆپۆلـۆگیی (سروشـتی) ئەکادیمی لەسەر کورد، جگە لە ئەوەی هینری فیلد، لە ئارادا نییە[1]؛ زیاد لەوەش، سـەرچاوەکانی ئەم بـابەتە کـۆنن، هەنـدێکیان زێتـر لە سـەدەیەکیان بەسـەرچووە ؛ لە مـاوەی سـەدەیەکدا، کەمتـریش لە سـەردەمی ئێسـتادا، گۆڕانکـاریی گەورە ڕوودەدەن و زانیارییەکـان دەگۆڕێن- ئەمە بۆ لایەنی سروشتیی مرۆڤیش ڕاستە.

سەرەتا، کورد سەربە ڕەگەزی سپییە، لە لقی "ئەفغانی "؛ هەندێک دەڵێن لقی "ئەرمینیۆدی "، یان 'ئاسیریۆدی " / ق. کوردۆیڤ. کوردەکان. لە کتێبـی "میللەتـانی ئاسـیای بەرایـی" ٢٩٥،١٩٥٧/ ؛ بە تەماشـاکردنێکی سـەرپێیی لێکچـوون و نزیکیـی جەسـتەیی کـورد و هەرسـێ میللەتـانی سەرەوە دەردەکەوێت.

هینـری فیلـد، کە پسـپۆرێکی ئەم بـوارەیە و، لەگەڵ تیمێکـی ئەکادیمیدا، نێردەی زانکۆی هارڤارد بوو بۆ ئەم ناوچەیە و ساڵی ١٩٥٢

کتێبێکی لەسەر باشووری کوردستان دەرکردووە بەناوی "جنوب کردستان- دراسة أنثروپولوجية "- نموونەی تۆژینەوەکەی پێکهاتبوو لە ٥٩٨ کەس لە شار و شارۆچکەکانی سلێمانی، ڕواندز، ئاکرێ و زاخۆ. فیلد لە تۆژینەوەکەیدا بەم ئەنجامانە گەیشتووە :

ڕەنگی پێستی کورد لە عەرەب سپیترە، بەڵام ناگاتە سپێتیی ئاشوورییان ؛ قژیان قاوەیی تۆخ یان ڕەشە کەمێک لوول و هەندێکیش دڕە ؛ چاویان قاوەیی تۆخ، کەچی ١/٣ ی نموونەکە ڕەنگی چاویان تێکەڵاو بوو، ئەوەش بەڵگەی هەبوونی توخمی مووزەرد (الشقرە)ی شاراوەیە تیایاندا ؛ دوازدە کەسیش لە نموونەکە چاوشین بوون... ڕێژەی ٦٨,٠٦ ٪ لووتیان چەماوە و ١٨,٠٦٪یان لووتی ڕاست... باری گشتییان باشە، ماسوولکە و تەندروستییان باشە /فیلد؛ ٢٠١٢، ١٣٠ /.

هەروەها "مرۆی کورد باڵای مامناوەندییە، پانتایی لەشی درێژ یان زۆر درێژە و قاچەکانیشی هەندێک کورتن. ناوچاوانی بەرین و سەریشی زۆر پان و خڕە. دەموچاوێکی درێژ یان مامناوەند، بە هەمان ڕێژەش دەموچاو خڕیان تیایە ؛ لووتیش لە پانی و درێژیدا مامناوەند و بەلای ورد و بچووکی دەچێ / فیلد ؛ ١٤٠- ١٤١ /.

هەرچی ئافرەتی کوردە، لە تۆژینەوەکەیدا،"بە بەراورد لەگەڵ عەرەبی عیراق، ڕەنگ سپییە؛ قژی قاوەیی ئاچوغ (کستنائی) و هەندێک لوول و دڕە ؛ چاوەکانی قاوەیی تۆخ ؛ شێوەی لووتی، لەلاوە، چەماوەیە یانیش قۆپاوە (مقعر) ؛ باری تەندروستی و ماسوولکەکانی مامناوەندین" / فیلد؛ ١٥٤/.

هەرچەندە ئەمە تۆژینەوەیەکی ئەکادیمی، پسپۆرانە و جێی متمانەیە، بەڵام نموونەی تۆژینەوەکەی (٥٩٨) کەس بە بەراورد بە هەموو نەتەوەی کورد نموونەیەکی تابلێی بچووکە و ئەم خەڵکی تەنیا لە چوار جێگە وەرگرتوون- سلێمانی، ڕواندز، ئاکرێ و زاخۆ کە بۆ تەنیا کوردستانی باشووریش هەر کەمە. سەبارەت بە ئێتنۆسێکی گەورە و بەربڵاوی وەکو کورد کە خاوەن خاک و جیۆگرافیا و

ئیکۆلۆگیای هەمەجۆرە، ئاسان نییە وێنایەکی دروست، ورد و هەمەکی لەمەڕ ئەندامانی بخەیتەڕوو... مخابن، تۆژینەوەی تری وەکو ئەوەی فیلّد چیتر ئەنجام نەدراون.

جگە لەم تۆژینەوە ئەکادیمییە، گەلێک لە گەڕیدە، ڕۆژهەڵاتناس، سیخوڕ و سیاسەتمەدار، هەروەها بەرپرسی عەسکەریی وڵاتان سەرنجیان لەسەر سیما جەستەیییەکانی مرۆی کورد دەربڕیوە... لەمانە: میلنگن، والتەر هاریس، فریزەر. هاملتۆن، ئێدمۆندز، سۆن و... هتد/ السندي ؛ ٢٠٠٧، ٢٣- ٢٧ /.

بە سەرنجدانێکی ورد بۆ سیما جەستەیییەکانی مرۆی کورد دەکرێ ئاماژە بە هەندێ لایەنی ئەنترۆپۆلۆگیی دیار و بەرچاوی مرۆی کورد بەگشتیی بکەین- لەوانە :

- باڵا مامناوەند
- گەنم ڕەنگ، بە لای سپیاتی
- کەللە سەری خڕ، سەر پانیشی زۆرە
- قژ ڕەش و چڕ
- چاو گەورە و ڕەش یان قاوەیی تۆخ
- برۆی پڕ و لێک نزیک
- لووت مامناوەند بەلای گەورەیی
- لێو باریک
- پێکهاتەی لەشی پڕ و تۆکمەیە

هەموو ئەو سیمایانە گونجاون لەگەڵ سروشتی کوردستان- چیا و دۆڵ و دەشت و، هەروەها، کەش و هەواکەی – سەرما و گەرما و وشکانی (کۆنتینێنتال- قاڕڕی).

### جەستە و کولتوور:

جەستەی مرۆڤ بە پلەی یەکەم پێکهاتەیەکی بایۆلۆگییە و لەسەر بنەمای مەرجەکانی سروشت(هەوا، ئاو، خاک...) زیندەگیی خۆی ڕاگرتووە ؛ بۆ بەردەوامبوون و گەشەکردنی جەستەیی خۆی، مرۆڤ

کۆمەڵێک کەرەستەی ماددی و نامادی داهێنان کە پێداویستییە هەرە گرنگەکانی بوون. داهێنانەکان بوون بە مایەی سەرهەڵدانی دیاردەیەکی کۆمەڵایەتیی گەورە و بنچینەیی لە ژیانی مرۆڤدا – ئەویش دیاردەی "کولتوور" ە. لێرەدا، ئەگەرچی ئەوە تایبەتمەندییە بایۆلۆگییەکانن کە توانای بەرهەمهێنانی کولتووریان لای مرۆڤ ڕەخساندووە (دەست و پەنجە، بالای قیت، بینین (stereoscopic vision)، ئامێری دەنگ و قسەکردن، مێشکی پێشکەوتوو)... بەڵام مرۆڤ بۆ مانەوەی، بەردەوامبوون و پێشکەوتنی پشتی بەستووە بە کولتوور و توخمەکانی، نەک بە گۆڕان و گەشەکردنی گێنێتیکی و بایۆلۆگی. ;John & Erna.Perry 2006, 51/

بە سەدان پێناسە، لەلایەن زانا و پسپۆرانەوە، بۆ کولتوور کراون، بەڵام هەرە کورت و ڕوونترەکەیان– کولتوور بریتییە لە "هەموو ئەو شتانەی دەسکردی مرۆڤن "/ Storey,2015,5؛ / ایرکسون و نیلسون، ٢٠١٣، ٦٥/ – ئەگەرچی دەبێ ئەوەشی بخەینەسەر کە نە هەموو شتێک، چونکە مرۆڤ ڕۆژانە کەرەستە و کەلوپەل دروستدەکات کەچی نامێننەوە و وندەبن، بەڵام ئەوانەی دەمێننەوە و ئەرک و وەزیفە جێبەجێ دەکەن دەبن بە "دەسکەوت"، ئەمانە دەبن بە توخمی کولتووری و جێگیر دەبن– جا ئەو دەسکەوتانە ماددی بن(خۆراک. جلوبەرگ، خانوو، کەلوپەل، چەک، ئامێری کارپێکردن، ئامێری مۆسیقا، خشڵ...)، یان مەعنەوی (زمان، باوەڕ، بەها، دابونەریت، ئەدەب و فۆلکلۆر، زانست...).

ئەگەر سەرنج بدەین، هەریەک لەو توخمە کولتوورییانە (ماددی و مەعنەوی) هەرگیز دابڕاو نین لە جەستە، بەڵکو ئەرکێک یان چەند وەزیفەیەکی جەستەیی بۆ مرۆڤ ئەنجام دەدەن... نە هەر ئەوە، بگرە کولتوور، هەندێ جار،گۆڕانکاریی لە جەستەدا دەکات– نموونە زۆرن: لەهەندێ شوێن ملی درێژیان لا جوانە، ئاڵقە دەخەنە ملی کچە منداڵەکان و زوو زووش ئاڵقەکان زیاد دەکەن، هەروەها پانکردن و درێژکردنی لێو و گوێچکەکانیان[٢] .




خەتەنەکردنی کوڕ و کچ گۆڕانکارییە لە سروشتی جەستەدا. ئەم گۆڕانکارییە کولتوورییانە لە جەستەدا، وەکو بینیمان، بۆ مەبەستی دیاریکراو ئەنجامدراون – چێژ، جوانی، باوەڕ...

لە ڕووی بایۆلۆگییەوە، بارستایی مێشکی مرۆڤەکانی سەر گۆی زەوی وەکو یەکە ؛ ئەمەش، واتە فیکر و تێگەیشتنی هەموویان لە یەک ئاستدایە... ئەوەی دەبێتە هۆکاری جیاوازی لە ئاستی فیکر و تێگەیشتنی مرۆڤەکان کولتوورە ؛ کولتووری ئەو کۆمەڵبوونە مرۆییە چەند و چی جۆرە مەعریفە، ئەزموون و شارەزایی لەخۆ گرتوون و پێشکەشی ئەندامانی دەکات و بەمەش جیایدەکاتەوە لە کۆمەڵبوونە مرۆییەکانی ترەوە. بە مانایەکی تر، ئەوە بڕ و جۆری مەعریفەیە کە ئاستی هۆشیاریی مرۆڤ دادەڕێژێ، ئەو مەعریفەیەش لە کولتووردا هەیە، چونکە مەعریفە لەناو توخمە کولتوورییە ماددی و، زێتریش، مەعنەوییەکاندا هەیە(زمان، باوەڕ، بەها، ئەدەب، زانست...) / میران، ٢٠١٧، ٧٦ /.

مرۆڤ بە سروشت کۆمەڵایەتییە، مرۆڤی تاک و تەنیا هەرگیز نەبووە. مرۆڤی سەرەتایی بە ڕەوە ژیاون ؛ کە کۆمەڵبوونەکەیان گەورە بووە پێویستییان بە ڕێکخستن بووە، ڕێکخستنیش واتە مەعریفە – تیایدا هەرکەسێک پلە و دەور و ئەرکی دیاریکرا، ئەمەش بووە مایەی

دروستبوونی کۆمەڵگا. لەم ڕووەوە کۆمەڵگا، کەواتە، پێداویستییەکی زیندەگی و بایۆلۆگی و کۆمەڵایەتیی مرۆڤ بووە بۆ مانەوە و بەردەوامبوون و گەشەکردنی...

بە گەڕانەوە بۆ لایەنی جەستەیی مرۆی کورد و بە سەرنجدانێکی ڕاستەوخۆی تۆژەر، دەردەکەوێت کە بەدەر لە کاریگەرییەکانی ئیکۆلۆگیا و تۆپۆگرافیا بەسەریەوە، لەڕووی ڕەنگ و بالاوە و، هەروەها، جگە لە ڕۆڵی تێکەلاوبوونی لەگەڵ ڕەگەزەکانی تردا – مووزەردی و چاوشین و مەنگۆلی... کولتووریش دەوری خۆی بینیوە لەسەر هەندێ سیما دەرەکی و جەستەییەکانی.

سەبارەت بە دەوری کولتووری کوردی –گیرکردن و خەواندنی کۆرپە لەناو لانکدا مرۆی سەرپانی بەرهەمهێناوە، هەروەهاش پێچان (مەلۆتکەکردن)ی کۆرپە کەسێکی توندوتیژ دێنێتە ئاراوە ؛ ئینجا، خەتەنەکردنی کوڕ و کچان- ئەمە دەسکاریکردنی سروشتە و گۆڕانکاری لە وەزیفە جەستەییەکانیاندا دەکات... ئەم سیمایانە بەسەر لایەنی جەستەیی و دەرەکیی مرۆی کوردەوە دیار و بەرچاون.

کولتوور شێوازی ژیانی ئێتنۆس دادەڕێژێ... شێوازی ژیانی کوردەواریش، کە بەگشتی لەسەر پیشەکانی کشتوکاڵی و شوانکاری دامەزراوە، پێویستی بە مرۆی بەهێز و توندوتۆڵ بووە- لەمەشەوەیە کە جەستەی مرۆی کورد "پڕ و تۆکمەیە ". جگە لەمەش، پرۆسەی پێگەیاندنی کۆمەڵایەتی socialization، کە لەلایەن کولتوورەوە بەڕێوەدەچێ، لە کۆمەڵگای کوردیدا بە یاساکانی پیاوسالاری جێبەجێ دەکرێ- منداڵی کوڕ دەکات بە پیاو، پیاویش دەبی بەهێز و ئازا و چاونەترس بێت و گەرەکە ئەمەش لە ڕوخسار و هەڵسوکەوتەکانی ڕەنگبداتەوە- هەڵسان و دانیشتن، ڕۆشتن و دەنگ و قسەکردنی (ئێستاش لە هەندێ شوێن عەیبەیە پیاو سەرکۆت بێت یان سمێڵ بتاشێ)... هەروەهاش سەبارەت بە کچ - دەبێ ببێت بە ژنێکی ملکەچ، گوێڕایەڵ، بێ دەسەلات و جەستەی داپۆشراو بێت.

گــۆڕانی کــۆمەڵایەتی و کولتــووری لە کۆمەڵگــای کوردیــدا لەمــاوەی، بــا بڵێـین، ٥٠ ســاڵی دواییـدا بێگومــان کــاریگەری لەســەر جەستەی مرۆی کورددا هەبووە – هەر لە کەمبوونەوەی هاوسەرگیریی نێـوان خزمــان (ئینـدۆگامیا) و زێـدەبوونی هاوســەرگیری لە دەرەوە (ئێگزۆگامیا) بگرە، تـا دەگاتە گۆڕانی خـۆراک، جلوبەرگ و، تەنانەت، خانوو و کەلوپەلەکانیش (کە ئەمانە توخمی کولتوورین) پێویستییان بە باڵا و لەش و لاری تایبەت هەیە جیاواز لەوەی پێش پەنجا، سەد ساڵ. هوشــیاریی تەندروســتی، زەوق و مگێـزی ئێســتاکە بەرەو جەســتەی باریک و لاوازە، بۆ ئەمەش خەڵکی ڕوویانکردۆتە وەرزش و خۆراکی تایبەت... هەموو ئەمە، لەلایەک ئەوە دەسەلمێنن کە جەستە و کولتوور بەیەکەوە گرێدراون، چونکە "جەستە لەماوەی چەندین سەدەدا گەشەی کـردووە و هۆکـار بـووە بـۆ داهێنـانی پەیوەنـدییە کۆمەڵایەتییەکـان کە ئەمــانیش، بە دەوری خۆیان،گەشــەی زێتریــان بە جەســتە کــردووە " /شــلنج،٢٠٠٩، ١٤٢ / ؛ لە لایەکــی تریشــەوە، بەڵــگەی ئەوەن کە داتـــا ئەنترۆپۆلۆگییەکان لە گۆڕاندان و هەرگیز جێگیر نین... بۆیە، ئەو سیما ئەنترۆپۆلۆگییـانەی لە ســەرەتای ســەدەی بیســتەم بـۆ مـرۆی کـورد دانــراون، ڕەنــگە زۆریــان، گــۆڕاون ؛ هەرچــی ســەرنجەکانی ئـێمەن سەبارەت بەم بابەتە مەیدانی و هاوچەرخن.

**ئەنجامگیری:**

١- زۆربەی زانــا و پســپۆڕانی ئەنترۆپۆلۆگیــا کــۆکن لەســەر چــوار ڕەگەزی ئەنترۆپۆلۆگیی سەرەکی (سپی، ڕەش، زەرد، ئوستڕالی)...

٢- ئەگەرچــی ئەم ڕەگەزانە هەر مــاون و بە پانتــایی گــۆی زەویــدا بڵاوبـوونەتەوە، بەڵام لە ئەنجـامی تێکەڵاوبوونیانـدا لـق و وردەلقـی جۆراوجۆریان بۆ دروستبووین...

٣- جەستەی مرۆڤ و کولتوورەکەی بەیەکەوە گرێدراون و کاریگەریی بەهێزیان لەسەر یەکدی هەیە...

٤- داتا و زانیارییە ئەنترۆپۆلۆگییەکان لەسەر کورد کۆن و زۆربەشیان ناپسپۆرانەن...
٥- جێپەنجەکانی سیما جەستەیییە جۆراوجۆرەکانی ئێتنۆسانی ناوچەکە بەسەر مرۆی کوردەوە دیار و ئاشکران...
٦- کـــورد ســـەربە ڕەگەزی ســـپی (ئەوروپـــی)یە لە لقـــی ئەفغـــانی (ئەرمینیۆدی).
٧- تایبەتمەندییە ئەنترۆپۆلۆگییە سەرەکییەکانی بەسەر جەستەی مرۆی کوردەوە ئەمانەن :
- باڵا مامناوەند
- گەنم ڕەنگ، بەلای سپیاتی
- کەللە سەری خڕ، سەر پانیشی زۆرە
- قژ ڕەش و چڕ
- چاو گەورە و ڕەش یان قاوەیی تۆخ
- برۆی پڕ و لێک نزیک
- لووت مامناوەند بەلای گەورەیی
- لێو باریک
٨- ســیما و تایبەتمەنــدییە ئەنترۆپۆلۆگییەکــانی مــرۆڤیش لە میــانەی پرۆسەی مێژوویدا دەگۆڕێن و جێگیر نین.

**گۆڕانی کولتووری:**

کولتوور و توخمە کولتوورییەکان چونکە ژیان بەڕێوەدەبەن، بۆیە دەبێ بەڕادەیەکی زۆر جێگیر و چەسپاو بن...
- لە لایەکی تریشەوە، ژیان لە گۆڕانی بەردەوامدایە..
- کەواتـە لێرەدا نـاکۆکی سـەر هەڵـدەدا و شـێوازی ژیـان ئـارامی لەدەست دەدات.
- بۆئـەوەی سسـتێمەکە خـۆی ڕێکبخاتـەوە و ئـارامی دابـین بکـات دەبێ کولتوور لەگەڵ پێداویستییە نوێیەکانی ژیان بگونجێنێ.

– ئەگەر سەرنج بدەین، گەلێک لە ئامێر و کەلوپەل و جلوبەرگی نوێ... هاتوونەتە ناو ژیانی ئێمەوە کە لەلایەکەوە بەرادەیەک بۆ ئێمە هێشتا نامۆن، لەلایەکی تریشەوە جێگەی خۆیان لە شێوازی ژیاندا گرتووە

– بۆ نموونە : ئێستاش خەڵکێک هەیە ئەو دەورە گەورەیەی مۆبایلی بۆ قووت نادرێ، نیگەرانە لە زۆربوونی ژمارەی ئۆتۆمۆبیل، کەلوپەلی ناوماڵی خۆی ناگۆڕێ، جلوبەرگ و خواردەمەنیی ئێستاکەی بەدڵ نین، کۆمپیوتەر بەکارنابا و نایەوێ خۆی فێر بکات...

کەچی هەموو ئەوانە و زۆری تریش بووین بە بەشێک لە ژیانی ئێمە و گەلێ ئەرک و وەزیفەی گرنگ جێبەجێ دەکەن – کەواتە بووین بە توخمی کولتووری لە کۆمەڵگای ئێمەدا.

– هاتنە ناوەوەی توخمی کولتووریی نوێ، بابەتێکی یەکجار گرنگە؛ چونکە زۆربوونی ئەم جۆرە توخمانە واتە گۆڕانی شێوازی ژیان لە کۆمەڵگادا...

– گرنگترین و سەرەکیترین هۆکاری گۆڕانی شێوازی ژیانیش بریتییە لە سەرهەڵدانی پێداویستیی نوێ بۆ ئەندامانی کۆمەڵگا – ئەگەر خەڵکێک پێویستی بە ئامێرێک یان کەلوپەلێک نەبێت و کاری پێنەکات، جێگەی لەناو کۆمەڵگادا نابێتەوە

– کەواتە کۆمەڵگایە بڕیار دەدات توخمی کولتووریی نوێ وەرگرێ – ئەگەرچی خەڵکێکیش دژی ئەمە دەوەستن.

### پەراوێزەکان:

[1] غنثر دیشنر لە کتێبی (الکرد شعب بدون دولة – تاریخ و أمل ؛ ت. د. جورج کتورە، ئاراس- الفارابی، ٢٠١٤، ص٩٢) ئاماژە بە دیراسەی ئەنترۆپۆلۆگیستی ئەڵمانی فلیکس فۆن لوشان دەکات کە تیایدا هاتووە (کورد لە بنەڕەتدا سپی و مووزەرد، چاوشین و باڵادرێژ بوون ؛ بە تێکەڵبوونیان لەگەڵ تورک و ئەرمەن و فارسدا وردەوردە بووین بە ڕەشتاڵە (ئەسمەر)) .

[2] ئێستاکە، لە ئەنجامی پێشکەوتنی زانستی و تەکنۆلۆگی، خەڵکی بە ئاسانی دەسکاریی جەستەی خۆیان دەکەن – گۆڕینی لووت و لێو و تەنانەت ڕەنگی پێستیش … وەکو چۆن گۆرانیبێژی ئەمەریکی مایکل جاکسۆن پێستی ڕەشی خۆی کرد بە سپی.

### سەرچاوەکان:


١- برتران ترواداک، علم النفس الثقافي، ترجمة: حکمت خوري و جوزف بو رزق بیروت، ٢٠٠٩.

٢- فیلیپ لاپۆرت تورا، جان بیار فارنییه، اثنولوجیا، أنتروبولوجیا، ترجمة: د.مصباح الصمد، بیروت ٢٠٠٤.

٣- ئا. پێرشیتس، ئا. مۆنگایت، ڤ. ئالیکسێیڤ، مێژووی کۆمەڵگای سەرەتایی، مۆسکۆ ١٩٨٢، بە زمانی ڕووسی.

4- Carol Ember, Melvin Ember, Peter Peregrine; Anthropology. Pearson Education, USA,2011,

5- February 18, 2011 World-Mysteries Blog http://blog.world-mysteries.com/science/how-many-major-races-are-there-in-the-world/

٦- یو. برۆملێی، گ. مارکۆڤ، ئێتنۆگرافیا، مۆسکۆ ١٩٨٢، بە زمانی ڕووسی.

٧- ن. چیبۆکسارۆڤ، ئی. چیبۆکسارۆڤا، میللەت، ڕەگەز، کولتوور، مۆسکۆ ١٩٨٥، بە زمانی ڕووسی.

٨- ڤ. کوزمینا، ڤ. بوزینا، ئێتنۆلۆگیا (ئێتنۆگرافیا)، مۆسکۆ ٢٠١٥ ، بە زمانی ڕووسی.

٩- ق. کوردۆیڤ، کوردەکان، لە کتێبی "میللەتانی ئاسیای بەرایی"، مۆسکۆ ١٩٥٧، بە زمانی ڕووسی.

١٠- هنری فیلد، جنوب کردستان، دراسە انترۆپۆلۆجیە "، ترجمة: جرجیس فتح الله، دارآراس ، أربیل ٢٠١٢.

١١- غنثر ديشنر لـه كتێبی (الكرد شعب بدون دولـة ، تـاريخ و أمـل، ت: د. جـورج كتوره، ئاراس، الفارابي، ٢٠١٤ .
١٢- د. بدرخان السندي، المجتمع الكردي في المنظور ألأستشراقي، أربيل ٢٠٠٧.
13- John Storey. Cultural Theory and Popular Cultur- An Introduction. 7th Edition, 2015, London- New York
١٤- د. ڕەشاد میران، سۆسیۆلۆگیای مەعریفە، هەولێر ٢٠١٧.
15- John A. Perry, Erna K. Perry; Contemporary Society, An Introduction to Social Science. USA , 2006
١٦- كرس شلنج، الجسد والنظرية الاجتماعية، ترجمـة: منى البحر ونجيب الحصـاد، القاهرة ٢٠٠٩.
١٧- المير اسماعيل علي، السلالات البشرية، بيروت ١٩٨٢.
١٨- توماس هايلاند ايركسون وفين سيفرت نيلسون، تاريخ النظرية الانثروبولوجيـة، ترجمة: أ. د. لاهاي عبدالحسين، بغداد ٢٠١٣.

## ملخص البحث

# الكورد في الانثروبولوجيا الطبيعية !

**ا.د. رشاد ميران**
قسم الاجتماع – كلية الاداب
جامعة صلاح الدين - اربيل

بحث عن الكورد من منظور الانثروبولوجيا الطبيعية يتناول التكوين الجسدي والسمات الطبيعية البارزة لدى أفراده بشكل عام ؛ وهذه تشمل، عادة، لون الجلد، شكل الجمجمة، نوع الشعر و لونه، العينين، الانف، الشفتين والأسنان، القامة، استقامة الساقين و...

و تكمن أهمية هذا البحث في أنه ومنذ العشرينات من القرن الماضي لم تجرى دراسة تخصصية عن هذا الموضوع، حيث قام الأكاديمي من جامعة هارفارد هنرى فيلد آنذاك بإجراء بحث في هذا المجال على عينات من المدن والأقضية الكوردية السليمانية، رواندز، عقرة و زاخو، و نشر نتائجه في كتاب بعنوان "كردستان الجنوبية– دراسة انثروبولوجية ". و بما أن النوع الأنثروبولوجي للشعوب قابلة أيضا للتغيير تحت وطأة التغيرات البيئية والبشرية وكذلك العوامل الأخرى، فانه من الضروري مراجعة تلك النتائج لإحياء والتأكيد على بعضها وإعادة النظر في أخرى ؛ وذلك في إطار بحث نظري يقوم على منهج التعايش والملاحظة المباشرة للتوصل الى نتائج جديدة حول هذا الموضوع.

# Abstract

## Biological Anthropology on Kurds

An Anthropological biological research on the Kurds, based on defining body characteristics and distinguished feathers of individuals in general , which normally includes skin color, shape of the scull , hair color and texture, eyes , nostril , teeth , height and shape of lower limps...etc

The importance of this research comes to the fact that since the study carried out by the Harvard University academic Henry Field during the 1920s in number of towns such as Akre , Sulaymaniyah, Rowandiz and Zakho, published under the title “ Southern Kurdistan - Anthropological Study “ no further specialized researches has been conducted. Taking into consideration changes do accrue to the anthropologic characteristics of a nation due to human, environmental and other factors it has become necessary to go over those findings in order to reaffirm the accuracy of some of those finding and also to re-evaluate others: within a framework of a study based on coexistence and close observations to arrive to new conclusions regard this subject.

# باندۆرا بكارئانينا تێگەهێن زانستی د رێكێن وانەگۆتنا ئەدەبێ كورديدا

**پ. ی. د. ئەحمەد محەمەد مام عوسمان قەرەنی**
وەزارەتی پەروەردە – ديوان

**١- پێشەكی**

**١-١ ناڤونيشانێ ڤەكۆلينێ:** "باندۆرا بكارئانينا تێگەهێن زانستی د رێكێن وانەگۆتنا ئەدەبێ كورديدا"يە، ئەڤە ژی ئەوێ رامانێ ددەت كو بايەخەكا پتر ب شيانێن قوتابيان بهێتە دان د بياڤێ وەرگرتنا تێگەهێن زانستيدا.

**١-٢ ئامانجا ڤەكۆلينێ:** دەستنيشانكرنا ئاستێ ئەوان قوتابيێن ژ ڤەرێژا ئەركێن خوە يێن گشتی دەردچن و ل دويڤ تێگەهشتنا تێگەهێن زانستی دگەهنە ئەنجامێن نوی.

**١-٣ سنۆرێ ڤەكۆلينێ:** ئەنجامێن ناڤەرۆكا ئەڤێ ڤەكۆلينێ دێ د ئەڤان سنۆراندا هێنە دەستنيشانكرن:

– سنۆرێ جهی: پۆلا نەهێ بنەڕەتی يا قوتابخانەيێن هەرێما كوردستانێ ڤەدگرێت.

– سنۆرێ دەمی: وانەيەكێ ژ وەرزێ يەكێ يێ پشكا ئەدەبی كو ل دويڤ پلانا وانەگۆتنێ (٤٠) خولەكان ڤەدكێشيت.

– سنۆرێ مرۆڤی: هۆبەيەكا قوتابيێن پۆلا نەهێ هاتيە وەرگرتن.

– سنۆرێ ئەكاديمی: بابەتێ جۆر و مەبەستەكانی هۆنراوە، كو يەك ژ بابەتێن وەرزێ پێشينە ژ پەرتووكا ئەدەبێ كوردی، ب رێيا نەخشەيێن تێگەهێن زانستی ڤە، پێناسە و ناڤەرۆك و هەڤبەنديێن وان دێ هێنە شرۆڤەكرن.

**١-٤ ئاريشەيا ڤەكۆلينێ:** ب نەبوونا تێگەهێن زانستی د بابەتێن ئەدەبيدا، تێكهەليەكا هەرەمەكی د ناڤبەرا تێگەهێن رۆژانە و تێگەهێن زانستيدا چێدبيت. هەموو قوتابی ب يەك جۆر و ب هەمان رامان زانياريیان فێرنابن و ب يەك

گۆشەنیگا ژی تێگەهێن ئەوان زانیارییان وەرناگرن. ئەڤە ژی كێشـەیەكە و پێـدڤی ب ڤەدیتنا ڕیگەچارەیەكێ هەیە.

**١–٥ ڕێبازا ڤـەكۆلینێ:** ژبـۆ كـو قوتـابی ل ژێـر چـاڤدێرییا مامۆسـتای و ب پشكدارییا هەڤالێن خوە، قۆناغێن وەرگرتنا تێگەهان ل سەر بنیاتێ شیانێن خـوە یێن كەسـێتی ئاڤـا بكـەت، پشـت ب "تیـۆرا چـاندا جڤـاكی ـ پەرەپێـدانا ناڤچـەیا ناوەندی" یا ڤیگۆتسكی هاتیە بەستن.

**١–٦ گرنگییا ڤەكۆلینێ:** دكارین د ئەڤان دوو خالاندا كورت بكەینەڤە:

ـ شیانێن قوتابیان ل پـەی جیاكـارییێن كەسـی، دێ هێنـە بنیـاتكرن و ڕێ ل بەر داهینانا وان هێتە خوەشكرن.

ـ دێ بەرچـاڤڕۆنییەكێ دەتـە شـارەزایێن دانانـا پرۆگـرامێن خوەنـدنێ، كـو جهـێ نەخشەیێن تێگەهێن زانستی د پەرتووكێن ئەدەبێ كوردیدا بكەنەڤە.

**١–٧ گریمانەیا ڤەكۆلینێ:** د ئەڤێ ڤەكۆلینێدا دێ هەول هێتەدان كو بەرسڤا ئەڤێ پرسیارێ بهێتە ڤەدیتن: ئایا دەما بۆچوونێن جـودا یـێن قوتابیـان ل بـارەی تێگەهێن زانستی ڕاست و درست بن، دێ بنە ڕێسایێن نوی و پشـكەك ژ پرۆگرامـێ خوەندنێ، و ئەگەر كێماسی تێدا هەبن دێ چەوا هێنە ڕاستڤەكرن؟

**١–٨ سترەكچەر و پلانا ڤەكۆلینێ:** ڤەكۆلین ژ دوو پشكان پێكهاتیە: پشكا یەكێ دوو تەوەران ب خوە ڤە دگریت، تـەوەرێ یـەكێ، جـەخت ل سـەر زاراوەیـا تێگـەهێن زانسـتی دكـەت و ژ ئـالیێ زمانـەڤانی و دەروونناسـیێ و زانسـتێن پەروەردەیێ ڤە لێكدەتەڤە. د تەوەرێ دوویێ ژیدا، بنەمایێن "تیۆرا چاندا جڤاكی ـ پەرەپێدانا ناڤچەیا ناوەندی" و ئەو ڕێكێن مندال تێدا فێـری وەرگرتنـا تێگـەهان دبـن شـرۆڤە دكـەت و پاشـی قۆنـاغێن گولڤـەدانا وێ فێربـوونێ و چـەوانیا بەردەوامبوونا پەرەپێدانا وەرگرتنا وان لێكدەتەڤە.

پشكا دوویێ ژی بۆ دانانا پلان و پێشكێشكرنا وانەگۆتنەكا نموونەیی هاتیـە تەرخانكرن ، كو جهێ وەرگرتنا تێگەهێن زانستی تێدا هاتبیتەكرن. ئەو وانـەژی ل بارەی یەكەم بابەتێ بەشا ئەدەبییە د كتێبا زمان و ئەدەبی كوردی یا پـۆلا نـەهێ بنەڕەتیدا، كو ب ناڤونیشانێ (ئەدەب ـ بەش و ڕەگەز و جۆرێن وی)یە.

ل داویێ ژی ئەو ئەنجامێن بدەستڤەهاتین تۆمارکرینە و لیستەیا ژێدەران ژی رێزبەندکریە و ب کورتەیا ڤەکۆلینێ ب هەردوو زمانێن عەرەبی و ئینگلیزی ب داوی هاتیە.

## ٢- پشکا یەکێ: چارچویڤێ تیۆریێ ڤەکۆلینێ:

### ٢-١ تەوەرێ یەکێ: زاراوەیا تێگەهێن زانستی و تایبەتمەندییێن وان

**٢-١-١ زاراوە:** هەر چەندە پێناسەیەکا تایبەت بۆ تێگەهێ نییە. د هندەک فەرهەنگێن زاراوەیێن ئەدەبیدا دهێتە ناساندن کو ((هندەك سالوخ و جوداکارینە ژبۆ دەستنیشانکرنا رامانا پەیڤەکێ دهێتە گۆتن . هەر وەکو پەیڤا مرۆڤی رامانا: ژیان و قسەکرنێ ددەت)) (عبدالنور، ١٩٧٩: ٢٥٩). د فەرهەنگێن زاراوەیێن زانستی ژیدا، بیاڤێ بکارهینانا وان زۆربوویە. د هەردوو حالەتاندا، تێگەهێن زانستی ب کرۆکا پرۆسەیا فێرکرنێ و پلانا هەر تویژینەڤەیەکا زانستی دهێتە دانین. هەر زانستەکێ تێگەهێن تایبەت ب خوە ڤە هەنە و ل دویڤ بسپۆرییا وێ ژی دهێنە پێناسەکرن. لەوما هەتا نها رێککەفتنەکا هەڤپشك ل سەر پێناسەیەکا دەستنیشانکری نەهاتیەکرن، لێ ئەوا هەموویان ژێك نێزیك دکەت، ئەوە، کو تێگەها زانستی ئەو ڤەگواستنە یا ژ کۆزانیارییا گشتی بۆ کۆزانیارییا زانستی دهێتەکرن و ب زمانەکێ بسپۆریێ دهێتە دەربڕین و ل سەر زاراوەیەکێ هاتبیتە بنیاتکرن. هەر زاراوەیەك بۆ تێگەهەکێ هاتیەدانان و ئەو زاراوە یەکدووگرنەڤە و چەندین دۆزان درست دکەن وەکو "ڕاستییان، پرەنسیپان، قانوونان، تیۆران" کو دبێژنێ بنیاتا زانستی. ژبەر کو تێگەهێ پێگەهەکێ سەرەکی د پرۆگرامێن خوەندنێدا هەیە، ب پێدڤی دهێتە زانین، کو ژ ئالیێ زمانەڤانیێ و دەروونناسیێ و زانستێن پەروەردەیێ ڤە بهێتە ڕاڤەکرن.

**٢-١-١-١ ژ ئالیێ زمانەڤانیێ ڤە، ژ دوو ئالییان ڤە دهێتە ڕاڤەکرن:** وەکو ڕوخسار گوزارشت ژ بنیاتێ پرەنسیپەکێ دکەت (Hormby, 2006: 313) تێگەها ڕوخساری ژی د هزرا زمانەڤانییێدا گولڤەدان و گۆڕانکارییێن بنەڕەتی ب سەردا دهێن و هندەك ژ ئەوان ب بنەمایا تێکستێ دادنێن (ویلیك، ١٩٨٧: ٥٢). ژ ئالیێ ناڤەرۆکێ ڤە ژی، ژ چەند تشتان یان نیشانان یان ڕویدانان پێکدهێت، کو ل سەر

بنگەهێ خەسلەتێن هەڤپشك بهەڤڕا هاتینە کۆمکرن و چێدبیت ب ناڤەکی یان ب جەڤەنگەکێ ئاماژە پێ بهێتەدان (وتسون، ١٩٩٣: ٧). لێ ئەگەر ئەو کۆمکرن ژ یەك ئەندامی پێکهاتبیت، یان ژی ئەندامێن ئەوێ کۆمێ ب تەڤاڤی ژێك جودا بن و چو وەکهەڤی د ناڤبەرا واندا نەبوو، ئەڤە ناکەڤیتە د چارچویڤێ تێگەهەکێدا.

**٢-١-١-٢** ژ ئالیێ دەروونی ڤە ژی، تێگەه ئەوان هەموو لایەنێن وەکو دیار کو نەوەکهەڤن، ب ڕێیەك ژ ڕێیان د جەڤەنگەکا گشتگیردا کورت دکەتەڤە (الحجازي، ٢٠١٢: ٣٤٨). وەکو بەرهەم ژی ب پرۆسەیەکا ژیری دهێتە هەژمارتن (النجدي، ٢٠٠٣: ٣٤٢). د ئەرکێ خوە ژیدا بیاڤەکێ دەروونی یان کریارەکا هۆشییە، بایەخەکا پتر ب بابەتەکی یان ژی هەڤبەندیێن بابەتەکی ب چەند بابەتێن دیکە ڤە ددەت (شریف، ١٩٨٥: ٤٤)، کو هەر یەك ژ ئەوان بابەتان یان حالەتان ناڤەکی یان تێرمەکا تایبەت بۆ دهێتە دانان (زیتون، ٢٠٠٣: ٢٨٦). ئەڤە ژی مە نێزیکی ئەوێ مانایێ دکەت، کو تێگەه پرۆسەیەکا ڕامانبەخشە و د چالاکییەکا پۆلینکرنێدا دهێتە ئەنجامدان.

**٢-١-١-٣** ژ ئالیێ زانستێن پەروەردەیی ڤە، وەکو زانستا پۆلینکرنا تێگەهان دهێتە خوەندن و بایەخێ ب پرۆگرامێن خوەندنێ و هۆیێن فێرکردنێ ددەت. ژ ستراتیژیێن وانەگۆتنا کارا و بژارتە ژی دهێتە هەژمارتن، لەوما جەخت ل سەر ڕێکخستنا زانیارییان و گەشەکرنا مەعریفی یا قوتابی دکەت. ئەو گەشەکرن ژی ب ڕێیا پرۆسەیەکا د ناڤبەرا فێربوونا قوتابی و فێرکارییا مامۆستایدا دهێتە ئەنجامدان، کو تێدا تێگەه کۆمەلەیەکا خەسلەتێن بنەڕەتییە و گوزارشتێ ژ پۆلینکرنا چەندین بۆچوون و ڕویدانان دکەت. ڕەفتارا پۆلینکاریێ ژی ئەوی دەمی درست دبیت، کو قوتابی نیشانەیەکێ یان تشتەکی یان ژی ڕویدانەکێ ب پەیڤەکا گشتی ناڤبکەت کو ئاماژە بیت بۆ ئەوی جۆری یێ مەبەست پێ هەی (وتسون، ١٩٩٣: ٩). د شرۆڤەکرنا ئەوان هەموو پێناسەیاندا، دکارین بگەهینە ئەوێ ئەنجامێ کو: تێگەها زانستی نژیارەکا ژیرییە ژ ئەوان کۆمەلە سالوخ و خەسلەتان پێکدهێت ئەوێن د چەندین ورووژێنەراندا هەڤپشکن و د نێڤ زانیاریێن ڕێکخستیدا دهێنە دانین و ڕێککەفتنەکا گشتی ل سەر دەستنیشانکرنا تێرمەکا تایبەت ب وێ ڤە هەبیت.

**٢-١-٤ تایبەتمەندیێن فێرکرنا تێگەهێن زانستی:**

ژبۆ رۆنڤەکرنا تایبەتمەندیێن فێرکرنا تێگەهێن زانستی وا پێدڤی دکەت، کو ژ ئالیێ قۆناغێن پەرەپێدانا وان ـ هەتا ب کورتی ژی بیت ـ بهێنە شرۆڤەکرن:

**٢-١- ٤- ١** ژ ئالیێ مێژوویێ ڤە، د هزرا فەلسەفەیێدا، هەر ژ سەردەمێ یۆنانێ وەسا دهاتە دانان، کو تێگەهێ هەڤبەندی ب بوونێ ڤە هەیە. تێگەهێن زانستی یێن هەر زانستەکێ کو ئەو ب خوە ئامراز و ئالاڤن، چو جاران وەك کریارەکا نەرێنی ژبۆ هەبوونەکا بەخشندەیا پێشوەختە دیار نابن، بەلکو وەك نیشانەیێن هزری، کو ب شێوەیەکێ سەربخوە داهینان تێدا هاتبیتەکرن دیاردبن. ئەو تیۆرا شیاندنا هزرێ هەتا سالێن شێستان ژی یا بەردەوام بوو، پاشان ژکارکەفت و ل هۆلێ رابوو. بیرۆکەیا زیرەکییا خوەرسکی هاتە د نێڤ پیشەیا فێرکرنێدا. ژیرۆم. س. برونەر (١٩١٥- ٢٠١٦) و لیڤ ڤیگۆتسکی (١٨٩٦- ١٩٣٤) و هندەك زانایێن دیکە پێڤەژۆیا دەروونناسیێ پێشڤەبر و پەیکەربەندییا وێ ل سەر بنگەهەکێ نوی ئاڤاکرەڤە، کو فێرخواز زیرەکن و کۆزانیارێن خوە هەنە و د چارچویڤێن راڤەکرنێ ژێدا لێکدەنەڤە (بغورة، ٢٠٠٧: ٢٠٤). برونەر د دانانا تیۆرا خوە و ئاراستەکرنا وێ یا چاندی و دیرۆکیدا، ب ئاراستەیا ڤیگۆتسکی یا گەشەکرنا مەعریفی ڤە داخباربوو. د ئەڤێ ئاراستەکرنێدا برونەری وەسا هزردکر کو گەشەکرنا مەعریفی هەتا رادەیەکا زۆر دکەفتە ژێر باندۆرا گەشەکرنا جڤاکی و تەکنۆلۆژییێدا، یان ژی گەشەکرنا مەعریفی بەرهەمەکێ پێگۆرکە د ناڤبەرا دەرڤەیا هەڤپشك و هندورا ژ شارەزابوون و پێگەهشتنا گەشەپێدانێدا پێکدهێت. ژ بەر ئەڤێ چەندێ بوویە کو، ئەوی دەروونزانییا گەشەیێ ب خوە ژی هەر ب چاند دزانی (ترۆادك، ٢٠٠٩: ٩٠).

**٢-١-٤-٢** ژ ئالیێ جۆرێن تێگەهان ڤە ژی، وەکو زانستەك دهێتە خوەندن، کو ب شێوەیێ نەخشەیەکا رۆنڤەکرنێ دهێتە دانان و ئاماژەیێ ژبۆ هەڤبەندیێن (لاوەکی) و (توندوتول) و (هەڤئاهەنگ) د ناڤبەرا تێگەهێن هەڤبەستدا دکەت (وتسون، ١٩٩٣: ١٥٢). ئەو هەر سێ هەڤبەندی بنەمایێن سەرەکینە ژبۆ دەستنیشانکرنا جۆرێن تێگەهان. پۆلینکرنا ئەوان جۆران، چەندین تیۆران ب خوە ڤە دگریت. خالا گرنگ د پۆلینکرنا تێگەهاندا ژی ئەوە، کو چەوا پەیدا دبن و

قۆناغێن پەرەپێدانا وان چەوا دهێتەکرن. ئەو تیۆرا جەخت ل سەر چەوانیا پەیدابوونا تێگەهان و قۆناغێن پەرەپێدانا وان و ئەو هۆکارێن تێگەهـ تێدا دبنە ئەلقەیا هەڤبەندیێ د ناڤبەرا چاندا مللی و رێکێن فێربوونا وان دا ب شێوەیەکێ زانستی، تیۆرا (چاندا جڤاکی - پەرەپێدانا ناڤچەیا ناوەندی)یا ڤیکۆتسکی یە، کو بوویە بنەما ژبۆ رێبازا ئەڤێ ڤەکۆلینێ.

## ٢-٢ تەوەرێ دوویێ: پێگەها تێگەهێن زانستی د تیۆرا ڤیگۆتسکی دا

ل پەی تیۆرا "چاندا جڤاکی — پەرەپێدانا ناڤچەیا ناوەندی" یا ڤیگۆتسکی، ئەو ئاریشەیێن د شرۆڤەکرنێن دەروونییێن فێرکرنێدا درست دبن، نە ب شێوەیەکێ راست دێ هێنە چارەسەرکرن و نە شێوازا وان ژی دهێتە دارشتن، هەتا ئەو هەڤبەندییا د ناڤبەرا فێربوون و گەشەکرنا زارۆکان د تەمەنێ قوتابخانێدا نەهێتە چارەسەرکرن. ئەڤە ژی یا رۆهن و ئاشکرایە کو، هەموو پرسێن سەرەکی، ئەوێن تیۆرێن گەشەکرنا زارۆکی د پرۆسەیا فێرکرنێدا ل سەر دهێنە کرن پشت ب ئەوێ بۆچوونێ دبەستن (VYGOTSKY, 1979: 79). ئەوی ژی بنگەهێن تیۆرا خوە ل سەر ئەوێ بۆچوونێ دانینە، کو ژ سێ پێنگاڤان پێکهاتیە:

١- ئەو ئەرك یان کارێ ددەنە سەر ملێ زارۆکی ژ شیانێن وی مەزنترن و ب ئەوان شیانێن خوە یێن ئاسایی نکاریت ئەوان چارەسەر بکەت.

٢- هندەك تشتێن یارمەتیدەر ل جەم زارۆکی بهێنە دانان. چاڤدێر دێ بینیت کو ئەو زارۆك دێ هەولدەت سوودێ ژ ئەوان ئالاڤان وەرگریت و ئاریشا خوە پێ چارەسەر کەت.

٣- هندەك ورووژێنەرێن کو ئەرکێن تایبەتی هەنە بۆ بهێنە پێشکێشکرن، ب تایبەتی ب رێیا ئەوان ئالاڤێن یارمەتیدەرێن کو پرۆسەیا چارەسەرکرنا ئاریشەیان ئاسان دکەن.

ئەو هەر سێ وروژێنەرێن سلال، هۆکارێن یارمەتیدەر بوون ژبۆ تیۆرا ڤیگۆتسکی، کو چارچوێڤێ وێ یێ گشتی خوە د ئەڤان خالێن ژێریدا دبینتەڤە:

١- کارلێککرنا جڤاکی رۆلەکێ سەرەکی د پەرەسەندنا دەرکپێکرنێدا هەیە. پەرەسەندنا چاندی یا زارۆکی ژی، دوو جاران خویا دبیت: جارا یەکێ ل سەر

ئاستێ جڤاكی و جارا دوویێ ل سەر ئاستێ تاكەكەسی. ئەڤە ژی ئەوێ چەندێ دگەهینیت، كو لایەنێ كۆزانیارییا وی، ل دەستپێكێ د ناڤ خەلكیدا پەیدا دبیت و پاشی د ناخێ خوەدا.

٢- پەرەسەندنا دەركپێكرنێ ل جەم فێرخوازی پشت ب (ناڤچەیا وەرارا نیزیكیا ناڤەند Zone of Proximal Development ) دبەستیت. ئاستێ ئەوێ پەرەسەندنێ هنگی پێشدكەڤیت دەما زارۆك دكەڤنە نیڤا رەوشتا جڤاكیدا، چونكە ئەڤێ پەرەسەندنێ پێدڤی ب كارلێككرنەكا تەڤاڤ هەیە.

ئەو ورووژێنەرێن ڤیگۆتسكی كرینە بنگەهێن تیۆرا خوە، كو ئالاڤێن دەرڤەیی وەكو ئامرازێن كارلێككرنێ (ئەركەكێ بەردەوامبوونێ) سەرەرای ئەركێن خوە یێن كۆزانیارییێ بكاردهاتن.. د قۆناغێن پاشی، یان ژی ئەوێن پێشكەفتی تردا، ل جهێ ئەوان ئالاڤێن دەرڤەیی ئاماژە و جەڤەنگ وەكو پەیڤان ژبۆ ئەوان ئەركان بكاردهێن. ب ئەوان ئەركان ژی دبنە بنگەهێ سەرەكیێ چالاكیێن دیكە یێن كۆزانیارییێ. بۆ نموونە ئاخفتنا زارۆكی وەكو ئامرازەكا كارلێككرنێ بكاردهێت، چێ دبیت ببیتە بگۆرا كورتڤەبرینێ، هەروەسا وەكو ئامرازەك ژبۆ چارەسەركرنا ئاریشەیێ ژی بكاردهێت. هۆسا هندەك هێزێن دینامیكی هەنە، كو هەموو لایەنێن كەسایەتیێ پێشڤەدبەن و ب هەر سێ رەهەندێن سەرەكیێن پەرەپێدانێ ڤە دگرێداینە، ئەو ژی ئاستێن پالنەر و هندور و دەرڤەیی نە. ئەڤە ژی گرنگترین لایەنێن دینامیكینە، چونكە ب شێوەیەكێ بەرفرەه كاردكەن. هەروەسا لایەنەكێ دیكە هەیە، كو سەرەدەرییێ دگەل دینامیكیێدا دكەت، ئەو ژی ئەو بەشا كەسایەتییێە یا سەرەدەرییێ دگەل ئاخفتنێ دكەت و ئەوان ئاستان ڤەدگریت یێن باندۆرا خوە ل سەر گەشەپێدانا وێ هەیە (VYGOTSKY, 1979: 67).

تشتەكێ ئاساییە كو، پیڤەرەكێ بنگەهین د ناڤبەرا ئێماژە و ئالاڤێدا هەبیت. هەر یەك ژ ئەوان ئەركەكێ ناڤبەندیێ خوە هەیە، ل دویڤ نەرینا دەروونزانییێ، ل ژێر هەمان جۆر دهێنە دانین. دكارین ئەوێ هەڤبەندییا لۆژیكی یا د ناڤبەرا بكارهینانا ئێماژە و ئالاڤاندا، د وێنەیێ هەژمار (١) دا دەربڕین كو هەر تێگەهەك د ناڤبەندا چالاكیەكێدا ب شێوەیەكێ نەراستەوخوە دكەفتە ژێر تێگەهەكا دیكە یا بەرفرەهتر (Vygotsky, 1930, 54) .




وێنەیێ هەژمار (١)

هەر ژبەر رۆلێ ئالاڤێن دەرڤەیی یێن یارمەتیدەر و کەسانێن دیکە یێن شارەزاتر بوویە، وەکربوو، کو ڤیگۆتسکی ل بارەی وەرگرتنا مرۆڤی بۆ کۆزانیارییان، جەخت ل سەر کارلێککرنا جڤاکی بکەت. ئەو دلنیابوو کو ناڤچەیا وەرارا پلخوەش (ناڤچەیا وەرارا نیزیکیا ناڤەندی ـ ZPD) ب کارلێککرنا جڤاکی دگەل کەسەکێ بالقبوویی یان هەڤالەکێ کو ژ ئەوی شارەزاترە دهێتە ئەنجامدان (جابر، ١٩٩٩: ١٤٤). ل ڤێرە وەسا پێدڤی دکەت، کو هندەك ل سەر تێگەه و پێگەها ئەڤێ (ناڤچەیا وەرارا نیزیکیا ناڤەندی) براوەستین و ب کورتی شرۆڤە بکەین.

**٢-٢-١ ناڤچەیا وەرارا نیزیکیا ناڤەندی (ZPD):**

ل بارەی تێگەها وێ، بیاڤەکە د ناڤبەرا ئاستێ وەرارا کرداری، ئەوا ب شێوەیەکێ سەربخوە د ئەنجامێ چارەسەرکرنا ئاریشەیەکێدا درست دبیت و د ناڤبەرا ئاستێ وەرارا پلخوەشدا ، ئەوا د دەمێ چارەسەرکرنا ئاریشەیێدا ب ئالیکارییا کەسەکێ مەزنتر (مامۆستا) یان ب ئالیکارییا هەڤالان چێدبیت (Burden, 1998: 155). ب ئەڤی شێوەیێ سلال، ئەوا زارۆك ئەڤرۆ ب ئالیکارییا هەڤالان فێربووی، دکاریت سوبەهی ب تنێ ئەنجام بدەت. ئاستێ ئالیکارییێ دێ دگەل وەرارا زارۆکی هێتە گۆڕین، هەتا دگەهتە ئەوی ڕادەیی، کو گەلەك تێگەه و کارامەیێن ئالۆز فێردبیت. ئەو ڕەوش بەردەوام دبیت هەتا زارۆك بخوە بشێت کۆزانیارییان وەربگریت و ب درستی پشت ب خوە ببەستیت، هەر وەکو د ئەڤی وێنەیێ هەژمار (٢) دا خویا دبیت:




وێنەیێ هەژمار (٢)

**٢-٢-٢ سنۆرێن ناڤچەیا وەرارا نیزیکییا ناڤەندی (ZPD):**

د ئەنجاما ڤەکۆلینانـدا دیاربوویـە، کـو ناڤچـەیا وەرارا نیزیکییـا ناڤەنـدی ب چار پێنگاڤێن سەرەکی یێن رێزبەندکریدا درست دبیت:

١ـ کریارا یارمەتیدەر ژ کەسانێن دیکە، ئەوێن شیانێن پتر هەنە.

٢ـ کریارا یارمەتیدەرا خوەدی.

٣ـ کریار ب خوە وەرارێ دکەت و دچەسپیت.

٤ـ ب نەمانا کریارا خودکاری، دێ پاشڤە زڤرینەك د ناڤچەیا وەرارا نیزیکییـا ناڤەندیدا چێبیت.

پرۆسەیا فێربوونێ ژی، ژ ئەڤان پێنگاڤێن یەك ل دویڤ یەکێدا پێکدهێت. ئـەو ژی، د ناڤچـەیا وەرارا نیزیکییـا ناڤەندیـدا دهێنـە رێکخسـتن. ژ یارمەتیـدانا کەسێن دیکـە، بـۆ یارمەتیـدانا خـودی دهێنـە ڤەگواسـتن. ب دووبارەبوونـا ئـەوان پێنگاڤان واتاییێن نوی چێ دبن و شیانێن ئـەوی کەسـی گەشـە دکـەن (جابر، ١٩٩٩: ١٤٤). هۆسـا فێربـوون ل نـك ڤیگۆتسـکی: پرۆسـەیەکا جڤـاکی دینامیکییـە د گفتوگۆیـەکا د ناڤبـەرا فێرخـواز و فێرکاریـدا دهێتـە ئەنجامـدان، کـو تێـدا فێرکـار جەخت ل سەر دەرخستنا کارامەیی و شیانان دکەت (زیتون، ٢٠٠٣: ١٣٧).

### ٢-٢-٣ دینامیکییا سنۆرێن ناڤچەیا وەرارا نیزیکییا ناڤەندی (ZPD)

ناڤچەیا وەرارا نیزیکییا ناڤەندی، یا جێگیر نییە، بەلکو د ڕووچوونەکا ئاست ئەڤرازدایە. بەردەوام د کردارێن زارۆکیدا دووبارە دبیتەڤە. کارامەیی و ڕەوشت د ئەڤێ ناڤچەیێدا، دینامیکی و نەجێگیرن.

ئەوا ئەڤرۆ زارۆك ب یارمەتییا ئەوێن دیکە فێر دبیت، ل داهاتی، دێ ب تنێ ئەنجامدەت و ئەڤ پرۆسەیە د دەورانەکا بەردەوامدا دزڤڕیت هەتا زارۆك دەستهەل دبیت . ئەڤێ ناڤچەیێ بنەماییێن خوە هەنە، کو ب کورتی ئەڤەنە:

١- ئەو ناڤچەیە ژ زارۆکەکی بۆ زارۆکەکێ دیکە جودایە.

٢- هندەك زارۆکان یارمەتییەکا زۆر دڤێت و کارەکێ کێم دکەن.

٣- هندەکێن دیکە یارمەتییەکا کێم دڤێت و کارێن مەزن ئەنجام ددەن.

٤- قەبارەیا ئەوێ ناڤچەیێ ل جەم هەموو زارۆکان هندی یەك نییە.

٥- ل جەم هەر زارۆکەکی ژی ئەو ناڤچەیە ل هەموو جهان هندی یەك نییە، هەروەسا هەموو دەمان ژی، ل جەم وی، وەکو یەك نییە. ب تایبەتی د دەمێن جوداهییێن پرۆسەیا فێربوونێدا.

کار و ئەرکێن ئەڤێ ناڤچەیێ کو ل دویڤ ئەوان بنگەهێن ل سەر هاتینە نژاندن، د ئەڤی وێنەیێ ژێریدا خویا دبیت (الدواهیدی، ٢٠٠٦: ٢٧):




وێنەیێ هەژمار (٣)

### ٢-٢-٤ دینامیکییا سنۆرێن گەشەکرنا نێزیکییا ناڤەندی

پرۆسەیێن فێرکرن و فێربوونێ د پۆلێن خوەندنێدا، ئەوێن باندۆرا خوە ل سەر ناڤچەیا گەشەکرنا نێزیکییا ناڤەندی هەیە، پشت ب ئەڤان هۆکارێن ژێری دبەستن:

١- سروشتێ کارلێککرنا جڤاکیا فێربوونێ.

٢- رۆلێ ئالاڤێن دەروونی و تەکنیکی.

٣- رۆلێ کارلێککرنێن جڤاکی وەکو ناڤبەندەك بۆ هزرکرنا فێرخوازی و کریارێن چاندی.

٤- رۆلێ دوو لایەنی د ناڤبەرا تێگەهێن رۆژانە و زانستیدا.

ڤیگۆتسکی د تیۆرا خوەدا، هەفت قۆناغ دەستنیشان کرینە، کو ژ هەیڤا یەکێ ژ ژییێ زارۆکی دەست پێدکەت و هەتا دگەهتە ژییێ هەشت سالیێ و وێڤە، کو ب درستی دکاریت تێگەهان وەربگریت و تێبگەهیت. ئەو قۆناغ ژی ب کورتی ئەڤەنە (هەر ئەو ژێدەر: ١٧):

ئا- قۆناغا هزرکرنا ڤەجەماندنێ: (ژ یەك هەیڤی ـ هەتا هەیڤا هەشتێ). د ئەڤێ قۆناغێدا مندال تشتان ل دۆر خوە کۆم دکەت و ل دویڤ جۆرێ وان دناسیتەڤە.

ب ـ قۆناغا هزرکرنا ئالۆز: ژ هەشت هەیڤی هەتا یەك سالیێ، مندال دکاریت هندەك تشتێن وەکهەڤ ژێك جودا بکەت، لێ ب وردی جۆر و پێکهاتەیێن وان ناناسیتەڤە.

پ ـ قۆناغا ڤێکئێخستنا کۆمەلەیان: ژ یەك سالی هەتا دوو سالی.

ج ـ قۆناغا زنجیربەندییا گرێیان: ژ دوو سالی هەتا چار سالی. مندال دکاریت تشتان ل سەر بنەمایا خەسلەتەکا دەستنیشانکری پۆلین بکەت، پاشی دێ ئەوێ هێلیت و هزرا وی بۆ سالۆخەتەکا دیکە چیت.

چ ـ قۆناغا گرێیێن بەربەلاڤبوویی: ژ چار سالیێ هەتا شەش سالیێ. شیانێن وی د ڤەجەماندنا تشتان پتر دبن و ب ساناهیتر جۆرێن وان ژێك جودا دکەت، لێ نابیت مەزن ل دویڤ پیڤەرێن خوە کارێن وان راستبکەنەڤە، بۆ نموونە لەوانەیە ئەو چارگۆشە و سێگۆشەیان پێکێڤە کۆم بکەتەڤە، ژ ئەوێ هزرێ بیت کو چارگۆشە ژی ئەگەر ببیتە دوو پارچە، ئەڤە ئەو ژی دێ بنە سێگۆشە.

د ــ قۆناغـا نیمچـە تێگـەهان: ژ شـەش سـالی هـەتا هەشـت سـالیێ. منـدال هەولددەت ڤەجەماندنێن تێگەهان چێ کەت، لێ یێ پشتڕاست نابیت ژ کارێ خـوە، چونکە نزانیت ل سەر چ بنەما ئەو تشت ڤەجەماندینە.

هـ ـ قۆناغا پێکئینانا تێگەهان: ژ هەشت سالیێ و وێڤەتر. د ئـەڤێ قۆناغێـدا پێشکەفتنەکا سروشتییا هەستپێکرنێ ب جۆرێن تشتان چێ دبیت. هەسـت دکـەت کو هەر تشتەکی هەڤپشکییەك د ناڤبەرا خەسلەت و سالۆخەتێن واندا هەنە. ئەو ژ هزرکرنەکا هەستی دەرباز دبیت و دکاریت جـۆرێن تشـتان د مێشـکێ خـوەدا ژێـك ڤاڤێر بکەن و ب درستی فێری تێگەهێن زانستی ژی ببیت.

ل دویڤ بۆچـوونا ڤیگۆتسـکی فێرخـواز د فێربوونـا تێگەهانـدا، پێـدڤی ب یارمەتی یان ژی پشکدارییا کەسێن دیکە دبیـت. شـێوە و جـۆر و چـەوانییا ئـەوێ یارمەتییێ ژی ل دویڤ قۆناغێن ژییێ مندالی جودانە و دکارین سروشتیێ خود یا وی ب ئەڤان پێنگاڤێن خوارێ لێك بدەینەڤە (Longford, 2005: 103-104):

ئا– ساڤا، د ئەڤێ قۆناغێدا، چو جوداوازییێن تایبەتێن وی نینە ژبلی خـود و جەستەیەکێ ساخلەم، کو ب بنجەقا مرۆڤی دهێتە دانین.

ب ـ مندالێ پێشوەخت، وەکو کیانـەکێ جـوداواز خویـا دبیـت، بـێ حەمـدی خوە هندەك تشتان قەبوول بکەت و هندەکێن دیکە ڕەتدکەتەڤە، چـونکە شـیانێن پتر بۆ درستبووینە، وەکو ڕێڤەچوونێ و پشـت ب خـوە بەسـتن د هنـدەك کـارێن سەرەتاییدا و ئاخفتنێ کو ڤیگۆتسکی زۆر بایەخێ پێددەت، چونکە بانـدۆرا وێ ل سەر درستبوونا کەسێتییا مندالی هەیە.

پ ـ قۆناغا بەری قوتابخانەیێ، وەکو خود هێشتا جێگیر نەبوویـە، شـیانێن وی د ناڤبــەرا ئاشـۆپا خـودی و یارییانـدا گۆڕانکـاری پێڤـە دیـارە. ڕێکسـازی و پشتبەستنا وی ب خوە پتر دبیت.

ج ـ ل ژییێ قوتابخانەیێ، دەروونیا هندور و دەرڤەیی دابەش دبـن. شـیانێن دەرڤەیی بۆ کارکرن و گەهاندنا ئارەزوویێن خوە پتر بووینە ژ بەرێ و سەربخوەتر ژی بوویـە. دەروونیـا هنـدور ژی یارمـەتیا گەشـەکرنا وی ددەت، کـو بـەردەوام هەڤبەندی ب دەردۆرا خوەڤە هەبیت.

چ ـ ل سنێلەیێ، کۆنترۆلەکا پتر ل سەر جیهانا دەروونێن خوە یێن هندۆر و دەرڤەیی هەیە. ل ڤێرە ژی (خود) یا وی یا دەرڤەیی شیانێن پتر بۆ کارکرن و گەهاندنا ئارەزوویێن خوە هەنە. سەربخوەیەکا پتر وەردگریت. خود یا هندۆرا وی یارمەتییا گەشەپێدانا کەسایەتییا وی ددەت، کو ژ دەردۆرا خوە نێزیك ببیت. ل ڤێرە یا فەرە سنێلە سەرەدەریێ دگەل ئاریشە و کێشەیێن ئالۆزتر و زەحمەتتر بکەت.

د ئەڤان هەر پێنج خالێن سلالدا، مندالی پێدڤی ب ئالیکارییا کەسێن دیکە هەیە و د قۆناغێن پێشەنگدا پەناییێ ژبۆ ژێدەرێن زانیارییان دبەت، وەکو پەرتووك و گۆڤار و بەرنامەیێن تەلەفزیۆنێ و کۆمپیۆتەر و موبایلێ ...هتد. لەوما مامۆستا و ئەوێن ژ ئەوی مەزنتر پشتەڤان و ئاراستەکەرێن باشن بۆ وی کو تێگەهێن زانستی ب یارمەتییا وان فێرببیت ب تایبەتی ل قۆناغێن قوتابخانەییێدا، داکو دگەل زانیارییێن خوە یێن رۆژانە ببەستیتەڤە (جابر، ١٩٩٩: ١٤٤). ژبۆ کو ئەو فێربوون ژی ب شێوەیەکێ سیستەماتیك بهێتە ئەنجامدان، یا فەرە پشت ب"تیۆرا چاندا جڤاکی ـ پەرەپێدانا ناڤچەیا ناوەندی" یا ڤیگۆتسکی بهێتە بەستن.

ڤیگۆتسکی بایەخ ب زمانی ددا. ب ئالاڤێ ڤەگواستنا شارەزایا جڤاکی بۆ تاکەکەسان دزانی. ئەوی وەسا ددیت، کو ئاخفتن ل جەم زارۆکی بەرەپێشین جڤاکییە پاشی بەرەڤ خودیا وی خرڤە دبیت و پاشی بۆ ئاخفتنا هندوری (هزرکرنێ) دچیت. ئەرکێ گەهاندنا ئەڤی جۆرێ ئاخفتنێ هەر دمینیت و زارۆك دکاریت ب شێوەیەکێ بێدەنگ بکاربهینیت و ئەڤە ژی هزرەکە و د قالبەکێ زمانیدا نەهاتیە بەرجەستەکرن (Vygotsky, 1986: 101). هەروەسا بڕیارا ئەویێ چەندێ ژی دابوو، کو هەلقولانا هزرکرنێ هەڤدەم نییە دگەل پەیدابوونا ئاخفتنێ، چونکە ئەو دوو پرۆسەیێن هەڤتەریب نینە.

تیۆرا ڤیگۆتسکی یا چاندا جڤاکی، ئەڤێ ڕاستیا سلال سەرڕاست دکەت، کو فێربوون پرۆسەیەکا جڤاکی دینامیکییە و تێدا دانوستاندن د ناڤبەرا فێرکار و فێرخوازیدا چێ دبیت و فێرکار جەخت ل سەر بەرچاڤکرنا کارامەیی و شیانان دکەت (شحاتة، ٢٠٠٣: ١٣٧). ب ئەڤی شێوەیی کارلێککرنەکا هەڤپشك د ناڤبەرا خەلکیدا درست دبیت، چ ئەو کارلێککرن هەرەمەکی بیت د هەڤبەندییێن ڕۆژانەدا،

یان ژی سیستماتیك بیت د هۆلێن خوەندنێ و كەنالێن فێركرنا ئەلكترۆنیدا بهێتە ئەنجامدان. سەرەدەریكرنا مرۆڤی دگەل تەكنۆلۆژییا زانیارییان، كارلێككرنەكا جڤاكی د ناڤبەرا خەلكیدا چێ دكەت. ئەو كارلێككرن ب درستی دگەل بنەمایێن تیۆرا بنیاتگەراییا جڤاكیدا هاوتا دبیت. ل سەر ئەڤی بنگەهی، دكارین ئەو كارلێككرنا فێرخوازێ كاربەرێ كۆمپیۆتەر و ئینتەرنێتێ ب ئەڤی شێوەیی خویا بكەین:

١– كارلێككرنا فێرخوازی دگەل خوە و ناڤەرۆكا شاشەیێ كۆمپیۆتەرێ. (بنیاتگەراییا كۆزانیاریێ) یە.

٢– كارلێككرنا فێرخوازی دگەل خەلكێ دیكە. (بنیاتگەراییا جڤاكیێ) یە.

تۆڕا ئینتەرنێتێ ل دویڤ تیۆرا بنیاتگەرایێ (Thoery Constructivism) هاتیە دیزاینكرن. ئەو زانیاریێن ل سەر ئەوێ تۆڕێ هەین، لق و پۆپێن بێ سنۆر لێ دەردچن. خالا گرنگ ل ڤێرە ئەوە، كو تیۆرا ڤیگۆتسكی تیۆرا كۆزانیارییا جڤاكییە لایەنێ دوویێیە ژ تیۆرا بنیاتگەرایێ، ئەوا ئێماژێ ب فێرخوازی دكەت كو كارامەیی و كۆزانیاریێن خوە ب شێنەیی و ب یارمەتییا كەسانێن ژ خوە شارەزاتر بنیات دنێت. جەخت ل سەر گرنگییا كارلێككرنێ دگەل جڤاكێ و كەسانێن دیكە دكەت، چ ئەوانێن د ناڤ هۆلێن خوەندنێدانە، یان د ڤەرێژا فێركرنا ڤەكریدابن. هەر وەسا ئەو كارلێككرنا دگەل فێرخوازێن جڤاكێن دیكە ژبۆ كو، زانیاریێن هەمەجۆر و هەمەڕەنگ بدەستخوە ڤە بینیت. ئەو كارلێككرن ژی د ناڤ جیاكاریێن تۆڕا ئینتەرنێتێدا جێە دگرن (إبراهيم، ٢٠٠٥: ٣٧١).

هەر ل سەر هەڤبەندیێن د ناڤبەرا تاك و جڤاكێدا، ڕا و بۆچوونێن زانایێن بنیاتگەرایێ ل بارەی ئەوێ كارلێككرنا دناڤبەرا تاك و جڤاكێدا هەیە، دكارین بێژین كو، ل دویڤ دوو ئاراستەیێن سەرەكی دچن (Berk, 1994: 29):

١– ئاراستەیا یەكێ: ڕا و بۆچوونێن زانایێن بنیاتگەراییا كۆزانیارینە، ئەوێن ژ تیۆرا پیاجیە وەرگرتین و جەخت ل سەر بنیاتا چالاكییا تاكەكەسی دكەن كو ئەو هەولددەت ژ جیهانێ تێبگەهیت.

٢– ئاراستەیا دوویێ: ڕا و بۆچوونێن زانایێن بنیاتگەراییا چاندا جڤاكینە، ئەوێن ژ تیۆرا ڤیگۆتسكی وەرگرتین و جەخت ل سەر چالاكیێن جڤاكی دكەن، هەروەسا ڤەرێژا جڤاكی و چاندیا كۆزانیاریێ پەسەند دكەن.

جوداوازییەکا بنگەهین د ناڤبەرا هەردوو ئارەستەیاندا هەیە، ئەو ژی ئەوە کو زۆربەی لێکۆلەرێن هەڤچەرخ جەخت ل سەر ئەوێ چەندێ دکەن کو، زارۆك ب خوە د قۆناغا گەشەکرن و وەرارێدا "بنیاتەکە"و ئەو ب خوە ئەڤێ جیهانێ ناس دکە - هندەك جاران ئەوێ ژی، ژێ زێدە دکەین کو چالاکە، هەر چەندە د ئەڤێ زێدەکرنێدا، هندەك زێدەڕۆیی و درێژدادڕی هەیە - لێ وەسا دیارە کو گەلەك جاران بنیاتگەرایی دهێتە پشتگوهخستن. لێ ئەو میراتگرییا هزری، ئەوا پیاجیە بانگەوازی بۆ دکر، ئەو ب خوە میراتگرییەکا بنیاتگەرایییە. ئەو میراتگرییا ڤیگۆتسکی بەحس ژێ دکر یا کارلێککرنێ بوویە. ئەڤە ژی ئەوێ چەندێ دگەهینیت کو ئەو ژی بنیاتگەرایی بوویە (تروادك، ٢٠٠٩: ٩٣). هەرچەندە بۆچوونێن جودا و نەوەکهەڤ بۆ تێگەها بنیاتگەرایێ هەبوون، لێ هەتا نها ژی گەلەکا پەسەند و بەربەلاڤە.

ئەو بنگەهێ ڤیگۆتسکی تیۆرا خوە ل سەر ئاڤاکری و ڕاستەوخوە هەڤبەندی ب چاندا جڤاکی ڤە هەبوویە، ئەوە کو:

١- هۆشیاری د مێشکێدا نییە بەلکو د کریارێن ڕۆژانەدایە. هەر ژ دەستپێکێ ڤە، ئەو بەرهەمهینانەکا جڤاکییە و هەڤبەندی ب مرۆڤی ڤە هەیە.

٢- پەرەسەندنا چاندی ل جەم زارۆکی دوو جاران خویا دبیت، جارا یەکێ ل سەر ئاستێ کۆمەلێ و جارا دوویێ ل سەر ئاستێ تاکەکەسی، ئانکو: یا یەکێ د جڤاکێدا، یا دوویێ ژی ل سەر ئاستێ ئەوی بخوە.

ئەو هەر دوو دۆخێن سلال ژی، دبنە ڕەگەزەکێ سەرەکی کو زارۆك دگەهتێ. دەما زمان ژی دهێتە د ئەڤێ هەڤکێشەیێدا ڕێکسازییا خودی درست دبیت. چونکە پەرەپێدانا زمانی، ل سەرەتایا فێربوونا قوتابیدا، سەرەکیترین بیاڤە کو پێدڤی پێ هەیە، ئەو ژی د قسەکرن و گوهرٖاگرتن و نڤیسین و هزرکرنێدا خوە دبیننەڤە (إبراهیم، ٢٠٠٥: ٢٤٦). ئانکو دگەهتە قۆناغا پێگەهشتنا هزری، ئەو قۆناغ ژی ژ ئەڤان پەیسکان پێکدهێت: ئاگاداربوون، پلانڕێژی، دەستنیشانکرن، هەلسەنگاندن، خوەگونجاندن.

ل دویڤ ئەڤێ بۆچوونا ڤیگۆتسکی، قۆناغا ڕێکسازییا خودی (پێگەهشتنا هزری) دەروازەیەکا دەستخوەشە کو زارۆك تێدا سەرەدەریێ دگەل دەستپێکا

درستیا دەروونـی دکـەت. هەروەسـا بیاڤـەکێ گونجـایی ژی بـۆ درسـتدبیت کـو ل دویـڤ تیـۆرا (بلـۆم)ی ب جـوانی سـەرەدەرییێ دگـەل پرۆسـەیا فێرکرنـا فەرمیـدا بکەت.

ب کورتی دکارین بێژین، کو فێربوون ل جـەم ڤیگۆتسـکی ل دویـڤ بنـەمایا تیـۆرا بنیاتگـەرایا مەعریفییـە و پرۆسـەیەکا جڤـاکی دینامیکییـە و د ئـەنجامێ دانوستاندنەکا د ناڤبەرا فێرکار و فێرخوازیدا چێ دبیـت. فێرکـار تێـدا کارامـەیی و شیانێن خوە بەرچاڤ دکەت. ئەو شیان ژی ب ڕێیـا بکارهینانـا شـێوازێن نـوی یـێن تەکنۆلۆژییێ چێبووینە و گەشەکرییە. هەر ب ڕێیا ئەوان شێوازان ژی، ئەم دکـارین ل سەر ژینگەهێ زال بین. چەند ئەو شـێواز پـێش بکـەڤن، شـیانێن مـەعریفی یـێن فێرخوازان ژی پتر گەشە دکەن.

### ٣- پشکا duوییێ: پێنگاڤێن دانانا تێگەهێن زانستی د پلانا وانەگۆتنێدا:

ل دویڤ ئەوێ پێداچوونەڤەیا ژ ئالییێ ڤەکۆلەری ڤە بۆ کتێبا زمان و ئەدەبێ کوردی یا پۆلا نەهێ یا قۆناغا بنەڕەتی هاتیەکرن، دەرکەفت کو د بەشا ئەدەبیدا، ب یەکجاری بایـەخ ب هەڤبەنـدییا د ناڤبـەرا زاراوەیـێن زانسـتی و تێگـەهێن وانـدا نەهاتیـەدان، تنـێ زاراوە هاتینـە دەستنیشـانکرن و تێگـەهێن وان یـێن زانسـتی شرۆڤە نەکرینە و نەخشە ژی ژێ ڕا نەهاتینە ڕێکخستن هەروەکو د یەکـەم بابەتـدا (ئەدەب و بەش و ڕەگەز و جۆرێن وی) (لێژنەیەك، ٢٠١٨: ١٠٦-١١١) جهگرتییـە، لـەوما ژبۆ بکارهینانا تێگەهێن زانستی د وانەگۆتنا هەر بابەتەکێ ئەدەبیدا، پێویسـتی ب سێ قۆناغان هەیە:

١- قۆناغا نەهێلانا ئەوان ئاستەنگێن د ڕێیا بکارنەهاتنا تێگەهێن زانسـتی د کتێبا پرۆگرامێ خوەندنێدا.

٢- قۆناغا دانانا پلانا بابەتێ وانەگۆتنێ، کو نەخشەیێن تێگەهێن زانستی ب خوە ڤە بگریت.

٣- قۆناغا پێنگاڤێن پێشکێشکرنا ئەوێ وانەیا هاتیە ئامادەکرن.

**٣-١ قۆناغا نەهێلانا ئاستەنگان**

د ئەڤێ قۆناغێدا، جەخت ل سەر نەهێلانا ئەوان ئاستەنگان هاتەكرن، ئەوێن بووینە رێگر، كو تێگەهێن زانستی نەكەڤنە د نێڤ بابەتێن بەشا ئەدەبی یا كتێبا زمان و ئەدەبێ كوردیدا، ئەو ژی ل دویڤ ئەڤان سێ پێنگاڤان دبیت:

٣-١-١   د دانانا پرۆگرامێن خوەندنێدا، پاشخانا ئاستێ زانستیێ قوتابیان لبەرچاڤ نەهاتیە وەرگرتن. ئەڤە ژ لایەكی ڤە، ژ لایەكێ دیكەڤە، زمانێ دارشتنا تێگەهێن زانستی ژی دبیتە كێشە بۆ قوتابیان، ب تایبەتی ئەگەر جیاوازی نەهاتبیتەكرن د ناڤبەرا تێگەهێن رۆژانەیێن قوتابیان، كو ل دەرڤەی قوتابخانەیێ بهیستینە و ئەوێن ب شێوەیەكێ زانستی د سیستەمێ خوەندنێدا فێردبن. یان ژی دەما گەلەك ژ پەیڤێن شێوەزارێ زمانێ دایكێ دگەل ئەوی زمانێ پرۆگرامێن خوەندنێ پێ هاتینە دارشتن جیاواز بن. ل ڤێرە پێویستە ب رێیا بكارهینانا نەخشەیێن تێگەهان ڤە ئەو كێماسی بهێنە سەرراستكرن.

٣-١-٢   ئاستێ زانستیێ مامۆستای و لێهاتییا وی یا كردارییا ئەكادیمی و پیشەیی یەك ژ خەسلەتێن رێڤەبرنا پولێیە، چونكە ئەو لایەنێن مامۆستا سەرەدەریێ دگەلدا دكەت یەكجار زۆرن. ل هەرێمێ بایەخ ب ئەڤی پیڤەرێ مامۆستای دایە، كو ژ ئالیێ ئامادەكرنێ ڤە هەموو دەرچوویێن كۆلیژێن پەروەردەیی بن، لێ هەتا نها رێژەیا ئەوێن هەلگرێن باوەرنامەیێن ژێر بەكالۆریۆسێ نە ل دویڤ ئامارا وەزارەتا پەروەردەیێ بۆ سالا خوەندنێ (٢٠١٧-٢٠١٨) دگەهتە (٦٩٤٤٧) مامۆستایان ژ كۆی گشتیێ (١٢٧٥٦٠) مامۆستایان. ئەڤە ژی هەژمارەكا مەزنە كو رێژەیا وان دگەهتە (٥٤،٤٪) (وەزارەت، ٢٠١٨: ١٠٢) و زۆربەی ژ ئەوان ژ ئالیێ ئەكادیمی ڤە ب درستی نەهاتینە ئامادەكرن. كارەكێ ئاسان نییە، مامۆستایێ ئاست لاواز بكاریت بایەخێ ب هۆیێن فێركرنێ بدەت و جەختێ ل سەر تێگەهێن زانستی بكەت و جهێ وان د شێوازێ وانەگۆتنەكا كارادا بكەتەڤە.

٣-١-٣   هندەك جاران قوتابی ژی دبیتە كێشە، ب تایبەتی دەما وەكو وەرگر خوە دبینتەڤە و پشت ب ئەزبەركرنێ دبەستیت. ئەڤە ژی دبیتە رێگر ژبۆ تێگەهشتنا بابەتی و تەنانەت ژ بەشداربوونا وی د گفتوگۆیێن نێڤ پولێدا و ب تەواوەتی ژ بیاڤێن لێكدانەڤەیا هزران و هزركرنا رەخنەئامێز دویر دكەڤیت. ئەڤ

دیاردەیە پتر د شێوازێ ڕێڤەبرنا پۆلێ یا خوە سەپێنەردا تەشەنە دكەت. د ئـەڤێ جۆرا ڕێڤەبرنێدا، ڕا و بۆچوونێن قوتـابی دهێنـە فەرامۆشـكرن و ب كارەكتـەرەكێ گوهدێرێ شیرەت وەرگر دهێتەدانین.

ژبـۆ چارەسـەركرنا ئـەڤان كێشـەیێن سـلال، ب پێویسـت دهێتـە زانـین، كـو پرۆگرامێن خوەندنێ ژ ژینگەها قوتابی نێزیك بن، و مامۆستا ب شێوەیەكێ وەسـا بهێتە ئامادەكرن كو شـێوازێ دیمـوكراتییێ د ڕێڤـەبرنا پۆلێـدا بهەلبـژێریت و جهـێ ستراتیژییێن نەخشەكارییا تێگەهێن زانستی د پلانـێن وانـەگۆتنا خـوەدا بكەتەڤـە. چونكە ب ڕێیا فێركرنا تێگەهێن زانستی و پێشكێشكرنا میناكێن وان ڤە، پرۆسەیا فێربوونێ ل نك قوتابی ساناهیتر دبیت، ب تایبەتی كو بایەخ ب شارەزاییێن وی یێن بەرێ بهێتەدان، ژبۆ كو تێگەهێن نوی ل سەر وان بهێنـە ڕێكخسـتن (عبدالفتاح، ١٩٩٧: ٤٢). ئـەڤ بۆچـوونا سـلال پشـت ب "تیـۆرا چـاندا جڤـاكی ــ پەرەپێـدانا ناڤچـەیا ناوەندی" یا ڤیگۆتسكی دبەستیت و تێگەهێن زانسـتی ژی ل دویـڤ ناڤـەرۆكا وێ دهێنـە ڕێكخسـتن، كـو ل سـەر بنگـەهێ زانیـارییێن پێشـترێ یـێن قوتـابی هاتینـە دارشتن (مازن، ٢٠٠٩: ٢٤٣). ئەڤە ژی ل سەر دوو ئاستان دهێتە ئەنجامدان:

– ئاستێ یەكێ، ئەو زانیـارییێن قوتـابی پـێش قۆناغـا قوتابخانـەیێ هەنـە و بەردەوام ژ جڤاكا خوە وەردگریت.

– ئاسـتێ دوویـێ ژی، ئـەو زانیـارییێن ژ كەلەكـەبوونا بابـەتێن پرۆگـرامێن خوەندنێ فێردبیت و ل دویڤ پلەبەندییا قۆناغێن قوتابخانەیێ وەردگریت.

ل پەی ئـەڤان هـەردوو ئاسـتان، ئـەو پرۆگرامـێ ل سـەر بنگـەهێ تێگـەهێن زانستی دهێنە دانین، كو ب ژینگەهـ و هەموو ڕەوشێن وەلاتی ڤە گرێدای بیـت، دێ قوتابی ژی د ژینا خوە یا ڕۆژانە و داهاتیدا مفای ژێ وەرگریت.

ل دویڤ ڕێبازا ئەڤێ ڤەكۆلینێ، كو جەخت ل سەر كارابوونـا نەخشـەكارییێن تێگەهێن زانستی دكەت، دێ هەولدەین پلانا وانەگۆتنەكا نموونەیی دابرێژین، كو د پێناسەكرنا زاراوەیێن بابەتیدا، پشت ب پێگەهێ تێگەهێن زانستی بهێتە بەسـتن و ل دویڤ دیزاینا نەخشـەكارییێن وانـدا، هەڤبەنـدییێن سـەرەكی و لاوەكـی د ناڤبـەرا ئەواندا بهێنە ڕۆنڤەكرن. پاشی ئەو پلانا نموونەیی ژبۆ هـەموو بابـەتێن دیكـە یـێن پرۆگرامێن ئەدەبی بكێـر بهێـت و ب ئاسـانی بهێتـە پراكتیزەكـرن. خـالا جیـاواز د

ناڤبەرا ئەواندا ئەوە، کو د هەر یەك ژ ئەوان وانەیاندا، نەخشەکارییەکا تایبەت ب ئەوی بابەتی ڤە دهێتە رێکخستن.

**٣-٢ قۆناغا دانانا پلانا بابەتێ وانەگۆتنێ:**

٣-٢-١ پێناسەیا تێگەها زانستی: ژبۆ پێناسەکرنا تێگەهێن زانستی، ژ دەستپێکی یا فەرە، جۆرێن ئەوان تشتان یان نیشانەیان یان رویدانان کو ئەوێ تێگەهێ پێکدهینن بهێنە دەستنیشانکرن. پاشی پرۆسەیا پێناسینێ د ئەڤان سێ پێنگاڤاندا بهێتە شرۆڤەکرن (وتسون، ١٩٩٣: ٢٩)، ژبۆ ئەڤی بابەتێ دەستنیشانکری ژی دێ ب ئەڤی شێوەیی بیت:

ئا ـ ناڤێ تێگەها سەرەکی زاراوەیەکە یان ژی جەڤەنگەکە، کو زانا ل سەری رێککەفتینە و رامانا وێ یا زارەکی گوزارشێ ژ هەموو سالۆخ و خەسلەتێن وێ دکەت (زیتون، ١٩٨٦: ٨٧). ل سەر ئەڤی بنەمای، ئەدەب تێگەهەکا سەرەکییە، هۆنراوە و پەخشان دوو تێگەهێن گشتینە، هەر چار رەگەز ژی کو (هەست، بیر، ئەندێشە، واتا)نە لقە تێگەهن.

ب ـ ئەو هەر سێ تێگەهـ (سەرەکی، گشتی، لقە تێگەهـ) پێکڤە گرێداینە و خەسلەت و جیاکارییێن وان ب رێیا هەڤبەندیێن (لاوەکی، توندوتول، هەڤئانگ)یێ ڤە دهێنە دەستنیشانکرن و هەر تێگەهەکێ هەندێك خەسلەتێن بنەرەتی هەنە (حسین، ٢٠١١: ٣٤).

پ ـ پێناسەیەکا کورتا تێگەها (ئەدەب)ی بهێتە نڤیسین، کو (ئەو ئاخافتن و گوتراوە نایابانەن، کە خۆشی و شادی دەخەنە دڵی گوهدار و خوێنەرانەوە) (لێژنەیەك، ٢٠١٨: ١٠٦).

**٣-٢-٢ ئامادەکرنا نەخشەیا تێگەها زانستی:**

یەکەم پێنگاڤا مامۆستا پێ هەلدستێت بۆ ئامادەکرنا نەخشەکارییەکا زانستی دکەت، چ ب دەستی بکێشیت یان ژی ب کۆمپیۆتەرێ دیزاین بکەت، بەرەپێشین ب وردی پێکهاتەیێن وێ لێکبدەتەڤە و خەسلەتێن هەڤپشکێن د ناڤبەرا واندا و هەڤبەندیێن وان دەستنیشان بکەت. ئەو لایەنێن هەڤبەندی ب رێکخستن و پۆلینکرن و رێزبەندییا تێگەهان ڤە هەیە رایی بکەت. د ئەڤێ

راییكرنێدا هەموو جومگە و بیاڤێن بابەتی دێ هێنە هەڤبەركرن، ژبۆ كو ب رێیا ئەوان تێگەهان ڤە پێگەهێ هەر سێ پرۆسەیێن (هزركرن) و (دەربرین) و (خوەگونجاندن)ێ د پلانا وانەیێدا بهێنە دیاركرن. ل پەی ئەڤێ بۆچوونا سلال، سێ خالێن گرنگ هەنە و دەبیت د پلانا وانەگۆتنێ و رێڤەبرنا پۆلێدا لبەر چاڤ بهێنە وەرگرتن، ژبەر كو:

ئا ـ هزركرن دێ بیتە بەشەك ژ وانەگۆتنێ و د ئەنجاما ئەوان بۆچوونێن د مێشكێ خوەدا لێكدەتەڤە، دێ ژ كەسەكێ وەرگر بیتە كەسەكێ چالاك و تەڤلی ناڤەرۆكا بابەتی بیتەڤە. ئەو تەڤلیبوون ژی كارەكێ رێژەییە، ژ قوتابیەكی بۆ قوتابیەكێ دی جیاوازی هەیە، لێ ئاستێ هەری بلند ئەوە دەما قوتابی هزرەكا نوی، ئەنجامەكا نوی، پێشنیازەكا نوی ژبۆ بابەتی زێدەدكەت.

ب ـ دەربرین ب هەردوو شێوەیێن خوە یێن نڤیسكی و زارەكی ڤە، پرۆسەیەكا دوو لایەنەیە و تێدا دیاردبیت، كو قوتابی دكاریت ئەو بۆچوونا خوە یا د مێشكیدا درڤریت بگەهینتە ئەوێن بەرانبەر. راگرتنا هەڤسەنگییا ئەڤان هەردوو لایەنان، پیڤەرەكێ گرنگە ژبۆ زانینا گەشەكرنا شیانێن وی یێن دەروونی و ژیری و زمانەڤانی و چەوانییا هەڤبەندیێن وی دگەل دەوروبەردا.

پ ـ قوتابی ب رێیا دابەشكرنا تێگەهێن زانستی ڤە، كو بۆ بەشێن بچویكتر دهێنە پۆلینكرن، فێری شرۆڤەكرن و خوەگونجاندنێ دبیت (مازن، ٢٠٠٩: ٢٤٢). ئەو خوەگونجاندن ژی رێیێ لبەر خوەش دكەت، كو زانیارییێن خوە راست بكەتەڤە و ژێ زێدە بكەت. ئەڤە ژی پەرەپێدانا توانایێن وی خورتتر دكەت، داكو ب كەلەكەبوونا زانیارییان ئاستێ خوە یێ هزری پێشڤە ببەت و ب ساناهی دگەل دەردۆرا خوە یا جڤاكی و چاندی بگونجیت و د پرۆسەیەكا كارلێككرنا مەعریفییا بەردەوامدا بژیت.

پشتی مامۆستا ئەڤان هەر سێ خالێن ژۆری ل بەرچاڤ وەردگریت، باشتر ئەوە كو ئەڤێ پلانا ئامادەكری، وەكو رەشنووسەكێ تاقی بكەتەڤە، ژبۆ كو خالێن لاوازێن وێ بزانیت و چارەسەر بكەت. پاشی هەول بدەت رەشنڤیسا ئەوێ نەخشەكارییا هاتیە پەسەندكرن ب ئەڤی شێوەیی رێك بێخیت:




وێنەیێ هەژمار (٤)

**٣-٢-٣ دەستنیشانکرنا هەڤبەندیێن د ناڤبەرا تێگەهێن رۆژانە و تێگەهێن زانستیدا**

د پرۆسەیا فێربوونا قوتابیدا، هەر یەك ژ تێگەهێن رۆژانە و تێگەهێن زانستی رۆلێ خوە هەیە. کێم جاران هەڤبەندی د ناڤبەرا واندا چێدبیت. چونکە چەندین خال هەنە ئەوان ژێك جودا دکەن و ئەوێن سەرەکی ئەڤەنە:

ئا- تێگەهێن رۆژانە ژ نشکەکێ ڤە چێدبن، لێ تێگەهێن زانستی ب شێوەیەکی بەرنامەرێژی و ل دویڤ پرۆسەیێن ژیری دهێنە بنیاتکرن.

ب ـ تێگەهێن رۆژانە د ئەنجاما تەڤلیهەڤبوون و ئەوان زانیارییێن ل دەرڤەی قوتابخانەیێ دهێنە وەرگرتن چێدبن، لێ تێگەهێن زانستی ل قوتابخانەیێ یان ژی ل هەر ناوەندەکا دیکەیا زانستیدا دهێنەدان.

پ ـ هندەك جاران تێگەهێن زانستی ل سەر بنگەهێ زانیارییێن رۆژانەیێن قوتابی چێدبن، لێ بەروڤاژی ئەوێ چەندێ درست نییە.

ج ـ تێگەهێن رۆژانە سیمایەکێ پەرت و بەربەلاڤیێ پێڤە دیارە، لەوما قوتابی ژی هەولددەت زانیارییێن خوە یێن رۆژانە بۆ سیستەمەکێ هەڤگرتیێ تێگەهێن زانستی ڤەبگوازیتەڤە.

چ ـ تێگەهێن ڕۆژانە ژ تشتێن هەستپێكری ڤە بۆ تشتێن ڕووت گەشە دكەن، لێ تێگەهێن زانستی ژ تشتێن ڕووت بەرەڤ تشتێن هەستپێكری دهێنە ئاراستەكرن. لێ ئەو هەردوو ئاراستەكرن ژبۆ تێگەهشتنێ دپێدڤینە.

ژبۆ ژێك نێزیكرنا تێگەهێن زانستی ژ تێگەهێن ڕۆژانە، ڤیكۆتسكی سێ ئاراستە دەستنیشان كرینە دكارین د ئەڤان خالاندا كورت بكەینەڤە (الدواهيدي، ٢٠٠٦: ٣٨):

١– هەڤبەدییەكا توند د ناڤبەرا تێگەها مەبەستدار و لێزانیا ڕۆژانەدا هەیە. لەوما تێگەها مەبەستدار پێش تێگەها ڕۆژانە دهێتە خوەندن، ئەوێ باندۆرەكا مەزن ل سەر وەرگرتنا تێگەهێن زانستی دبیت.

٢– تێگەهێن مەبەستدار د پلەیەكا كێمتردا ڕۆژانە بكاردهێن. ل ڤێرە وەكو سەرەتایەك بۆ تێگەهشتنێ مامۆستا هەولددەت تێگەهێن ڕۆژانە هەلبژێریت نەك تێگەهێن مەبەستدار.

٣– هیچ هەڤبەدی د ناڤبەرا تێگەهێن مەبەستدار و تێگەهێن ڕۆژانەدا نییە. مامۆستا هەولددەت هندەك ئامراز و پالپشتان بكاربهینیت، ژبۆ كو د حالەتێ نەبوونا تێگەهێن ڕۆژانەدا تێگەهێن زانستی بهێنە چەسپاندن.

ژبەر ئەڤان خالێن جوداكەرێن سلال و ئەو ئاراستەیێن ڤیگۆتسكی دەستنیشان كرین، مامۆستا دەبیت ل سەر هەردوو ئاراستەیان كار بكەت. ژ تشتێن هەستپێكری ڤە بۆ تشتێن ڕووت و بەروڤاژیا وان ژی پێڕەوبكەت.

**٣–٣  قۆناغا پێشكێشكرنا وانەیێ:**

پشتی نەخشەكاریا تێگەهێن زانستی هاتییە ئامادەكرن و پێداچوونەڤەیەكا ورد ژی بۆ هاتیە هەلسەنگاندن و دگەل تێگەهێن ڕۆژانەیێن قوتابی ژیدا هاتییە هەڤبەركرن. مامۆستا دگەهتە ئەوی ئەنجامی، كو ئەو نەخشەكاری لایەنەكێ سەرەكییە ژبۆ ڕۆنڤەكرنا بابەتێ وی. ل دویڤ پێگەها وێ نەخشەكاریێ ڤەرێژا وانەگۆتنێ ژی دهێتە ڕێكخستن و ب بستەهی ڤە دێ د پۆلێدا پراكتیزە كەت. ل نێڤ پۆلێدا هەول بدەت ئەوێ نەخشەكاریێ پێنگاڤ ل دویڤ پێنگاڤێ پێشكێش بكەت:

– د پێنگاڤا یەکێ دا، قوتابی ژی د دەستنیشانکرنا خەسلەتێن وێ دا بەشدار بن و هەڤبەندیێن وێ ژی د گەل ئەوێن پێشترێ هەبووین لێك بدەنەڤە. ئەگەر ب شێوەیێ پرسیارکرنێ بهێتە دەستپێکرن، دێ پتر سەرنجا قوتابیان راکێشیت، ب تایبەتی، کو پرسیار ببیتە ناڤەرۆکا یەکەم وانەیا وەرزێ یەکێ یێ ئیسال د گەل بابەتێن ئەدەبی یێن پۆلا هەشتی:

– پار مە چەندین ئەدیب و نڤیسکارێن کورد خوەندبوون، کێ ناڤەك ژبیرە؟

– موفتی پێنجوینی.

– موفتی پێنجوینی چ دنڤیسی؟

– هۆنراوە.

– ئەدیبەکێ دیکە؟

– مارف بەرزنجی.

– مارف بەرزنجی چ دنڤیسی؟

– چیرۆك.

– چیێ دیکە دنڤیسی؟

– گۆتار.

– ئەڤان هەموو جۆرێن نڤیسینێ چ دبێژنێ؟

– ئەدەب.

– ئەدەب ب چەند شێوەیان دهێتە نڤیسین؟

– ٣!   ٤! ٢!.

– راستە ب دوو شێوەیان دهێتە نڤیسین، ئەو هەردوو شێوە چنە؟

– هۆنراوە و پەخشان.

پشتی ئەڤێ گفتوگۆییێ، مامۆستا دێ ل دویڤ پلانا وانەگۆتنێ ب کورتی پێناسەیا (ئەدەب)ی کەت و بەشێن وی ژی شرۆڤەکەت. دەما ئەو ناڤەرۆك زەلال بوو، دێ دەست ب چێکرنا نەخشەیا تێگەهێ ئەدەبی کەت و ب ئەڤی شێوەیێ خوارێ:



وێنەیێ هەژمار (٥)

ژبەر کو ئەو نەخشـەیە ئاسـان و زەلال بـوو و دەمـێ دەستنیشـانکری ژی کێم بوو، مامۆستای ڕێیا شرۆڤەکرنێ بکارهینا، کو ژ هەموویێ بەرەڤ بەشی چـوو. قوتابیـان ژی وەکـو گـرووپێن بچـووك هەولـدا ئـەوێ نەخشـەکارییێ د نـێڤ پۆلێـدا بکێشن.

ژبۆ ڕۆنڤەکرنا ئەنجامدانا نەخشەکارییا بابـەتێ ڕەگـەزێن ئـەدەبی ژی، کـو هندەك زەحمەتترە و پێکهاتەیێن وێ ژی ئـالۆزترن. ئەڤـە مامۆسـتا دکاریـت ڕێیـا لێکدانەڤەیێ بکاربهینیت، کو ژ بەشی بەرەڤ هـەموویێ بچـیت و نموونـەیان ژی بـۆ هــەر پێنگاڤــەکێ بهینیــت و نەخشــەی ل ســەر تەختــەی چــێکەت، یــان ژی ب فۆتۆشۆپی پێشانی قوتابیان بدەت، کو دێ ب ئەڤی شێوەیی بیت:




وێنەی هەژمار (٦)

پاشى مامۆستا ئەوان هەردوو نەخشەيان كو تەواوكەرێن هەڤن، دێ كەتە ئەركێ مالێ و دەبيت قوتابى خوە ل سەر ڕابهينن و ب درستى چێكەن.

د هەردوو حالەتێن سلالدا، ئەو ڕێيا پتر ژبۆ ئەڤێ مەبەستێ دهێتە پەسەندكرن، ئەوە كو مامۆستا ئەڤان سێ ستراتيژييان پێڕەو بكەت (عفانة، ١٩٩٩: ٤١):

١- ئەو نەخشەكارييا تێگەهێن زانستييا هاتييە ئامادەكرن، وەكو ڕێكخەرەكا پێشين (Advanced Organizer) دهێتە بەرچاڤكرن، ژبۆ كو فێرخوازى ژ گشتگيرييێن وانەيا پێشتر بۆ وانەيا نها ڤەگواستەڤە و ب ناڤەرۆكا بابەتێ وێ ڤە ببەستيتەڤە، تاكو فێربوونەكا ڕامانبەخش بدەستڤە بهێت و دگەل ئەوان تێگەهێن بچووك يان ئەو لقێن د نەخشەكارييا تێگەهێدا هەنە بهێنە ڕۆنڤەكرن و ئەو هەڤبەندييێن د ناڤبەرا واندا هەنە بهێنە ڕاڤەكرن.

٢- ئەو نەخشەكارييێن پێشوەختە هاتينە ئامادەكرن ل داوييا وانەيێ وەك ڕێكخەرەكا پاشين (Late Organizer) دێ هێنەدان، ژبۆ كو فێرخواز ژ ئەوان گشتگيرييێن د وانەيا نويدا فێربووى ب ناڤەرۆكا بابەتێ داهاتى ڤە گرێ بدەت، ئەو ژى ژپێناڤا فێربوونەكا واتادار دگەل ڕۆنڤەكرن و ڕاڤەكرنەكا پێشوەختە يا ناڤەرۆكێن پێكهاتەيا بابەتى بەرى كو نەخشەكارييا تێگەهێ ب شێوەيەكێ گشتگيرى بهێتە پێشكێشكرن.

٣- مامۆستا دێ برگەهێن بنگەهين يێن وانەيێ ڕۆنڤەكەت و ڕاڤەكەت، پاشى قوتابيێن وى، چ وەكو تاك يان ژى گرووپ، دێ نەخشەكارييێن تێگەهێن هەڤبەندى ب بابەتێ وانەيێ ڤە هەيە درستكەن. ژبۆ كو مامۆستا كارێ درستكرنا نەخشەكارييێن تێگەهان بۆ قوتابيان ئاسان بكەت دێ هندەك تێگەهێن بنگەهين دەتە وان، پاشى دێ قوتابى نەخشەكارييان درستكەن ب ئەوى شێوەيى كو ئەو تێگەه و هەڤبەندييێن د ناڤبەرا وان هەنە ب خوە ڤە بگرن.

ب ئەڤى شێوەيى دوو پرۆسە دهێنە ئەنجامدان: پرۆسەيا فێركرنا تێگەهان ژ ئاليێ مامۆستاى ڤە د وانەگۆتنێدا دهێتە ڕێكخستن. د هەمان دەم ژيدا پرۆسەيا فێربوونا تێگەهان ژ ئاليێ قوتابى ڤە دهێتە وەرگرتن. دەما هەردوو پرۆسەيێن فێركرن و فێربوونێ د وانەگۆتنێدا هەڤسەنگ دبن مەبەستا سەرەكييا پيداگۆگيێ ژى بدەستڤە دهێت.

**ئەنجام:**

١- تێگـەهێن زانسـتی پێكهاتـەيێن تۆكمـەيێن زاراوەيـێن زانسـتينە، هـەر زاراوەيەكا زانستی ژی د سنۆرێ بسپۆرييا خوەدا يەك ڕامان هەيە و تايبەتمەندييێن خوە ژ ڕێكخستنا تێگەها خوە وەردگريت.

٢- ل دويـڤ تيـۆرا ڤيگۆتسـكی، فێركرنـا تێگـەهێن زانسـتی د پرۆگـرامێن خوەندنێدا ب شارەزايی و زانيارييێن قوتابی ڤە دهێنە بەستن. لێ پێكهاتـەيێن هـەر تێگەهەكێ  تەنها ب ڕامانا وێ يا زارەكی ڤە ناهێتە دەستنيشانكرن، بەلكو ل سەر بنگەهەكێ نەخشـەكاريەكا ڕۆنڤـەكرنێ دهێتـە پـۆلينكرن، كـو ئامـاژەيێ ب ئـەوان پێوەندييێن لاوەكی و هەڤئاهەنگی و توندوتولييا د ناڤبەرا تێگەهێن پێكڤەگرێداييدا بكەت.

٣- ئەو هۆكارێن سەرەكی يێن نـاهێلن قوتـابی ب شـێوەيەكێ درسـت فێـری تێگەهێن زانسـتی بـبن دزڤڕنەڤـە بـۆ ئـەوێ چـەندێ كـو شـارەزاييا وان يـا پـێش قوتابخانەيێ دگەل ناڤەرۆكا پرۆگرامێن خوەندنێدا ناگونجێت. ئەو كەلێن فـرەوانتر دبيت دەما تێگەهێن زانستی د ئەوان پرۆگراماندا ل دويڤ شـێوازێ وانەگۆتنەڤـەيا مۆدێرن نەهاتبنە دانين و مامۆستا ژی ل سەر نەهاتبنە ڕاهينان.

٤- د ستراتيژيەتا وانەگۆتنا كارادا، فێركرنا تێگەهێن زانستی پێگەهێ خـوە هەيە و ژ دوو ئاليان ڤە مفا يا خوە هەيە، يا يەكێ ڕێكێ خوەش دكەت كو قوتابی ب چالاكی بەشدارييێ د گفتوگۆيێن ناڤ پۆلێدا بكەت. يا دوويـێ ژی ئـەوە، كـو ئـەو ئەنجامێن بدەستڤە دهێن دێ بنە بنەما بۆ ڕاستڤەكرن و دەولەمەندكرنا بـەردەواما پرۆگرامێن خوەندنێ.

## ژێدەر:

**ب زمانێ کوردی:**

١- شەریف، د. عەبدولسەتار تاهیر (١٩٨٥)، قامووسی دەروونناسی/ ئینگلیزی ـ عەرەبی ـ کوردی، چاپخانەی عەلاء، بەغدا.

٢- لێژنەیەك لە وەزارەتی پەروەردە (٢٠١٨)، زمان و ئەدەبی کوردی - پۆلی نۆیەمی بنەڕەتی، چ١٢، چاپخانە و ئوفسێتی (CEM)، ب. ش.

٣- وەزارەتی پەروەردە، بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی پلاندانانی پەروەردەیی، راپۆرتی ساڵانەی ئاماری پەروەردەیی ساڵی خوێندنی ٢٠١٧ـ٢٠١٨، هەولێر.

**ب زمانێ عەرەبی:**

٤- إبراهيم، مجدي عزيز (٢٠٠٥)، المنهج التربوي وتعليم التفكير، عالم الكتب، القاهرة.

٥- ترواِدك، برتران (٢٠٠٩)، علم النفس الثقافي، ت: حكمت خوری و جوزف بو رزق، دار الفارابي و مؤسسة محمد بن راشد آل مكتوم، بيروت.

٦- جابر، جابر عبدالحميد (١٩٩٩)، استراتيجيات التدريس والتعليم، دار الفكر العربي، القاهرة.

٧- الحجازي، مدحت عبدالرزاق (٢٠١٢)، معجم مصطلحات علم النفس، دار الكتب العلمية، بيروت.

٨- حسين، ثائر (٢٠١١)، الشامل في مهارات التفكير، ديبونو للطباعة والنشر والتوزيع، عمان.

٩- زيتون، عايش محمود (١٩٨٦)، طبيعة العلم وبنيته وتطبيقاته في التربية العلمية، عمان.

١٠- زيتون، حسن وكمال عبدالحميد زيتون ( ٢٠٠٣)، التعلم والتدريس من منظور النظرية البنائية، عالم الكتب، القاهرة.

١١- شحاتة، حسن و زينب النجار (٢٠٠٣)، معجم المصطلحات التربوية والنفسية، الدار المصرية اللبنانية، القاهرة.

١٢- عبدالفتاح، عزة خليل (١٩٩٧): تنمية المفاهيم العلمية والرياضية للأطفال، دار قباء، القاهرة.

١٣- عبدالنور، جبور (١٩٧٩)، المعجم الأدبي، دار العلم للملايين، بيروت.

١٤- حسام، محمد مازن (٢٠٠٩)، تكنولوجيا مصادر التعلم (المحلية ـ العالمية)، دار الفجر للنشر التوزيع، القاهرة.

١٥- النجدي، احمد و منى عبدالهادي و علي راشد (٢٠٠٣)، تدريس العلوم في العلم المعاصر ـ طرق وأساليب و استراتيجيات حديثة في تدريس العلوم، دار الفكر العربي، القاهرة.

١٦-وتسون، ميريل (١٩٩٣)، تدريس المفاهيم ـ نموذج تصميم تعليمي، ت: محمد حمد عقيل الطيطي، دار الأمل، أربد.

١٧-ويليك، رينيه (١٩٨٧)، مفاهيم نقدية، ت: د. محمد عصفور، المجلس الوطني للثقافة والفنون والآداب، الكويت.

**ب زمانێ ئینگلیزی:**

18- Burden, R & William, N. (1998), Thinking the Through the Curriculum, Fight Published, London.

19- Berk, Laura E. (1994), Child Development, Ed.3, Allen & Bacom, USA.

20- Vygotsky, L. S. (1930), Mind and Society, Transcribed: by Andy Blunden and Nate Schmolze, Published by: Harvard University Press.

21- Vygotsky, L. S. (1979), Mind in Society – The Development of Higher Psychological Processes, Ed. Michael Cole…., 2ed, Harvard University Press.

22- Vygotsky, Lev. (1986), Thought and Language, trans: Alex Kozulin, The MIT Press Cambrighe, London.

23- Langford, Peter E. (2005), Vygotsky's Developmental and Educational, Psychology Press, Newyork.

24- Hormby, A S (2006), Oxford Advanced Learner's Dictionary, 7th ed, Oxford University Press. London.

**نامەیێن زانكۆیی:**

٢٥- الدواهيدي، عزمي (٢٠٠٦)، فعالية التدريس وفقا لنظرية فيجوتسكي في اكتساب بعض المفاهيم البيئية لدى طالبات جامعة الأقصى، رسالة ماجستير غير منشورة، كلية التربية ـ الجامعة الإسلامية، غزة.

**گۆڤار:**

٢٦- بغورة، الزواوى (٢٠٠٧)، مفهوم اللغة في الفلسفة الكانطية الجديدة، مجلة اللغة العربية ـ العدد السابع، يونيو ٢٠٠٧، جامعة الكويت، ص٥١-٨٤.

٢٧- عفانة، عزو اسماعيل (١٩٩٩)، أثر استخدام ثلاث لمخططات المفاهيم في تعليم الرياضيات على تحصيل

طلاب الصف الثامن واتجاهاتهم نحو كل من الرياضيات الاستراتيجية المستخدمة، مجلة دراسات في المناهج وطرق التدريس، جامعة عين شمس، العدد الحادي والستون.

## ملخص البحث

### تأثير استخدام مخططات المفاهيم العلمية
### في طرائق تدريس الأدب الكوردي

**ا.م.د. احمد محمد قرني**
وزارة التربية – ديوان

يتناول البحث المعنون بـ (تأثير استخدام مخططات المفاهيم العلمية في طرائق تدريس الأدب الكوردي) أسس ومنطلقات المفاهيم العلمية التي يتبعها المعلم كوسيلة إيضاح أثناء إعداد خطة الدروس اليومية ومن ثم تقديمها كمحاضرة في قاعة الدرس، وتزداد أهمية تحليل تلك المفاهيم عندما يكون الطالب المحور الأساس في العملية التعليمية وله الدور الفعال في المشاركة والنقاشات داخل الصف.

ويتكون البحث من قسمين: القسم الأول يهتم بالأسس النظرية للموضوع، ويقدم تعريفا وافياً لمصطلح (المفاهيم العلمية) من النواحي اللغوية والنفسية والعلوم التربوية وفي دراسة خصوصياته يعتمد على نظرية فيكوتسكي في (الثقافة الاجتماعية ــ منطقة النمو القريبة المركزية) وأثر تطبيقاتها في طرائق التدريس وتحليل محتوياتها.

وفي القسم الثاني حاول الباحث تطبيق ما تم إستنتاجه من خلاصة المفاهيم العلمية في درس نموذجي على المواضيع المقررة في المناهج الدراسية لمادة الأدب الكوردي للصف التاسع من مرحلة الأساس.

## Abstract

### (The impact of using the Scientific Method Concept Map in Kurdish Literature teaching)

This research which is titled (The impact of using the Scientific Method Concept Map in Kurdish Literature teaching) is an effort to dissect and study the introduction of Scientific Method Concept as a cornerstone in lesson planning of any particular subject in the curriculum, a subject that depends on the teaching and learning materials and puts more emphasis on engaging students in the learning process and also in conversations taking place at the classroom level.

The research consists of two main parts, this first part is dedicated to the introduction of the term (Scientific Method) in connection to the linguistic, psychology and Education sciences, and with regards to its features the research depends on the lev vygotsky's ( socio-cultural theory of cognitive development) theory and studying its impacts on using the strategies in teaching.

In the second part, the research endeavors to examine the utilization of the Scientific Method Concept Map in an exemplary lesson, then implementing it on other various subjects in the curriculum like Kurdish Literature of grade nine in basic schools. The conclusion demonstrates the findings, list of references and also the synopsis in both English and Arabic.

# ئاستەنگەکانی بەردەم ئازادیی کاری رۆژنامەوانی لە شاری سلێمانی

**م. کامل عومەر سلێمان**
بەشی راگەیاندن
کۆلێژی زانستە مرۆڤایەتییەکانی- زانکۆی سلێمانی

**پێشەکی**

ئازادیی رۆژنامەوانی، گرنگترین ئامرازی تاکەکانی کۆمەڵە بۆ زانینی پرس و بابەتە گشتییەکان و ئەو کاروبارانەی کە جێی بایەخپێدانیەتی، وەک چۆن ئامرازی گوزارشتکردنی را و بۆچوونەکانیەتی. لە ئاستی سیاسیشدا، ئازادیی رۆژنامەوانی بە دیارترین سیمای دیموکراسی دادەنرێت و بوونیشی یەکێکە لە گرنگترین پێوەرەکانی پێواندنی فەزای دیموکراسی لە هەر سیستمێکی حکومڕانیدا، سەرباری ئەوەی کە ئازادیی رۆژنامەوانی زەمینە سازکەری ئامرازەکانی راگەیاندن و رۆژنامەنووسییە بۆ چاودێریکردنی دەسەڵات و هاوکات هۆکاری پێکەوە بەستنەوەی نێوان تاکەکانی کۆمەڵ و حکومەتیشە. هەربۆیە، پرسی ئازادیی رۆژنامەوانی، جێی بایەخی رۆژنامەنووسانە بەتایبەت لەو کۆمەڵگایانەی کە بەرەو دیموکراسییەت و کرانەوە و ئازادیی کاری میدیایی هەنگاو دەنێن. ئەم ئازادییەش کە بەیاسا رێکخراوە، بێ کۆسپ و بەربەست نییە و بەکۆمەڵێک ئاستەنگی پیشەیی، سیاسی، یاسایی، کەلتووری و ئابووری دەورە دراوە، کە پەیڕەوکردنی سنووردار کردووە. ئەم توێژینەوەیە کە بەناوونیشانی (ئاستەنگەکانی بەردەم ئازادیی کاری رۆژنامەوانی لە شاری سلێمانی) ئەنجامدراوە، بۆ ئاشکراکردن و تێگەیشتنە لە بوون

یان نەبوونی ئاستەنگی سیاسی، یاسایی و ئابووری لەبەردەم ئازادیی کاری رۆژنامەوانی لە شاری سلێمانی.

ئەم توێژینەوەیە، لە سێ تەوەر پێکهاتووە و لە تەوەری یەکەمدا چوارچێوەی ڕێبازی توێژینەوە، کە کێشە، بایەخ، ئامانج، ڕێبازی توێژینەوە، کۆمەڵ و مشتەی توێژینەوەکە و......هتدی لەخۆ گرتووە. تەوەری دووەمیش زانیارینامەیە و تیایدا بەشێوەیەکی تیۆری باس لە ئازادیی رۆژنامەوانی و ئاستەنگە یاسایی و سیاسی و ئابوورییەکان کراوە. تەوەری سێیەمیش لایەنی مەیدانییە و جگە لە خستنەڕووی روونکارییە پێویستەکانی لێتوێژراوان، تاوتوێی ئەنجامی برگەکانی فۆرمی ڕاپرسییەکە کراوە و دواتر ئەنجام و ڕاسپاردەکان خراونەتەڕوو.

## تەوەری یەکەم: چوارچێوەی ڕێبازی توێژینەوە

**- بایەخی توێژینەوەکە:**

ئەم توێژینەوە لە سێ رووەوە بایەخی هەیە، وەک: بایەخی بۆ کۆمەڵ ئەوەیە کە بوونی ئازادیی رۆژنامەوانی، هۆکارە بۆ ئاگاداربوونی خەڵک لە پرسە گشتییەکان و ئەو بابەتانەی کە جێی بایەخ و گرنگی پێدانیەتی، هەروەها فاکتەری چاودێریکردنی دەسەڵاتەکانی دەوڵەت و دروستکردنی پردی پەیوەندیی نێوان خەڵک و حکومەتە. هەروەها بایەخی ئەم توێژینەوەیە بۆ زانست ئەوەیە کە دەبێتە سەرچاوەیەکی نوێ و گرنگ بۆ ئەکادیمییان و توێژەرانی بواری رۆژنامەگەری و دەکرێت ببێتە بنەما بۆ ئەنجامدانی توێژینەوەی دیکەی نزیک لەم بوارە. هاوکات بایەخی ئەم توێژینەوەیە بۆ پیشەی رۆژنامەنووسی، ئەوەیە کە دەبێتە هۆی هۆشیاربوونەوەی ڕۆژنامەنووس سەبارەت بە پرسی ئازادیی رۆژنامەوانی و ئەو ئاستەنگە سیاسی و ئابووری و یاساییانەی کە دێنە بەردەمی.

**- كێشەی توێژینەوەكە:**

لـە سـايەی رۆشـنايی و كاريگـەريتی ئـەو پەيڤانـەی پێشـوودا لـەبارەی بايـەخی توێژينەوەكـە و گەڕانـەوەمـان بـۆ توێژينـەوەكانی پێشووتر و سەرچاوەی پەيوەست بە ئازاديی رۆژنامـەوانی، گەيشـتينە ئەوەی ئەم كێشـەيە وەك كێشـەيەكی بنـەڕەتيی توێژينەوەكەمان دياری بكـەين و لــە پانتـايی ڕێكـارە زانسـتييەكاندا بكەوينــە تـاوتوێكردنی، كێشـەكەش بريتييـە لـە (نـاڕوونی و ناديـاريی كۆسـپ و لەمپـەرەكانی بـەردەم ئـازاديی كـاری رۆژنامـەوانی لـە شـاری سـلێمانی بەتايبـەت لـە چۆنيـەتی دەستڕاگەيشـتن بـە زانيـاری و بڵاوكردنـەوەی هـەواڵ و زانياريدا).

كێشەی سەرەكی ئەم توێژينەوەيە لە پرسيارێكی سـەرەكيدا خۆی دەبينێتەوە كە بريتييە لە:

ئەو ئاستەنگانە كامانەن كە رووبەڕووی ئـازاديی رۆژنامـەوانی لـە شاری سلێمانی دەبنەوە لەكاتی پيادەكردنی كاری رۆژنامەوانيدا؟.

بـۆ روونكردنـەوەی زيـاتری پرسـياری سـەرەكيی توێژينەوەكـە، چەند پرسيارێكی لاوەكی دەخەينەڕوو:

١- تا چەند لە سلێمانی ئازاديی رۆژنامەوانی بەشێوەيەكی كردەيی بۆ رۆژنامەنووسان و دامەزراوە رۆژنامەوانييەكان رەخسێنراوە؟

٢- ئەو ئاستەنگانە كامانەن كە رووبەڕووی ئـازاديی رۆژنامـەوانی لـە شـاری سـلێمانی دەبنـەوە، بەتايبـەت لـەميانی پيـادەكردنی پيشـەی رۆژنامەوانيدا؟.

٣- را و بۆچـوونی رۆژنامەنووسـانی سـلێمانی لـەبارەی دۆخـی ئازاديی رۆژنامەوانييەوە چييە؟

**- ئامانجی توێژينەوەكە:**

ئامـانجی بنـەڕەتی ئـەم توێژينەوەيـە بريتييـە لـە (ئاشـكراكردنی بـوون و نـەبوونی ئـەو ئاسـتەنگ و رێگرييانـەی كـە ئـازاديی كـاری

رۆژنامەوانی سنووردار دەکەن). لەو رووەوە و بۆ روونکاریی زیاتر، چەند ئامانجێکی لاوەکی دەخەینە روو، کە بریتین لە:

١- دڵنیابوونەوە لە بوونی کردەییبیانەی رووبەری ئازادیی رۆژنامەوانی لە شاری سلێمانی.

٢- ئاشکراکردنی ئەو ئاستەنگانەی کە رووبەڕووی ئازادیی رۆژنامەوانی لە شاری سلێمانی دەبنەوە لەمیانی پیادەکردنی رۆژنامەوانیدا، وەک ئاستەنگی سیاسی، یاسایی.

٣- تێگەیشتن لە را و بۆچوونی بەشێک لە رۆژنامەنووسانی سلێمانی سەبارەت بە دۆخی ئازادیی رۆژنامەوانی لە شاری سلێمانی و هەڵوێستیان لەو بارەیەوە.

**- جۆر و ڕێبازی توێژینەوەکە:**

ئەم توێژینەوەیە، توێژینەوەیەکی (وەسفی)یە و تیایدا کۆی پێدراوە بنەڕەتییەکانی بابەتەکەی تاوتوێ دەکرێت و ڕوون دەکرێنەوە و سەرنجی پێویستیان لەسەر دەدرێت. هاوکات بۆ بەرجەستەبوونی ئامانجە کردەنییەکانیشی، پشت بە ڕێبازی (ڕووماڵکاری) بەستراوە، کە بەپێی زۆرێک لە توێژینەوە زانستییەکانی بوارەکانی ئەم بابەتە، ڕێبازێکی زانستییانەی گونجاوە.

**- ئامرازی توێژینەوەکە:**

لەم توێژینەوەیەدا فۆرمی راپرسی بەکاردەهێنرێت بۆ کۆکردنەوەی زانیاری دەربارەی پرسیارەکانی توێژینەوە و شیکردنەوەی وەسفی چەندێتی بۆ خودی داتاکان کە نمایشی نموونە (سامپڵ)ی توێژینەوەکە دەکەن.

**- راستی (الصدق ) :**

بە مەبەستی دڵنیابوون لە کارایی فۆرمی راپرسییەکەمان و گونجانی لەگەڵ بابەتی توێژینەوەکەدا و بە پشتبەستن بە رووکەشە

دروستی (الصدق الظاهري)، فۆرمی ڕاپرسییەکەمان ڕووبەڕووی ژمارەیەک (شارەزای زانستی)* کردەوە و پاش وەرگرتنەوەی لە بەڕێزیان و تاوتوێکردنی سەرنجدانەکانیان، بەپێی پێویست گۆڕانکاریمان تیایدا کرد و بە پشتبەستن بە بەکارهێنانی هاوکێشەی هۆڵستی، ڕێژەی دروستییەکەمان دەرهێنا کە بڕەکەی بریتییە لە (٨٩.٤%) ئەوەش بڕێکی پەسندە لەڕووی زانستییەوە .

- **جێگیری (الثبات) :**

بۆ دیاریکردنی ئاستی جێگیریی ڕاپێوییەکەش، بەپێی شێوازی دووپاتکاری و بەپشتبەستن بە هاوکێشەی هۆڵستی، گەیشتینە ئەوەی کە بڕەکەی بریتییە لە (٠,٧٦٥٣٢%)و ئەوەش ڕێژەیەکی پەسندە لە ڕووی زانستییەوە .

- **سنووری توێژینەوەکە:**

سنووری توێژینەوەکە لە ڕووی (شوێن)ەوە، شاری سلێمانییە، لە ڕووی (کات)یشەوە زەمەن دیاریکراو نییە و لە ڕووی (مرۆڤ)یشەوە ڕۆژنامەوانانی چەند دامەزراوەیەکی ڕۆژنامەوانییە لە شاری سلێمانی .

- **کۆمەڵ و مشتەی توێژینەوەکە :**

کۆمەڵی توێژینەوەکە، بریتییە لەو ڕۆژنامەوانانەی بوارە جیاجیاکانی ڕاگەیاندنی (چاپکراو، بیستراو، بینراو، ئۆنلاین) کە لە دامەزراوە ڕۆژنامەوانییەکانی شاری سلێمانی. توێژەر سامپڵی هەڕەمەکی مەبەستداری بۆ سامپڵێک لە ڕۆژنامەنووسانی دامەزراوە ڕۆژنامەوانییەکانی شاری سلێمانی دیاری کردووە و کە ژمارەیان (٥٨) ڕۆژنامەنووسن. هۆکاری هەڵبژاردنی سامپڵیش بەشێوەی مەبەستدار بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە داتایەکی دروست لەبارەی ژمارەی ڕۆژنامەنووسانەوە لەبەردەستدا نییە.

**- دیاریکردنی چەمک و زاراوەکانی توێژینەوەکە:**

- ئاستەنگ: بریتییە لە چالاکییەکی نەرێنی کە بەشدار دەبێت لە رێگری و گرفت و ناڕێکی دروستکردن لە ئەرکێکدا، یان ئەو کۆسپ و رێگرییە مەبەستدارانەیە کە لە ساتی ئەنجامدان و پیادەکردنی کارێک، لەلایەن کەس و لایەن و گرووپی خاوەن دەسەڵاتی سیاسی و دارایی و یاساییەوە دروست دەکرێن .

- ئازادیی رۆژنامەوانی: مەبەست لە ئازادانە کارکردنی رۆژنامەوان و دەزگاکانی کاری رۆژنامەوانییە بەبێ رێگری و ئاستەنگ دروستکردن لەبەردەمیاندا، بەڵام بە رەچاوکردنی بەرپرسیارێتیی پیشەیی.

- ئاستەنگەکانی ئازادیی رۆژنامەوانی: لەم توێژینەوەیەدا، مەبەست لە ئازادیی رۆژنامەوانی، هەموو ئەنجامێکی نەرێنی یان گرفت و کەموکورییەک کە لە کاتی جێبەجێکردنی ئەرکی رۆژنامەوانیدا دروست دەبێت، بەشێوەیەک کە ئەم گرفتە ببێتە هۆی رێگری لەبەردەم کاری رۆژنامەوانیدا و کۆتی ئازادییەکەی بکات، یاخود بیخاتە ژێر باری فشارەوە. مەبەست لە ئاستەنگەکانی ئازادیی رۆژنامەوانی لەم توێژینەوەیەدا، ئەو گرفت و رێگرییە یاسایی و سیاسی و ئابوورییانەن کە لەبەردەم ئازادیی کارکردنی رۆژنامەوانانەدا دروست دەبن، یان دروستدەکرێن.

- شاری سلێمانی: مەبەست ئەو رووبەرەیە کە دەکەوێتە ناوەندی پارێزگای سلێمانی و تێیدا چەندین دامەزراوەی رۆژنامەوانی و بەپێی ئاماری لقی سلێمانی سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستان نزیکەی هەشت هەزار رۆژنامەنووسی تێدایە..

## تەوەری دووەم: لایەنی تیۆری

**- ئازادیی رۆژنامەوانی :**

ئازادیی رۆژنامەوانی، یەکێکە لەو بابەتانەی کە جێی گرنگیپێدانی بیرمەند و پسپۆڕانی بواری یاسا و رۆژنامەوانی و تەنانەت خەڵکی گشتییە، هەر لەبەرئەوە را و بۆچوونەکان لەبارەی چەمکی ئازادیی رۆژنامەوانییەوە جیاوازن. لەو چوارچێوەیەدا، رایەک هەیە کە پێی وایە، ئازادیی رۆژنامەوانی، بەمانای نەبوونی هیچ جۆرە سەرپەرشتی و چاودێریکردنێکی حکومی لەلایەک و بوونی مافی خەڵک لە دەرکردنی رۆژنامە بەبێ کۆت و بەند و ئاستەنگ لەلایەکی دیکەوە، دێت (البریدی، ٢٠٠٠: ٢٤). بۆچوونێکی دیکە، جەخت لەسەر ئەم رایە دەکاتەوە و پێی وایە، ئازادیی رۆژنامەوانی، دەستوەرنەدانی حکومەتە لەوەی بڵاودەکرێتەوە، یان سەپاندنی خواست و ویستییەتی بە پابەندکردن یان رێگریکردن لەو بابەتانەی بڵاودەکرێنەوە، یان بە راگرتن، دەستبەسەراگرتن و رەتکردنەوەیان. ئەوەش بە رەچاوکردنی ئاراستە و بیروبۆچوونەکانیان و ئەوەی بڵاوی دەکەنەوە.( الحلو، ماجد راغب، ٢٠٠٦: ٥٨). هەروەها ئازادیی رۆژنامەوانی، بە واتای مافی دەستکەوتنی زانیاری لە هەر سەرچاوەیەک و گواستنەوە و ئاڵوگۆڕکردنی دێت و هەروەها مافی بڵاوکردنەوەی بیر و بۆچوونەکان و ئاڵوگۆڕکردنیان بەبێ رێگری و ئاستەنگ، هەروەها مافی دەرکردنی رۆژنامە و نەسەپاندنی هیچ جۆرە چاودێرییەکی پێشوەختە بەسەر دامەزراوە رۆژنامەوانییەکاندا لە سنوورێکی بەرتەسکدا نەبێت کە پەیوەست بێت بە ئاسایشی نەتەوەیی و کاروباری سەربازی و ئادابی گشتییەوە. (ابو خلیل،٢٠١١: ١٤٠).

پرۆفیسۆر رۆبیرت ستیفینسۆن، کە شارەزایەکی دیار و ناسراوە لەم بوارەدا، رای وایە ئازادیی رۆژنامەوانی مافی دەربڕین و پەخشی

تەلـــەفزیۆنی و رادیۆییـیـــە، یـــان بڵاوکردنەوەیـــە بـــەبێ رێگـــری و هەڵســـەنگاندنی حکومـــەت، لەگـــەڵ هـــەڵگرتنی بەرپرســـیارێتی دوای بڵاوکردنـەوە لـە حاڵـەتی ئەنجامـدانی هـەر پێشـێلکارییەکی یاسـاییدا. هـەروەها بـوونی چەنـد گرەنتییـەکی یاسـایی کـە خـۆی دەبینێتـەوە لـە: یەکـەم: توانـای دەستخسـتنی زانیـاری لـەلای حکومـەت و کۆمپانیـا و کەســەکان. دووەم: مـافی وەڵامدانـەوە و راسـتکردنەوە، سـێیەم: مـافی گەیشتن بە دامەزراوەکانی راگەیاندن. چوارەم: هەندێ پاراستنی تایبەتی بۆ رۆژنامەنووسـان. (اليمينی، ٢٠١٣: ١٤). بۆچـوونێکی تـر هەیـە، رای وایـە ئازادیی رۆژنامـەوانی، مانـای ئـەوە دەگەیـەنێ کە مافە لـە گواسـتنەوەی بیروبۆچوون و زانیارییـەکان، بـەبێ کۆت و بەندی حکومی، بـەئامانجی هاندانی گواستنەوەی ئەو بیرو بۆچوونانەی کە دەبنە هۆی ئاسـانکردنی بڕیـــاری گونجـــاو و دروســـت ســـەبارەت بـــە کاروبـــاری گشـــتی و بەرژەوەندیی گشتی و بەرژەوەنـدیی کۆمەڵگـەکان (Dennis, John Merril, 1984 1:). رایەکی دی هەیە کە جەخت لەسەر ئەم بۆچوونـە دەکاتـەوە و ئـــازادیی رۆژنامـــەوانی بـــە پایەیـــەک لـــە پایـــە گرنگـــەکانی پرۆســـەی دیموکراسی دادەنێت و بەو ئامرازەشی دەزانێت کە بەهۆیـەوە گـەرەنتی بەدەسـتهێنانی زانیـاریی پێویست لەلایـەن تاکەکانی کۆمەڵـەوە دەکرێت، ئەویش بۆ بڕیاردان و بەشداریکردنیان لە پرۆسەی سیاسی و هەروەها چـاودێریکردنی چـۆنێتی بـەڕێوەچوونی دامـەزراوەی حکـومڕانیکردن (ابراهيم، ١٩٩٧: ١٠). پسـپۆڕێکی بـواری راگەیانـدنیش پێـی وایـە، دەکـرێ ئـازادیی رۆژنامـەوانی لـە سـێ گۆشـەی جیـاوازەوە پێناسـە بکرێت، کـە بریتین لە: غیابی رێژەیی لە کۆسپ و ئاستەنگی حکومی، غیابی رێژەیی بۆ هـەموو ئاسـتەنگە حکومی و ئاسـتەنگەکانی دیکـە، هـەروەها بـوونی کەش و هەلومەرجی پێویست لەپێناو جەختکردن لە بڵاوکردنەوەی رای جیاواز (احلام بای، ٢٠٠٧). لـە کۆتاییدا، پێویسـتە ئامـاژە بـەوە بکـەین، کـە نـابێ ئـازادیی رۆژنامـەوانی سـنووردار بکرێت تـەنها بەئاسـتی پێویسـت

نەبێت کە بۆ زامنکردنی بەرگریی نیشتیمانی و پاراستنی بەرژەوەندیی گشتی، سیستمی گشتی، هەروەها مافی کەسانی تر و ئازادییە بنەڕەتییەکان، پێویستن (Robert, 1994,:662) .

**- ئاستەنگەکان:**

لە ژینگەی کاری ڕۆژنامەوانیدا، کۆمەڵێک بەربەست و ئاستەنگ، بەشێوەی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ بۆ ڕۆژنامەنووسان و دامەزراوە ڕۆژنامەوانییەکان لەکاتی پیادەکردنی ئەرکەکانیاندا دروست دەبن و پێی کاریگەر دەبن، کە خۆیان لە ئاستەنگی پیشەیی، سیاسی، یاسایی، ئابووری، کەلتووری، ئاینی و کۆمەلایەتی دەبیننەوە. ئەمەش پەیڕەوکردنی ئەو چەمکەی کە پێی دەوترێت (ئازادیی ڕۆژنامەوانیی) سنووردار کردووە. لەم توێژینەوەیەدا، تەنها سێ لەو ئاستەنگانەی بەردەم ئازادیی کاری ڕۆژنامەوانی، دەخەینە ڕوو، کە پێکهاتوون لە :

١- ئاستەنگە سیاسییەکان :

ئەو ڕەخنە سیاسییانە کە ڕۆژنامەنووسان لە ڕێی وتارەکانیانەوە لە هەڵوێستی بەرپرسە سیاسییەکانی دەگرن، ئەو بەرپرسانە قبووڵی ناکەن و بە هەڵسوکەوتێکی دوژمناکارانەی لە قەڵەم دەدەن و پێیانوایە ڕەخنە سنووری هەیە و کاتێک ڕۆژنامەکان و ڕۆژنامەنووسان ئەو سنوورە دەبەزێنن، ئەوا لەبەردەم دادگادا ڕووبەڕووی لێپرسینەوە دەکرێنەوە و سزا دەدرێن (خەتیب، ٢٠٠٨: ٨٧). ئەمەش بەو مانایەی کە ئازادیی ڕەخنەی سیاسی پێویستە لە سنووری ڕێگە پێدراوی سیستمی سیاسیی دەوڵەتدا بمێنێتەوە، ئەم سنوورەش بەپێی مەودای پراکتیزەکردنی دیموکراسی، فراوان و بەرتەسک دەبێتەوە. بەو پێیەش هەر سیستمێکی سیاسی دیموکراسی نەبێت، ناتوانرێ بوترێ کە ئازادیی ڕۆژنامەوانی بوونی هەیە. ئاستەنگە سیاسییەکانیش لای بەشێک لە توێژەران، بریتین لە: شاردنەوەی ئەو زانیارییە گرنگانەی بە

لای خەڵکییەوە گرنگن، جیاوازی و جیاکاری لەنێوان رۆژنامەوانانـدا، نەبوونی سیستەمێک بۆ دەستکەوتنی زانیاری لەلایەن رۆژنامەنووسانەوە، هەروەها سزادانی ئەو رۆژنامەنووسانەی کە رەخنە لە کارو هەڵوێستی بەرپرسە سیاسییەکان دەگرن (عومەر، ٢٠١٧: ١٤٣-١٤٥). ئاستەنگە سیاسییەکانیش بریتین لە بڕیاری داخستنی دەزگا رۆژنامەوانییەکان و دەستگیرکردنی رۆژنامەنووسان و بەندکردنیان، هەروەها چاودێریی پێشوەخت لەسەر رۆژنامەکان، هەروەها سکاڵا تۆمارکردنی بەرپرسە سیاسییەکان دژی رۆژنامەنووسە نەیارەکانیان (خەتیب، سەرچاوەی پێشوو: ٨٧).

٢- ئاستەنگە ئابوورییەکان :

ئەو ئاستەنگە ئابوورییانەی لەبەردەم ئازادیی کاری رۆژنامەوانییدان وەک: پاوانکردنی خاوەنداریێتی دامەزراوە رۆژنامەوانییەکان و ئەو لایەنانەی کە لەڕووی داراییەوە پشتیوانییان دەکەن، کە رۆڵیان لە دیاریکردن و داڕشتنی سیاسەتی دامەزراوەکە و دەستوەردان لە دەرکردنی بڕیارەکانیدا هەیە (عـزەت، ١٩٩٤: ٢٧)، هەروەها کۆنترۆڵی سروشتی زانیارییە بڵاوکراوەکان دەکەن (معهد البنك الدولي، ٢٠٠٥: ١٩). سەرەڕای هەڕەشەی کۆمپانیاکانی رێکلام و چاوپۆشیکردن لە کۆمپانیا و خاوەن سەرمایەکان بەهۆی پێدانی رێکلامەوە. هەربۆیە لەحاڵەتی نەبوونی سەرچاوەی تری کۆمەککردن وەک یارمەتیدانی دارایی لە ناوخۆو دەرەوە، کە وای لێدەکات کۆیلەی ئاراستەکانی ئەو لایەنە بێت کە کۆمەکی دەکات (خەتیب، ٢٠٠٨: ٧). سەرباری ئەوانە بە بزنس نەبوونی کاری رۆژنامەوانی، وادەکات کە دامەزراوەی رۆژنامەوانی نەتوانێت خۆی بژییەنێ و لەسەر پێی خۆی بوەستێ .

٣- ئاستەنگە یاساییەکان:

ڕێکخستنی یاسایی بۆ ئازادیی رۆژنامەنووسی، کە ئامانج لێی ڕێکخستنیەتی لە چوارچێوەی ئازادییەکی بەرپرسیاردا، بەئاستەنگی بەردەم پەیڕەوکردنی دانانرێت، بەڵکو ئەم ڕێکخستنە بۆ زامنکردنیەتی لەلادان و ترازانە لەڕێی ڕاست. بەپێچەوانەشەوە فراوانکردنی کۆت و بەندە یاساییەکان، ئەوا دەبێتە سنووردانان بۆ ئازادیی کارکردن و ئاستەنگ لەبەردەم پەیڕەوکردنی ڕێکخستنی یاساییدا (خەتیب، ٢٠٠٨: ٦٨). لەگەڵ ئەوەشدا، لە زۆربەی وڵاتاندا، تەنها بە یاسا، ئازادی بۆ میدیاکان دەستەبەر ناکرێت، بەڵکو بە رۆشنبیری و نەریتە قبووڵکراوەکان لەلایەن کۆمەڵەوە، رۆڵی گرنگ دەگێڕن (معهد البنك الدولي، سەرچاوەی پێشوو: ١٦). کەواتە کۆسپ دروستکردن بۆ جێبەجێکردنی یاساکانی پەیوەست بە رۆژنامەنووسی و خراپ بەکارهێنانیان و کارکردن بەپێچەوانەی یاساکانەوە، ئاستەنگ بۆ ئازادیی کاری رۆژنامەوانی دروست دەکات.

## تەوەری سێیەم: لایەنی مەیدانی

### - رەگەزی لێتوێژراوان:

ئەنجامەكان ئەوە دەردەخەن كە زۆربەی بەرتوێژەكان لە ڕەگەزی (نێر)ن و (پلەی یەكەم)یان گرتووە و ئەوانی دیكەش رەگەزی (مێ)ن و بە (پلەی دووەم) هاتوون لە ڕیزبەندی ئەگەرەكاندا. بڕوانە خشتەی (١).

خشتەی (١) دابەشبوونی رەگەزی لێتوێژراوان بەپێی رەگەز

| رەگەز | ٪ | چەندبارە | پلە |
|---|---|---|---|
| نێر | ٨٧.٩ | ٥١ | یەكەم |
| مێ | ١٢.١ | ٧ | دووەم |
| كۆی گشتی | ١٠٠ | ٥٨ | – |

### - كاری رۆژنامەوانی:

ئەنجامەكان دەریدەخەن، كە زۆرینەی لێتوێژراوان، رۆژنامەنووسیی هەواڵسازن و لە ریزبەندی ئەگەرەكاندا، پلەی یەكەمیان گرتووە و رۆژنامەنووسانی پەیامنێریش بە پلەی دووەم دێن. بڕوانە خشتەی (٢)

خشتەی (٢) جۆری كاری ڕۆژنامەوانی

| رەگەز | ٪ | چەندبارە | پلە |
|---|---|---|---|
| هەواڵساز | ٤٨.٣ | ٢٨ | یەكەم |
| پەیامنێر | ١٧.٢ | ١٠ | دووەم |
| سەرنووسەر | ١٢.١ | ٧ | چوارەم |
| ل.بەش | ٨.٦ | ٥ | پێنجەم |
| ل.لاپەڕە | ٠.٠ | ٠ | شەشەم |
| هی تر | ١٣.٨ | ٨ | سێیەم |
| كۆی گشتی | ١٠٠ | ٥٨ | – |

**- ماوەی کارکردنی ڕۆژنامەنووسان:**

بەپێی ئەنجامەکان، ئەو لێتوێژراوانەی ماوەی کارکردنیان لە بواری ڕۆژنامەوانیدا (١١) ساڵ بەرەو ژوورە، زۆرینەن و بە پلەی یەکەم هاتوون. ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە لێتوێژراوان ئەزموونیان لە پیادەکردنی کاری ڕۆژنامەوانیدا زۆرە و بەهۆیەوە تێگەشتنیان لەبارەی دۆخی ئازادیی ڕۆژنامەوانییەوە زیاترە. بڕوانە خشتەی (٣).

خشتەی (٣) ماوەی کارکردن لەبواری ڕۆژنامەوانی

| ڕەگەز | ٪ | چەندبارە | پلە |
|---|---|---|---|
| کەمتر لە ساڵێك | ٣.٤ | ٢ | چوارەم |
| (١ – ٥ ) ساڵ | ١٩.٠ | ١١ | سێیەم |
| (٦ – ١٠ ) ساڵ | ٣١.٠ | ١٨ | دووەم |
| (١١ ) ساڵ و زیاتر | ٤٦.٦ | ٢٧ | یەکەم |
| کۆی گشتی | ١٠٠ | ٥٨ | – |

**- جۆری دامەزراوەی ڕۆژنامەوانی:**

ئەنجامەکان ئەوە روون دەکەنەوە، زۆرینەی لێتوێژراوان کە بە پلەی یەکەم هاتوون لە (ڕۆژنامەوانیی ئەلکترۆنی)دا کاردەکەن، ئەوانی تریش لە میدیای (بینراو، چاپکراو، بیستراو)دا کاردەکەن. ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەو برەوەی کە ڕۆژنامەوانیی ئەلکترۆنی لە سەردەمی دیجیتاڵ میدیادا زیادی کردووە و بووەتە جێی بایەخی ڕۆژنامەنووسان. بڕوانە خشتەی (٤).

| خشتەی (٤) جۆری دامەزراوەی ڕۆژنامەوانی | | | |
|---|---|---|---|
| ڕەگەز | ٪ | چەندبارە | پلە |
| ڕۆژنامەوانیی ئەلکترۆنی | ٤٣.١ | ٢٥ | یەکەم |
| ڕۆژنامەی کاغەزی | ١٩.٠ | ١١ | سێیەم |
| تەلەفزیۆن | ١٧.٢ | ١٠ | چوارەم |
| ڕادیۆ | ٢٠.٧ | ١٢ | دووەم |
| کۆی گشتی | ١٠٠ | ٥٨ | – |

**- خاوەندارێتی دامەزراوەی ڕۆژنامەوانی:**

ئەنجامەکان ئەوە روون دەکەنەوە، کە زۆرینەی لێتوێژراوان لەو دامەزراوە ڕۆژنامەوانییانەدا کاردەکەن کە خاوەندارێتییەکەیان ئەهلییە. ئەمەش بۆ توێژینەوەکە گرنگیی خۆی هەیە، بەوپێیەی زیاتر ڕۆژنامەنووسی دامەزراوە ڕۆژنامەوانییەکانی دەرەوەی دەسەڵات، ڕووبەڕووی ئاستەنگ و ڕێگری دەبنەوە. بڕوانە خشتەی (٥).

| خشتەی (٥) خاوەندارێتی دامەزراوەی ڕۆژنامەوانی | | | |
|---|---|---|---|
| ڕەگەز | ٪ | چەندبارە | پلە |
| ئەهلی | ٦٥.٥ | ٣٨ | یەکەم |
| حزبی | ٢٩.٣ | ١٧ | دووەم |
| سێبەری حزب | ٥.٢ | ٣ | سێیەم |
| کۆی گشتی | ١٠٠ | ٥٨ | – |

**- سلێمانی و ڕەخساندنی ئازادیی ڕۆژنامەوانی:**

بەپێی ئەنجامەکان، زۆرینەی لێتوێژراوان کە لە پلەی یەکەم و دووەمی ریزبەندی ئەگەرەکاندا هاتوون، پێیانوایە ئازادیی ڕۆژنامەوانی لە شاری سلێمانی بۆ ڕۆژنامەنووسان ڕەخسێنراوە، ئەمەش ئاماژەی دڵنیابوونە لەسەر بوونی کردەیی ئازادیی ڕۆژنامەوانی، کە پێشتر وەک بۆچوون باسکراوە. بڕوانە خشتەی (٦).

خشتەی (٦) لەشاری سلێمانی، ئازادیی ڕۆژنامەوانی بۆ ڕۆژنامەوان و دامەزراوەکانیان ڕەخسێنراوە.

| ڕەگەز | ٪ | چەندبارە | پلە |
|---|---|---|---|
| بەردەوام | ٢٤.١ | ١٤ | دووەم |
| هەندێك جار | ٧٤.١ | ٤٣ | یەكەم |
| بە دەگمەن | ١.٧ | ١ | سێیەم |
| کۆی گشتی | ١٠٠ | ٥٨ | – |

**- دەسەڵاتی سیاسی و قبووڵکردنی ڕەخنە:**

ئەنجامەکان ئەوە دەخەنە ڕوو، زۆرینەی لێتوێژراوان کە بەپلەی یەکەم دێن، پێیانوایە، لە شاری سلێمانی، دەسەڵاتی سیاسی هەندێک جار ڕەخنەی قبووڵ کردووە و ئەوانەشی پێیان وایە بە بەردەوامی ڕەخنە قبووڵ کراوە بە پلەی دووەم دێن. بەوپێیەش ئەنجامەکە ئەرێنییە و جەختکردنەوەیە لە خشتەی پێشوو. بڕوانە خشتەی (٧)

خشتەی (٧) لە سلێمانی، دەسەڵاتی سیاسی، ڕەخنەی ڕۆژنامەوانانی قبووڵ کردووە.

| ڕەگەز | ٪ | چەندبارە | پلە |
|---|---|---|---|
| بەردەوام | ٢٥.٩ | ١٥ | دووەم |
| هەندێك جار | ٥٦.٩ | ٣٣ | یەكەم |
| بە دەگمەن | ١٧.٢ | ١٠ | سێیەم |
| کۆی گشتی | ١٠٠ | ٥٨ | – |

**- بەراوردی ئازادیی ڕۆژنامەوانی لە سلێمانی و شارەکانی تر:**

بەپێی ئەم ئەنجامە، زۆرینەی لێتوێژراوان کە بە پلەی یەکەم دێن، پێیانوایە، ئازادیی ڕۆژنامەوانی لە شاری سلێمانی بە بەراورد بە شارەکانی دیکەی هەرێم زیاترە، ئەمەش جەختکردنەوەیە لە ئەنجامی هەردوو خشتەکەی پێشوو. بڕوانە خشتەی (٨)

خشتەی (٨) لەسلێمانی، ئازادیی رۆژنامەوانی لە شارەکانی دیکەی هەرێم زیاترە.

| ڕەگەز | ٪ | چەندبارە | پلە |
|---|---|---|---|
| بەردەوام | ٦٩.٠ | ٤٠ | یەکەم |
| هەندێك جار | ٢٢.٤ | ١٣ | دووەم |
| بە دەگمەن | ٨.٦ | ٥ | سێیەم |
| کۆی گشتی | ١٠٠ | ٥٨ | – |

**- سلێمانی و راگرتنی دامەزراوە رۆژنامەوانییەکان:**

ئەنجامەکان ئەوە روون دەکەنەوە، زۆرینەی لێتوێژراوان کە بە پلەی یەکەم دێن، پێیانوایە، هەندێ جار هێرش دەکرێتە سەر دامەزراوە رۆژنامەوانییەکان و لە کارکردن رادەگیرێن. ئەوەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە ئازادیی رۆژنامەوانی لە شاری سلێمانی رێژەییە و رەها نییە. بڕوانە خشتەی (٩).

خشتەی (٩) لەسلێمانی، هێرش دەکرێتە سەر دامەزراوە رۆژنامەوانییەکان و لە کارکردن رادەگیرێن.

| ڕەگەز | ٪ | چەندبارە | پلە |
|---|---|---|---|
| بەردەوام | ١٥.٥ | ٩ | سێیەم |
| هەندێك جار | ٦٧.٢ | ٣٩ | یەکەم |
| بە دەگمەن | ١٧.٢ | ١٠ | دوووەم |
| کۆی گشتی | ١٠٠ | ٥٨ | – |

**- رۆژنامەوان و توندوتیژی:**

ئەنجامەکان دەریدەخەن، زۆرینەی لێتوێژراوان کە بە پلەی یەکەم دێن، پێیانوایە، هەندێ جار رۆژنامەوانانی شاری سلێمانی رووبەڕووی هەڕەشە و توندوتیژی و تیرۆرکردن دەبنەوە. ئەمەش جەختکردنەوەیە

لەو ئاماری پێشێلکارییانەی دژ بە رۆژنامەنووسان کە لەلایەن رێکخراو و سەندیکاکانەوە بڵاودەکرێنەوە. بڕوانە خشتەی (١٠).

**خشتەی (١٠) لەسلێمانی، رۆژنامەوانان رووبەڕووی هەڕەشە و توندوتیژی و تیرۆرکردن دەبنەوە.**

| ڕەگەز | ٪ | چەندبارە | پلە |
|---|---|---|---|
| بەردەوام | ٢٤.١ | ١٤ | سێیەم |
| هەندێك جار | ٥٠.٠ | ٢٩ | یەکەم |
| بە دەگمەن | ٢٥.٩ | ١٥ | دووەم |
| کۆی گشتی | ١٠٠ | ٥٨ | – |

**- رۆژنامەوان و دەستگیرکردن:**

بەپێی ئەم ئەنجامە، زۆرینەی لێتوێژراوان کە بە پلەی یەکەم دێن، پێیانوایە هەندێ جار لە سلێمانی بەبڕیاری سیاسی رۆژنامەوان دەستگیر دەکرێت و بەند دەکرێت. ئەمەش جگە لەوەی جەختکردنەوەیە لە خشتەکەی پێشوو، ئاماژەیشە بۆ پێشێلکاری یاسای رۆژنامەگەریی هەرێم کە دەستگیرکردن و بەندکردنی رۆژنامەوانی تێدا نییە. بڕوانە خشتەی (١١).

**خشتەی (١١) لەسلێمانی بەبڕیاری سیاسی رۆژنامەوان دەستگیر دەکرێت و بەند دەکرێت.**

| ڕەگەز | ٪ | چەندبارە | پلە |
|---|---|---|---|
| بەردەوام | ١٩.٠ | ١١ | سێیەم |
| هەندێك جار | ٤٨.٣ | ٢٨ | یەکەم |
| بە دەگمەن | ٣٢.٨ | ١٩ | دووەم |
| کۆی گشتی | ١٠٠ | ٥٨ | – |

**- ڕۆژنامەوان و مامەڵەی نایەکسان:**

ئەنجامەکان ئەوە دەخەنەڕوو، زۆرینەی لێتوێژراوان کە لە پلەی یەکەم و دووەمی ریزبەندی ئەگەرەکاندا هاتوون، پێیانوایە لە دامەزراوە فەرمییەکانی سلێمانی، بەهۆی ئینتیمای حزبی و سیاسییەوە مامەڵەی نایەکسان لەگەڵ ڕۆژنامەوان و دامەزراوە ڕۆژنامەوانییەکاندا دەکرێت. بڕوانە خشتەی (١٢).

**خشتەی (١٢) لە دامەزراوە فەرمییەکانی سلێمانی، بەهۆی ئینتیمای حزبییەوە مامەڵەی نایەکسان لەگەڵ ڕۆژنامەوان و دامەزراوە ڕۆژنامەوانییەکاندا دەکرێت.**

| ڕەگەز | ٪ | چەندبارە | پلە |
|---|---|---|---|
| بەردەوام | ٤٤.٨ | ٢٦ | دووەم |
| هەندێك جار | ٤٦.٦ | ٢٧ | یەکەم |
| بە دەگمەن | ٨.٦ | ٥ | سێیەم |
| کۆی گشتی | ١٠٠ | ٥٨ | – |

**- ڕۆژنامەوان و جیاکاری لە پێدانی زانیاری:**

بەگوێرەی ئەم ئەنجامە، زۆرینەی لێتوێژراوان کە بە پلەی یەکەم دێن، رایان وایە لە سلێمانی، بەهۆکاری جیاوازیی سیاسی، جیاکاری لە پێدانی زانیاری بە ڕۆژنامەوانان دەکرێت. ئەمەش جەختکردنەوەیە لە ئەنجامی خشتەکەی پێشوو. بڕوانە خشتەی (١٣).

خشتەی (١٣) لە سلێمانی، بەهۆکاری جیاوازیی سیاسی، جیاکاری لە پێدانی زانیاری بە ڕۆژنامەوانان دەکرێت.

| ڕەگەز | ٪ | چەندبارە | پلە |
|---|---|---|---|
| بەردەوام | ٥١.٧ | ٣٠ | یەکەم |
| هەندێك جار | ٣٧.٩ | ٢٢ | دووەم |
| بە دەگمەن | ١٠.٣ | ٦ | سێیەم |
| کۆی گشتی | ١٠٠ | ٥٨ | – |

**- یاساکان و ئازادیی ڕۆژنامەوانی:**

ئەنجامەکان روونی دەکەنەوە، زۆرینەی لێتوێژراوان کە بە پلەی یەکەم دێن، پێیانوایە، یاسا بەرکارەکانی پەیوەست بە کاری ڕۆژنامەگەری، بوونەتە هۆی فەراهەمکردنی ئازادیی ڕۆژنامەوانی لە شاری سلێمانی، ئەگەرچی ئەوانەی رای پێچەوانەیان هەیە، کەم نین و بە پلەی دووەم دێن. بڕوانە خشتەی (١٤).

خشتەی (١٤) لە سلێمانی، یاساکان بوونەتە هۆی فەراهەمکردنی ئازادیی ڕۆژنامەوانی.

| ڕەگەز | ٪ | چەندبارە | پلە |
|---|---|---|---|
| بەردەوام | ١٣.٨ | ٨ | سێیەم |
| هەندێك جار | ٥١.٧ | ٣٠ | یەکەم |
| بە دەگمەن | ٣٤.٥ | ٢٠ | دووەم |
| کۆی گشتی | ١٠٠ | ٥٨ | – |

**- ئاسان دامەزراندنی دامەزراوەی ڕۆژنامەوانی:**

بەپێی ئەنجامەکان، زۆرینەی لێتوێژراوان کە بە پلەی یەکەم و دووەم دێن، پێیانوایە، لە سلێمانی بەپێی یاسای ڕۆژنامەگەری، بەئاسانی ڕۆژنامە و کەناڵی ڕاگەیاندن دادەمەزرێنرێن. ئەمەش ئاماژەیە بۆ جێبەجێکردنی یاساکە و بوونی ڕێژەییانەی ئازادیی ڕۆژنامەوانی. بڕوانە خشتەی (١٥).

خشتەی (١٥) لە سلێمانی بەپێی یاسای ڕۆژنامەگەری، بەئاسانی ڕۆژنامە و کەناڵی ڕاگەیاندن دادەمەزرێنرێت.

| ڕەگەز | ٪ | چەندبارە | پلە |
|---|---|---|---|
| بەردەوام | ٤٤.٨ | ٢٦ | دووەم |
| هەندێك جار | ٤٦.٦ | ٢٧ | یەکەم |
| بە دەگمەن | ٨.٦ | ٥ | سێیەم |
| کۆی گشتی | ١٠٠ | ٥٨ | – |

**- ئازادیی ڕۆژنامەوانی و سانسۆر:**

بەپێی ئەم ئەنجامە، زۆرینە پێیانوایە، بەدەگمەن، بەپێچەوانەی یاسای ڕۆژنامەگەرییەوە، سانسۆر بەسەر ڕۆژنامەوانانی سلێمانیدا دەسەپێنرێ. ئەمەش هەم جەختکردنەوەیە لە خشتەکەی پێشوو، هەم دڵنیاکردنەوەیە لەو ئازادییە ڕێژەییەی کە لە سلێمانی بۆ ڕۆژنامەنووسان ڕەخسێنراوە . بڕوانە خشتەی (١٦).

خشتەی (١٦) لە سلێمانی، بەپێچەوانەی یاسای ڕۆژنامەگەرییەوە، سانسۆر بەسەر ڕۆژنامەنووساندا دەسەپێنرێت.

| ڕەگەز | ٪ | چەندبارە | پلە |
|---|---|---|---|
| بەردەوام | ١٩.٠ | ١١ | سێیەم |
| هەندێك جار | ٥١.٧ | ١٧ | دووەم |
| بە دەگمەن | ٢٩.٣ | ٣٠ | یەکەم |
| کۆی گشتی | ١٠٠ | ٥٨ | – |

**- یاسای ڕۆژنامەگەری و ئاستەنگ:**

بەپێی ئەم ئەنجامە، زۆرینە کە بە پلەی یەکەم دێن، ڕایان وایە، لە دامەزراوە فەرمییەکانی سلێمانی، کۆسپ بۆ جێبەجێکردنی یاسای ڕۆژنامەگەریی هەرێم دروست دەکرێت. ئەمەش دڵنیابوونە لە بوونی ئاستەنگی یاسایی. بڕوانە خشتەی (١٧).

خشتەی (١٧) لە دامەزراوە فەرمییەکانی سلێمانی، کۆسپ بۆ جێبەجێکردنی یاسای ڕۆژنامەگەریی هەرێم دروست دەکرێت.

| ڕەگەز | ٪ | چەندبارە | پلە |
|---|---|---|---|
| بەردەوام | ٣٦.٢ | ٢١ | دووەم |
| هەندێك جار | ٥١.٧ | ٣٠ | یەکەم |
| بە دەگمەن | ١٢.١ | ٧ | سێیەم |
| کۆی گشتی | ١٠٠ | ٥٨ | – |

**- ئازادیی رۆژنامەوانی و یاسای دەستكەوتنی زانیاری:**

بەپێی ئەم ئەنجامە، زۆرینەی لێتوێژراوان كە بە پلەی یەكەم دێن، پێیانوایە، یاسای مافی دەستكەوتنی زانیاری لە هەرێم، نەبووەتە هۆی ئەوەی رۆژنامەنووسانی سلێمانی بە ئاسانی زانیاری و دیكۆمێنتیان دەستبكەوێت. بڕوانە خشتەی (١٨).

خشتەی (١٨) لە سلێمانی، یاسای مافی دەستكەوتنی زانیاری لە هەرێم، بووەتە هۆی ئەوەی رۆژنامەنووسان بە ئاسانی زانیاری و دیكۆمێنتیان دەستبكەوێت.

| رەگەز | ٪ | چەندبارە | پلە |
|---|---|---|---|
| بەردەوام | ١٢.١ | ٧ | سێیەم |
| هەندێك جار | ٣٦.٢ | ٢١ | دووەم |
| بە دەگمەن | ٥١.٧ | ٣٠ | یەكەم |
| كۆی گشتی | ١٠٠ | ٥٨ | – |

**- ئازادیی رۆژنامەوانی و دەستبەسەركردن و زیندانیكردنی رۆژنامەنووس:**

بەپێی ئەم ئەنجامە، زۆرینە كە بە پلەی یەكەم دێن، پێیانوایە، هەندێ جار لە سلێمانی، بەپێچەوانەی یاسای رۆژنامەگەرییەوە، رۆژنامەنووسان دەستبەسەر و زیندانی دەكرێن. ئەمەش جەختكردنەوەیە لە ئەنجامی خشتەكەی پێشوو. بڕوانە خشتەی (١٩).

خشتەی (١٩) لە سلێمانی، بەپێچەوانەی یاسای رۆژنامەگەرییەوە، رۆژنامەنووسان دەستبەسەر و زیندانی دەكرێن.

| رەگەز | ٪ | چەندبارە | پلە |
|---|---|---|---|
| بەردەوام | ٢٢.٤ | ١٣ | سێیەم |
| هەندێك جار | ٥٣.٤ | ٣١ | یەكەم |
| بە دەگمەن | ٢٤.١ | ١٤ | دووەم |
| كۆی گشتی | ١٠٠ | ٥٨ | – |

**- ئازادیی رۆژنامەوانی و سکاڵای بەرپرسان:**

بەپێی ئەم ئەنجامە، زۆرینە کە بە پلەی یەکەم دێن، پێیانوایە، هەندێ جار بەرپرسانی سلێمانی مافی سکاڵا و شکاتکردن، خراپ بەکاردەهێنن بۆ رێگری لە ئازادیی رۆژنامەوانی. بڕوانە خشتەی (٢٠).

خشتەی (٢٠) لە سلێمانی، بەرپرسان مافی سکاڵا و شکاتکردن، خراپ بەکاردەهێنن بۆ رێگری لە ئازادیی رۆژنامەوانی .

| ڕەگەز | ٪ | چەندبارە | پلە |
|---|---|---|---|
| بەردەوام | ٢٩.٣ | ١٧ | دووەم |
| هەندێك جار | ٥٨.٦ | ٣٤ | یەکەم |
| بە دەگمەن | ١٢.١ | ٧ | سێیەم |
| کۆی گشتی | ١٠٠ | ٥٨ | – |

**- ئازادیی رۆژنامەوانی و پشتیوانیکردنی دارایی دامەزراوەکان:**

بەپێی ئەم ئەنجامە، زۆرینە کە بە پلەی یەکەم دێن، پێیانوایە، ئەو لایەنانەی لە رووی داراییەوە پشتیوانی دامەزراوەکانی رۆژنامەوانیی لە سلێمانی دەکەن، بە بەردەوامی رۆڵیان لە سنووردارکردنی ئازادییەکەیان هەیە. بڕوانە خشتەی (٢١).

خشتەی (٢١) لە سلێمانی، ئەو لایەنانەی لە رووی داراییەوە پشتیوانی دامەزراوەکانی رۆژنامەوانی دەکەن، رۆڵیان لە سنووردارکردنی ئازادییەکەیان هەیە.

| ڕەگەز | ٪ | چەندبارە | پلە |
|---|---|---|---|
| بەردەوام | ٦٧.٢ | ٣٩ | یەکەم |
| هەندێك جار | ٢٧.٦ | ١٦ | دووووەم |
| بە دەگمەن | ٥.٢ | ٣ | سێیەم |
| کۆی گشتی | ١٠٠ | ٥٨ | – |

**- ئازادیی رۆژنامەوانی و بە (بزنس) نەبوونی میدیا:**

بەپێی ئەم ئەنجامە، زۆرینە کە بە پلەی یەکەم دێن، پێیانوایە، لە سلێمانی، بەهۆی ئەوەی میدیا نەبووەتە (بزنس)و لە رووی داراییەوە نەیتوانیوە پشت بەخۆی ببەستێ، ئازادییەکەی سنووردارە. ئەم ئەنجامەش جەخت لە خشتەکەی پێشوو دەکاتەوە. بڕوانە (٢٢).

خشتەی (٢٢) لە سلێمانی، بەهۆی ئەوەی میدیا نەبووەتە (بزنس) و لە رووی داراییەوە نەیتوانیوە پشت بەخۆی ببەستێ، ئازادییەکەی سنووردارە.

| ڕەگەز | ٪ | چەندبارە | پلە |
|---|---|---|---|
| بەردەوام | ٥٨.٦ | ٣٤ | یەکەم |
| هەندێك جار | ٣٦.٢ | ٢١ | دووەم |
| بە دەگمەن | ٥.٢ | ٣ | سێیەم |
| کۆی گشتی | ١٠٠ | ٥٨ | - |

**- ئازادیی رۆژنامەوانی و رێکلام:**

بەپێی ئەم ئەنجامە، زۆرینە کە بە پلەی یەکەم دێن، پێیانوایە، لە سلێمانی لە رێی پێدانی رێکلامەوە، ئازادیی رۆژنامەوانیی رۆژنامەوان و دامەزراوە رۆژنامەوانییەکان سنووردار دەکرێت. بڕوانە خشتەی (٢٣).

خشتەی (٢٣) لە سلێمانی لەڕێی پێدانی رێکلامەوە، ئازادیی رۆژنامەوانیی رۆژنامەوان و دامەزراوە رۆژنامەوانییەکان سنووردار دەکرێت.

| ڕەگەز | ٪ | چەندبارە | پلە |
|---|---|---|---|
| بەردەوام | ٣٧.٩ | ٢٢ | دووەم |
| هەندێك جار | ٥٣.٤ | ٣١ | یەکەم |
| بە دەگمەن | ٨.٦ | ٥ | سێیەم |
| کۆی گشتی | ١٠٠ | ٥٨ | - |

**- ئازادیی ڕۆژنامەوانی و پاوانکردنی دەزگا ڕۆژنامەوانییەکان:**

بەپێی ئەم ئەنجامە، زۆرینە کە بە پلەی یەکەم دێن، پێیانوایە، بە بەردەوامی پاوانکردنی خاوەنداریێتی دەزگا ڕۆژنامەوانییەکانی سلێمانی لەلایەن کەسانی دەستڕۆیشتووی حزبە دەسەڵاتدارەکانەوە، کاریگەری لەسەر ئازادیی ڕۆژنامەوانی دروست کردووە. بڕوانە خشتەی (٢٤).

خشتەی (٢٤) لە سلێمانی، پاوانکردنی خاوەنداریێتی دەزگا ڕۆژنامەوانییەکان لەلایەن کەسانی دەستڕۆیشتووی حزبە دەسەڵاتدارەکانەوە، کاریگەری لەسەر ئازادیی ڕۆژنامەوانی دروست کردووە.

| ڕەگەز | ٪ | چەندبارە | پلە |
|---|---|---|---|
| بەردەوام | ٦٢.١ | ٣٦ | یەکەم |
| هەندێك جار | ٣٢.٨ | ١٩ | دووەم |
| بە دەگمەن | ٥.٢ | ٣ | سێیەم |
| کۆی گشتی | ١٠٠ | ٥٨ | – |

**- ئازدادیی ڕۆژنامەوانی و هاوکارییە داراییەکان:**

بەپێی ئەم ئەنجامە، زۆرینە کە بە پلەی یەکەم دێن، پێیانوایە، هەندێ جار، هاوکارییە داراییە دەرەکی و ناوخۆییەکان بۆ دامەزراوە ڕۆژنامەوانییەکانی سلێمانی، ڕۆڵیان لەسەر سنووردارکردنی ئازادییەکانیان هەیە. بڕوانە خشتەی (٢٥).

خشتەی (٢٥) هاوکارییە دەرەکی و ناوخۆییەکان بۆ دامەزراوە ڕۆژنامەوانییەکانی سلێمانی، ڕۆڵیان لەسەر سنووردارکردنی ئازادییەکانیان هەیە.

| ڕەگەز | ٪ | چەندبارە | پلە |
|---|---|---|---|
| بەردەوام | ٢٩.٣ | ١٧ | دووەم |
| هەندێك جار | ٥٨.٦ | ٣٤ | یەکەم |
| بە دەگمەن | ١٢.١ | ٧ | سێیەم |
| کۆی گشتی | ١٠٠ | ٥٨ | – |

**دەرئەنجام**

١- لە سلێمانی، ئازادیی ڕۆژنامەوانی بە بەراورد بە شارەکانی دیکەی هەرێم بەشێوەیەکی ڕێژەیی رەخسێنراوە و دەسەڵاتی سیاسی رەخنەی ڕۆژنامەوانانی قبووڵ کردووە.

٢- لە سلێمانی ئازادیی ڕۆژنامەوانی بەشێوەیەکی ڕێژەیی ڕووبەڕووی ئاستەنگی سیاسی بووەتەوە، وەک: ڕاگرتنی دامەزراوەی ڕۆژنامەوانی، دەستگیرکردن و توندوتیژی بەرامبەر ڕۆژنامەنووسان، مامەڵەی نایەکسان و جیاکاریکردن لە پێدانی زانیاری بە ڕۆژنامەنووسان بەهۆی جیاوازیی سیاسییەوە.

٣- لە سلێمانی، بەشێوەیەکی ڕێژەیی، ئازادیی ڕۆژنامەوانی ڕووبەڕووی ئاستەنگی یاسایی بووەتەوە، وەک: لەمپەر دروستکردن لەبەردەم جێبەجێ نەکردنی یاسای ڕۆژنامەگەری و یاسای دەستکەوتنی زانیاری، دەستبەسەرکردن و زیندانیکردنی نایاسایی، خراپ بەکارهێنانی مافی سکاڵا تۆمارکردن.

٤- لە سلێمانی، ئازادیی ڕۆژنامەوانی ڕووبەڕووی ئاستەنگی دارایی بووەتەوە و بەهۆی ئەوەی کە پشتیوانیکەری دارایی و خاوەن ڕیکلامەکان ڕۆڵیان هەیە لە سنووردارکردنی ئازادی و هەروەها پاوانکردنی خاوەنداریێتی دەزگا ڕۆژنامەوانییەکان و نەبوونی ڕۆژنامەوانیی بە بزنس، کاریگەرییان لەسەر ئازادیی ڕۆژنامەنووس و دامەزراوە ڕۆژنامەوانییەکان هەیە.

**ڕاسپاردە و پێشنیاز**

- **ڕاسپاردە:**

١- پێویستە دامەزراوە سیاسی و دەوڵەتییەکان لە سلێمانی، بەربەست بۆ ڕۆژنامەوان و دامەزراوە ڕۆژنامەوانییەکان دروست نەکەن و ڕووبەری ئازادیی ڕۆژنامەوانی فراوانتر بکەن.

٢- پێویستە پارلەمان وەک دەسەڵاتی یاسادانان، چاودێری جێبەجێکردنی یاسا بەرکارەکانی پەیوەست بە ڕۆژنامەوان و

مافەکانیان بکات، تاوەکو ئازادیی رۆژنامەوانی لەلایەن دەسەڵاتی جێبەجێکردنەوە رووبەڕووی ئاستەنگ و مەترسی نەبێتەوە.

- **پێشنیاز:**

پێشنیاز دەکەم، توێژەران توێژینەوە لەبارەی ئاستەنگە پیشەیی و کۆمەڵایەتی و کەلتوورییەکانی بەردەم رۆژنامەنووسان ئەنجام بدەن، کە توێژەر لەم توێژینەوەیەدا، تەنها کاری لەسەر ئاستەنگە سیاسی و ئابووری و یاساییەکان، کردووە.

**پەراوێز:**

* ئەم شارەزایانە بوون :
- د.هێمن مەجید حەسەن، پسپۆڕ لە بواری تەلەفزیۆن، لە بەشی راگەیاندنی کۆلێجی زانستە مرۆڤایەتییەکان، زانکۆی سلێمانی.
- د.فوئاد عەلی ئەحمەد، پسپۆڕ لە بواری رۆژنامە، لە بەشی راگەیاندنی کۆلێجی زانستە مرۆڤایەتییەکان، زانکۆی سلێمانی.
- د.سامان فەوزی عومەر، پسپۆڕ لە بواری یاسای راگەیاندن لە بەشی یاسای، کۆلێجی یاسا و رامیاری، زانکۆی گەشەپێدانی مرۆیی .

**سەرچاوەکان:**


**- سەرچاوە کوردییەکان:**

- عومەر، ٢٠١٧، بەدەستهێنانی زانیاری: بنەما رێکخستن، بایەخ و ئاستەنگەکانی لە چوارچێوەی کاری رۆژنامەوانیدا، سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستان، سلێمانی.

**- سەرچاوە عەرەبییەکان:**

١- البريدى، احمد، ٢٠٠٠م، حرية الصحافة، بدون دار النشر، دمشق.
٢-الحلو، ماجد راغب، ٢٠٠٦م، حرية الاعلام والقانون، منشأة المعارف، مصر- الاسكندرية.
٣-ابو خليل، فارس جميل، ٢٠١١م، وسائل الاعلام بين الكبت وحرية التعبير، دار اسامة للنشر والتوزيع، الأردن- عمان.

٤-المركز اليمني لقياس الرأي العام، ٢٠١٣م، حرية الصحافة والتعبير، سلسلة ادلة الدولة المدنية الديمقراطية، يمن- صنعاء.
٥-ابراهيم، محمد سعيد، ١٩٩٧م، حرية الصحافة، دار الكتب العلمية للنشر، القاهرة.
٦-خطيب، سعدى محمد، ٢٠٠٨م، العوائق امام حرية الصحافة في العالم العربي، منشورات الحلبي الحقوقي لبنان.
٧-معهد البنك الدولي، ٢٠٠٥م، الحق في الابلاغ: دور وسائل الاعلام الجماهيرية في التنمية الاقتصادية، الأهلية للنشر والتوزيع، الاردن- عمان.
٨-عزت، محمد فريد، ١٩٩٤م، ادارة المؤسسات الاعلامية، العربي للنشر والتوزيع، القاهرة.

- **نامەی ماستەرو دکتۆرا:**

- احلام باى، ٢٠٠٧، معوقات حرية الصحافة في الجزائر، رسالة ماجستير غير منشورة، جامعة منتورى قسنطينة، كلية العلوم الانسانية والعلوم الاجتماعية.

**سەرچاوە بیانییەکان:**

1- Dennis, Everette، John Merril, 1984, Issuesin Mass Communication, Macmillan Publishing, New York.
2- Robert, Jacques، 1994، Droits de l'homme et liberts fondamentales, Editin Mont-chrestien, Paris.

## ملخص البحث

**م. كامل عمر سليمان**
قسم الاعلام – كلية العلوم الانسانية
جامعة السليمانية

هذه الدراسة الموسومة بـ(المعوقات أمام حرية العمل الصحافي في مدينة السليمانية)، تهدف إلى معرفة وكشف وجود الموانع والعراقيل أمام حرية الصحافة في مدينة السليمانية من عدمها. وتعد بدورها من الدراسات الوصفية التي تعتمد لا محالة على المنهج المسحي لاجابة المبحوثين. حيث استخدم الباحث أداة الاستبيان عرضة الوصول إلى معلومات أكثر دقة، ومتعلقة في نفس الوقت بأهداف و تساؤلات الدراسة نفسها. وقد اعتمد الباحث على عينة قصدية او عمدية مكونة من صحفيا يعملون في المؤسسات الصحفية في مدينة السليمانية.

وقد توصل الباحث بوصفه، إلى أنه على الرغم من وجود الحرية من حيث العمل الصحافي في تلك المدينة السالفة الذكر، وذلك مقارنة بالمدن الاخرى للأقليم، وتقبلت فيها السلطة السياسية في الوقت عينه النقد الصحافي بين فينة وأخرى، ولكن مع ذلك كله؛ كانت الحواجز والعقبات السياسية والقانونية والاقتصادية أيضا حيال حرية العمل الصحافي لها وجودها على مرأى من الناس نسبيا.

## Abstract

This study entitles “obstacles of free journalism in Slemani” with the aim of highlighting the impedance of journalist’s working. The study is a survey of tackling practical dimensions of hindrances based on making interviews with journalists. For this purpose a survey for is distributes among a sample of journalists and reports inside the city of Slemani.

Findings show that although media freedom more privilege in Slemeni comparison to other Kurdistan region cities, political, legal and economy obstacles restrict the freedom of journalism.

## تعليمات النشر
## في مجلة الأكاديمية الكوردية

- مجلة الأكاديميّة الكورديّة: مجلّة علمية فصليّة تهتمّ بنشر البحوث العلميّة الـتي تتنـاول قضايا الكورد وكوردستان، شريطة أنْ لا تكون منشورة مـن قبـل أو مقبولـة للنشـر في مجلّة أخرى.
- لغتـا النشـر في المجلّـة همـا الكورديّـة والعربيّـة، ويمكـن نشـر بحـوث تخـصّ الكـورد وكوردستان بلغات أخرى.
- على الباحث أن يكتب على الصفحة الأولى من بحثه عنوان بحثه، اسمه، لقبه العلمـي، عنوان وظيفته، مكان عمله، بريده الإلكتروني ورقم هاتفه.
- يُعتمد المنهج العلمي في اختيار عنوان البحث ومتنه وأسلوب تنظيم المصادر والهوامش والاقتباسات، فضلاً عن كتابة البحث بلغة علميّة رصينة، وتعتذر هيئة التحرير عن نشر أيّة دراسة تهمل هذه الجوانب.
- يُلحق بالبحث ملخّص بلغتين أخريين، على أنْ لا يزيد عـن صـفحة واحـدة A4، يوضّـح فيه الباحث أهمّيّة بحثه والنتائج الرئيسة التي توصّل إليها.
- عندما يكون البحـث تحقيقـاً لمخطوطـة مـا، يجـب الالتـزام بالقواعـد والمنـاهج العلميّـة المعمول بها في هـذا المجـال، وتُرفـق بالبحـث عـدّة صـفحات مـن المخطوطـة مـع بيـان المعلومات الأساسيّة عنها والجهة التي تحتفظ بها.
- يجب كتابة البحث بحـروف اليونيكـود، وتنظـيم الهـوامش بأسـلوب هارفـارد، علـى ان يطبع عنوان البحث بحجم (١٥) واسم الباحث او الباحثين مـع العنـاوين الفرعيـة بحجـم (١٤) ويكون المتن بحجم (١٣).
- تُنظّم المصادر والمراجع كالآتي: لقب المؤلّف واسمه، التأريخ، عنوان الكتـاب، الجـزء (إنْ وُجـد)، الطبعـة، دار النشـر، المدينـة،. وتُـنظّم البحـوث في المجلّـات كـالآتي: لقـب المؤلّـف واسمـه، التـأريخ، عنـوان البحـث، اسـم المجلّـة "بـين تنصيصـين"، العـدد، المدينة.
- يُرسل البحث بثلاث نسخ ورقيّة A4، وبقرص مدمج CD، على أنْ لا يزيد عدد صفحات البحث عن (٢٥) صفحة، بضمنها الصور والجداول والمصادر.

- يّعتبر البحث مقبولاً للنشر بعد تقويمه إيجابيّاً من قبل خبراء ومحكّمين متخصّصين، ويزوّد الباحث بقرار من هيئة التحرير بقبوله، ولا يجوز للباحث نشر بحثه لاحقاً في مكان آخر بدون موافقة خطيّة من رئيس التحرير.
- تحتفظ هيئة التحرير بحقّها في حذف أو إعادة صياغة بعض الألفاظ والتعابير بما يتلاءم مع أسلوب المجلّة في النشر، مع مراعاة عدم المساس بالأفكار الأصليّة للبحث.
- يخضع ترتيب البحوث في المجلّة وفقاً لمنهج المجلّة في التبويب، وليس لأهمّيّة البحث أو لقب الباحث العلمي.
- لا تنشر المجلّة البحوث المستلّة من رسائل الماجستير وأطاريح الدكتوراه.
- تلتزم المجلّة بتطبيق المبادئ المتعلّقة بالانتحال.
- لا تعاد البحوث المرسلة إلى المجلّة إلى أصحابها في حالة عدم الموافقة على نشرها.

# أربيل وتوابعها في مجموعة وثائق ومؤلفات بريطانية مُختارة ١٨٧٩- ١٩١٨

أ. د. خليل علي مراد
قسم التاريخ – كلية الآداب – جامعة صلاح الدين – اربيل

**مقدمة :**

يمكن القول إن المعلومات المُتاحة حالياً غير وافية عن تاريخ أربيل وتوابعها منذ السيطرة العُثمانية المباشرة عليها في ربيع سنة ١٥٣٥ ولغاية الاحتلال البريطاني لها في تشرين الثاني ١٩١٨، ويتبين ذلك من وجود ثغرات عديدة تتعلق بتاريخها السياسي والاقتصادي والاجتماعي. ويمكن تدارك جزء من هذا النقص في المعلومات من خلال البحث والتقصي عنها في المصادر التاريخية المختلفة؛ من وثائق ومطبوعات رسمية، وكتابات تاريخية عُثمانية وعربية وفارسية، وكتب رحلات، فضلاً عن الصحف التي صدرت في بغداد والموصل في العقود الأخيرة من العهد العُثماني. ومن المؤكد أن أي مسعى جاد في هذا الاتجاه من قبل المؤرخين والباحثين سيفضي إلى تسليط مزيد من الأضواء على الجوانب الغامضة من تاريخ المدينة وتوابعها في العهد العُثماني، كما تبين مؤخراً من خلال ترجمة مجموعة من الوثائق العُثمانية في هذا المجال [1].

إن الغرض من هذا البحث هو لفت الانتباه إلى مجموعة مختارة من المصادر البريطانية التي تضمنت معلومات عن أربيل وتوابعها إبان العقود الأربعة الأخيرة من العهد العُثماني، وطبيعة تلك المعلومات من حيث الدقة والأهمية. وتتألف هذه المصادر من عدد من ملفات الوثائق البريطانية غير المنشورة، وكتب رحلات كتبها دبلوماسيون وضباط مخابرات، وكانت معظمها محدودة التداول في حينها، ومؤلفات مارك سايكس Mark Sykes (١٨٧٩ ـ ١٩١٩)، وأخيراً بعض المطبوعات الرسمية الصادرة عن وزارتي الحرب War Office والبحرية Admiralty . وهي مصادر لم

